گۆران، عەبدوڵا، ۱۹۰۴-۱۹۵۸ م.
دیوانی گۆران. —تهران:پانیذ، ۱۳۸۲.
ISBN:964-7105-15-0
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
۱.شعر کردی-قرن۱۴.الف.عنوان.
۹۳ گ ۴۰۲ ص/۳۲۵۶ PIR ۸فا۹/۲۱
۱۳۸۲
کتابخانه ملی ایران
۱۸۵۳-۸۲م



نشر پانیذ

دیوانی گۆران

عەبدوڵڵا گۆران

بڵاوکراوەی پانیز
چاپی سێیەم ۱۳۸۶
لیتوگرافی باختر چاپخانە داڵاهۆ
تیراژ ۲۰۰۰
تهران :میدان انقلاب خیابان ابوریحان نبش خیابان وحید نظری پلاک ۱۰۰
تلفاکس: ۶۶۴۱۵۹۸۲
nashrepaniz@hotmail.com
۵۰۰۰ تمەن
شابک :۰-۱۵-۷۱۰۵-۹۶۴ ISBN:964-7105-15-0

بۆ هەمو مامۆستایانی بەڕێز کە لە لێکدانەوە و ڕێکوپێککردنی ئەم بەرهەمە بەنرخە ئێمەیان یاری داوە ڕێز و سپاسی خۆمان دەر ئەبڕین.

بڵاوگەی پانیز

# پێرست



## کۆمەڵەی یەکەم
## بەهەشت و یادگار



## بەهەشتی دڵ

## یادگاری کۆن

### غەزەلیات



### لاسایی ئەدەبی عوسمانی



### کۆمەڵەی دووەم

## فرمێسک و هونەر

## لەگەڵ دوو هاوینە گەشت

## شیوەنو فرمێسک



## هونەرە جوانەکان



## دوو هاوینەگەشت



### کۆمەڵەی سێیەم
## سروشت و دەروون



## سروشتی جوان

## دەنگی دەروون



### کۆمەڵەی چوارەم

## لاوک و پەیام

کۆمەڵەی پێنجەم

## لەکۆڕی خەباتا



## دڵۆپی مرواری



کۆمەڵەی شەشەم

## ئۆپەرێت

## کۆمەڵەی حەوتەم

## پیەس لە یەک پەردەی کورتا



## کۆمەڵەی هەشتەم

## شیعری گەپ



## کۆمەڵەی نۆیەم

## سروود

## کۆمەڵەی دەیەم
## شیعر بۆ منالاّن



## کۆمەڵەی یازدەیەم
## وەرگێڕراو

## خەیام بە کوردی



## شیعری بە پەخشان وەرگێڕراو



کۆمەڵەی دوازدەیەم

## بۆ زاخاوی مێشک



کۆمەڵەی سیانزەیەم

## هەمە جۆرە

# لە سێبەری ئاویە را

لەم چاپەدا، کە بۆ جاری دووهەم سەرجەم دیوانی گۆران چاپ دە کرێتەوە، پێویستە یادی ئەو هەوڵ و کۆششە بکەینەوە، کە سەرجەم دیوانی گۆرانی بەرهەم هێنا.

بەڵێ ئەو لێژنەیەی کە پێک هاتبوو، لە دوکتۆر عیزەدین و حەمە کەریم فەتحوڵلا، جەلال دەباغ و کاکەی فەلاح و هۆ گری برام و هێرۆی خۆشکم و خۆم، لەگەڵ کاکە محەممەدی مەلاکەریم کە ئەرکی زۆرو ماندوو بوونی تەواو بەو برا، هەر لە پارێزگاریی دەستنووسەکان و بەراوردکردنی لەگەڵ ئەوانی لای هۆ گری برام، لەگەڵ ئەو چاپکراوانەشدا، کە لە سەردەمی گۆرانا چاپ کرابوون یا ئەوەی هۆگرگۆران ئەنجامی دابوون.

بێگومان ساخکردنەوە و ڕاستکردنەوەی هەندێ هەڵە و شوێنکەوتنی کاری وا ئاسان نییە، بۆیە نەک هەرلەبەر پێشەکییەکەی، بەڵام ئەوهەوڵ و تەقەلا بێ پشووەی کاکەحەمە، جێگای سپاس و ڕێزی هەموو گۆراندۆستێکە.

پێم وایە جێی خۆیەتی ڕێزی کاکە دوکتۆر عیزەدین هەر لەو ئاستەدا بزانین بۆ ئەو پێشەکییەی کە بۆی نووسی، هەر وەها وەرگێڕانەکەی بۆ عەرەبی.

ئەم بەڕێزانە و بە کێتیی نووسەران کە لەو سەردەمەدا لە بەغدا، ئەو ئەرکەیان لە ئەستۆ گرتبوو هەروەها خوالێخۆشبوو، کاک عەلی بۆسکانی دەستگیرۆیی قەرزێکی نووسەرانی کوردی کرد بوو لە پێناوی چاپی دیوانی گۆرانا، ئەوەش پاداشتی کە لای خوای میهرەبانە و هۆی ڕێزی گشت گۆراندۆستێکە لەکاتێکی دوورەوە لە چاپێکی نوێدا، دیوانی گۆران بخەینەوە بەردەست خوێنەران و ئەم دەرفەتەش بەر من بکەوێ کە ئاوا بە تێروتەسەلی سوپاسی ئەو دۆستانە بکەم.

جا لەمە بەدوا لە سەری دێڕەوە دەکەوینە باسێکی پێویست سەبارەت بە ژیانی تایبەتی گۆران و هەندێ ڕا و بۆچوون لە ڕووی هونەری شیعر و داهێنانەکانی گۆران.

## له سێبەری بەیانیا بە ڕووی نەوەرەودا

هەرچەندە شنەی فێنکی ئاویەری سەر لە بەیانیان، هەر بۆ ئەوە باشە کە باسی شیعری تیابکەین، هەر باسێکی کەمان بوو دەیخەینە عەسرو ئێوارە بە دیوی ناو شاری سنەدا، کە هەتا سێبەر دابێ، ئاویەریش گەزگەز بالا ئەکا.

## «گۆران»

لە تەمەنێکی لاوی یا بگرە هەرزەکاریا، کە لە ترسی ئینگلیز ماڵیان چووبووە هەورامان، ڕۆژێ لە سلێمان بەگی کاتبی فارسی، زوێر ئەبێ و بەرەو هەڵەبجە ئەگەڕێتەوە، کە لە بیارە سەرەو خوار ئەبێتەوە بەهۆی تاریک داهاتنی ئێوارە و چڕو چخوردی چەمی بن دار گوێز، ڕێ هەڵە ئەکات و لە باتی ئەوەی بەرەو تاوێرە بڕوات ڕوو ئەکاتە چەمی هاوار.

سلێمان بەگی باوکی وای گێڕابووەوە، کە تا ماوەیەک لە تەندورستی فەقێ عەبدوڵلای کوڕی بە گومان بوو، چونکە دوای ئەو شەوەی چەمی هاوار تووشی شتێکی سەیر هاتبوو.

گوایە لە دوورەوە چەند تەپکەیەکی ڕووناکی درەوشاوەی بە دی کردبوو، کە لە سەرەتادا زۆر لێیان ترسابوو، وای زانیبوو خێڵی جنۆکەن و لەوێدا هەواریان خستووە. بەڵام لە دواییدا بەردێکیان تێ ئەگرێ و ئەیدا لە یەکێکیان؛ لە پڕ ئەو تەپکە نوورە پەرتەو بڵاو ئەبێتەوە. بە هە وا دا ئەکەونە فڕین و لە شێوەی ئەستێرەیەکی وردا دەدرەوشێنەوە. خوالێخۆش‌بێ عەلی کەمال باپیر وای گێڕایەوە کە لەو شەوەوە گۆران تێ گەیشتبوو کە «گوڵ ئەستێرە» لە بنچکە دڕکێکا پەروەردە ئەبن و دەکەونە فڕین. لە کاتی گەورەبوونیانا شەوانی بەهار، گەلێ دۆڵ وشیو و دەر و دەشتی تاریکی کوردستان دەکەنە بریسک و هۆر. بەڵێ گەلێکمان چراخانی گوڵ ئەستێرەمان دیوە.

کاتێک ماڵمان لەهەولێر بوو، گۆران دەستی لەئیش کێشرابووەوە و چاوەڕوانی دادگای ئەکرد. عەسر و ئێواران ــ خوالێیان خۆشبێ ــ عەلی کەمال باپیر و عەلی ئاگا و عەزیزی کاکە حەمەی موفەتیش مەعاریف و دوکتۆر مارف خەزنەدار و ئازاد شەوقی و مستەفا بەگی مودیری زراعە وگەلێ هاوشاری سلێمانی کە لەوێ بوون، دەهاتنە میوانیمان ومنیش لە بەردەستا چا و ئاوم ئەگێڕا.

گوێم لێبوو گۆران لەمەڕ باسی گوڵ ئەستێرەدا فەرمووی:

دیمەنێکی سەیر بوو، بەتایبەتی کە دوایی زانیم لەناو ئازارا گوڵ ئەستێرە دێتەدەر، لە بنچکە دڕکێکی تیژو نەشتەراویا ئەو جوانییە پەیدا ئەبێ، کە وابوو ژیانی بناری هەورامان و شاری هەڵەبجەی جاف، بۆ خۆی ڕۆمانسیەتێکی سەرەتاییە کە فرمێسکی تیا دائەگیرسێ.

ئا لەوێوە کە ئەنواڕین «گۆران»یش بۆ خوی دەفەرموێ:

بۆ شاعیرێک کە گیانی

لێی هەڵەقوڵا جوانی
ئەگەرچی هۆی بەخی خۆی
جوانیی فەساڵ نەبوو بۆی

«هاوڕێم بێکەس»

لە بێکەسی دەموچاو ئاوڵاوی و ورگن و دوور لە جوانیی ڕوو، جوامێری و جوانیی گیان هەڵەقوڵا. لێرەدا جێپەنجەی گوڵ ئەستێرەکان بە دەروونی گۆرانەوە دیارە. جا لە گەڵێ شوێنا «گۆران» ئەستێرەی دیوە، ئەوەتا هەر لە یەکەم هەڵبەستەوە:

بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە
لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە

«ئافرەت و جوانی»

هەروەها ئەگەر سەیری هەڵبەستی «نیاز» بکەین:

بە ئاسمانی هیوامەوە ئەستێرەکانم
بە هەزاران شا ئەستێرەی گەش گەشی جوانم
هەموو نوقمی دەریای تەمی ڕەش و تاریک بوون
وەک وەنەوشەی چنراو لە گەڵ سیسبوون خەریک بوون

با لێرەدا زۆر بە دوای نموونەدا نەگەڕێین، بەڵکوو سەرنجێ بدەینە هەڵبەستی «بەسەرهاتی ئەستێرەیەک». هەموو هەڵبەستەکە چەند جارێ بخوێنینەوە و بگەینە داوێنی:

ئەم ئەستێرە بەسەرهاتی دڵگیری
لە کام ڕۆحا نابزوێنێ زویری؟!

«گۆران» هەر وەک لە هەرزەکاریا ئەو گوڵ ئەستێرانە و دیمەنی ئەوشەوەکاری تێ کردن، لە تاکە ئەستێرەیەکیشدا کە سروشتی پێ ڕازاوەیە دەکەوێتە ژێر تەئسیر و بە دەم لێکدانەوە و سەرسوڕمانەوە لە هەر شتێک کە لە سروشتا ئەیبینێ. پێوەری شیعریش لای گۆران لە پزیسکی گوڵ ئەستێرەوە دەست پێدەکا، کە لەناو دڕکا سەر هەڵئەدا. بۆیە هەمیشە سەرچاوەی جوانییەکان و هونەری داهێنان لە گێنەڵی ئازارەکانا بە دی هاتوون. تەنانەت لە هەڵبەستی درامی، «بووکێکی ناکام» دا، لە ناو کۆشک و تەلاری ئاوێنەبەندا، ستەم و زۆری زۆردارمان بۆ دەستنیشان ئەکات، ئا ئەو کاتەی بووکی ناکام لە کۆشکا دائەبەزێنێ، ڕادەی کێشمەکێش لە نێوان کۆشک و دەشت و دەری بەرباڵاوا، لە نێوان توانا و سەربەستیا، کوڕەشوانی دڵدار ئەکاتە ئەو قوربانییەی کە لە پێناویا کچی جوتیار، لەناو ئەو هەموو نیعمەت و نازەدا،

خۆزگەی بە دڵۆپێ فرمێسکی تازەیە. بۆچی؟ بۆ ئەوەی لەرەی فرمێسک بە سەر برژانگەوە تا دە کەوێتە سەر گۆنا هاوار بکاو جاڕ بدا بە دنیادا، کە دەستی زۆرداری، هەرگیز کوورەی دڵی عاشقی پێ ناکوژێتەوە ئا بەو مەبەستە رۆمانسیانە، گۆران لە سروشتەوە، لە شاخەوە، لە بەفر و بارانەوە، لە وەنەوشەوە، لە شاگوڵەوە، مەبەستەکانی بەدی ئەکات و ئاواتەکانی بە ئاسۆیەکی هەمە ڕەنگا هەڵئەواسێ و هیوا و ئاواتی گۆران، هیوا و ئاواتی کوردە و ئاسۆی ئاواتەکانی، ئاسۆی دەم کەلی کوردستانە.

ئەگەرچی لە «جوانی بێناو» دا، ڕووبەڕوومان دەکاتەوە لەگەڵ ئەی کچە جوانەکەی... بەڵام، شوێنی لەدایکبوونی ئەم هەڵبەستە و پێناسەی تەمەنی وا بووە کە گۆران کاتێ لە ئیستگەی کوردیی «شرق‌الادنی» لەگەڵ ڕەمزی قەزاز و ڕەفیق چالاکا کاری کردووە، عەسرو ئێوارەیەکی کەنار دەریای سپی، جوانیی کچێکی هاوسەفەری هێناوەتەوە یاد و لە نێوان جوانیی سروشت و کچە جوانەکەدا، جوانی بێناوی هەمیشە لە یاد بووە، کە ئەویش کوردستانە.

لە هەموو شیعرەکەدا، سەرنجی زۆر ورد ئەماندات دەست ئەو مەبەستە، بەڵام:

ئەی کچە کاڵەکە! جوانی‌تر با زۆر بن،<br>
لەباغچەی بەهارا گوڵباخی بەر خۆر بن،<br>
با ڕەنگیان پەرداخت بێ و جێگەیان سەرچڵ بێ،<br>
بە واتەی خەڵکی‌تر، با ناویان شاگوڵ بێ،<br>
گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە،<br>
کە لە ژێر سێبەری تووتڕکا خامۆشە.

بەڵێ: وڵاتانی دنیا جوانن، بەهاریان پڕە لە شاگوڵ و خۆیان شاگوڵی بەرخۆرن، بەڵام گۆران کوردستانەکەی ژێر تووتڕکی زوڵم کەوتووی گەڵێ لاجوانترە.

گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە،<br>
کە لە ژێر سێبەری تووتڕکا خامۆشە.

هەر لەم هەڵبەستەدا، دەگاتە ئەوەی کە کانییەکی ڕوونی بچووکی بەر تریفەی مانگەشەو، لە چەپەکێک و لاڕێیەکی کوردستانا، کە وردەزیخی لە بەر تریفەدا بۆتە مرواری و دوڕ و جەواهیر، ئەوەی پێ جوانترە لە شەپۆلی دەریا، کە لە بەر تیشک و ڕووناکیی ڕۆژا دەمەو عەسرێک خۆی ئەنوێنێ و بەوەش واز ناهێنێ و دەیکاتە شڵپ و هووڕ.

بەڵێ لە بەرچاوی گۆران کانییە بێدەنگەکەی کوردستان، کوردستانی خۆر لێ نەدراوی هەمیشە شەوی بەرتریفە، ئەو کوردستانە، کە هێشتا شارستانیەت دەستی نەداوەتێ هەر بە دارو بەرد و کوێرەڕێ و گابەردی زل و بێ ئارایشت، لە جوانیدا بەرچاوترە.

ئەی کچە مە نگە کەی بە دەنگی چپەدوو
گەندەمووی دەموچاو، مەچەک هەڵنەگرتوو

بەڵێ لای گۆران کوردستانی چەپەک و بێ ئارایشت، بە گەنەمووی گژوگیای ناو مێرگ و مێرخوزاری خۆیەوە، لەوانی کە جوانترە. گۆران ئا بەو جۆرە لە سروشتی کوردستان و چیا و دەشت و بنارییەوە چاوی بە دنیای شیعر هەڵهێناوە. لەبەر ئەوە سروشت بە هەموو توندو تووشیەکەیەوە، جوانیی تیا بە دی دێ، جوانییەکانی مرۆڤیش لە تۆف و وەیشوومەی عەشقێکا سەر هەڵئەدەن کە هەتا ئەمڕۆش کورد هەر عاشقی کوردستانە و جێژوانیش لە دوو توێی سروشتایە.

کە وا بوو سروشت بریتییە لەو زەمینەی گۆرانی تیا ژیاوە، لە کوردستانا، بریتییە لە گۆران، لە ئادەمیزاد، ئادەمیزادی کورد لەنێوان هەرسێکیانا، جوانیی ناوکۆییە، ئەو ناوکۆییەش سەرچاوەی هەموو داهێنانەکانە.

ئیتر لەم باسەدا، ئەوە پێویستە دەستنیشانی داهێنان و تازە کردنەوە بکەین، کە لای گۆران چۆن وەبەر هاتووە. «گۆران» لە ڕووی کێش و سەرواوە دەسی لە شێوەی عەرووزی کۆن هەڵگرت و شیعری کوردیی گەڕانەوە بۆ کێشی پەنجە (هیجا)ی کوردی کە چ لە فۆلکلۆری کوردییا پەیڕەو کرابوو یا شیعری هەورامیی سەردەمی ئەردەڵانی پێ وترابوو. لە ڕووی فۆرم و بابەتەوە پەیڕەوی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیی کرد، هەر وەکوو خۆی ئاماژەی بۆ کردووە کە شیعری تازەی تورکی بەتایبەتی شیعری «عەبدولحەق حامید» و «کەمال نامیق» وگەلێکی دی، کە ئەمانە لە دواجاردا قوتابخانەی «فەجری ئاتی» یان پێک هێنابوو، بۆیەکاتی خۆی لە وەڵامدانەوەیەکی خوالێخۆشبوو کامیل بەسیردا دراسەیەکم لە بەیانا بڵاو کردەوە، وەکوو شێوە توێژ هەڵدانەوەیەک لە سەرئەدەبی تورکی ئەو سەردەمە و جۆری بزووتنەوە نوێخوازییەکەیان.

چونکە ئاماژەی بۆ شیعری نوێی تورکی کردووە لەگەڵ ئەوەش کە گۆران بۆخۆی بەڕاستی هەرچییەک لە سەردەمی مامۆستای بەڕێز شێخ نووری شێخ سالح و هاوڕێکانی ئەوترێ لەو بارەیەوە، هەر ئەوەندەیە وەک دیاریکردنێک، بەڵام کەسێ نییە پسپۆڕانە، ڕاستەوخۆ لە زمانی تورکییەوە، شتێکمان بخاتە بەر دەست، کە ئەمە بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی زۆر پێویستە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەی کە بۆ خۆم هەوڵم داوە، لەو ڕووەوە زانیارییەکی کەمم بە دەست هێناوە و لەوانە ئەتوانم ئاماژە بۆ بەیانە شیعرییەکەی دەستە لاوێکی تازە بکەم لەناو قوتابخانەی فەجری ئاتییا، کە خۆیان ناو نابوو، «گنج قلم لر». کە ئەمە لە ساڵی ١٩١٢دا دەرچووە و ئەوەش کە لێرەدا شایانی باسە، ئەوەیە کە ئەم بەیانە شیعرییە، لە بەر ڕووناکیی تیئۆریی فیکری «فوئاد کۆپرلوو» هاتۆتە کایە، چونکە ئەو سەردەمە لەناو گەنجە تورکەکانا، ناوبراو (تیئۆریسیەنی) ئەدەبیان بوو.

ئەو بەیانە شیعرییە، لەدوای دیباچەیەکی سەرەتایی و لە ئاستی لێکۆڵینەوەکانیا چەند خاڵ بەرچاو

ئەخات کە وا بزانم سیانیانم لە بیرە، چونکە دوورم لەوڵات و سەرچاوەی ئەو نووسینانەوەشم بە لاوە نییە. ئەو سێ خاڵەش بەم جۆرەیە:

١ـ هەتا بتوانرێ وشەی تورکی بەکار بێت و بەرهەمە شیعرییەکان لە زمانی عەرەبی دوور بخرێنەوە.

٢ـ ئەو وشانەی بەکار دێ لە شیعرا، پێویستە هەمیشە لە شێوە و ناوەرۆکا تازە بن، ئەگەر وشەی تازەت دەست نەکەوت، هەوڵ بدە هەمان وشەکانی پێشووت لە سەر چرۆی تازە پاراو بنەوە، ئەگەر ئەوەش نەبوو، شیعر مەنووسە.

٣ـ واز لە کێشی عەرووز بهێنن لە ناو میراتی نەتەوەیی و فۆلکلۆرمانا کێشی هیجا زۆرە، سوودی لێ وەربگرن.

بەڵێ، بەو جۆرە لە ژێر هۆی کاریگەریی ئەو سێ خاڵەدا، یا ئەو بەیانە شیعرییەدا، لاوانی کوردیش لە روانگەی پێداویستی شارستانیەتەوە، لەم مەیانەدا کۆششیان کردووە، هەر وەک نووسینە ڕەخنەیەکی مامۆستا شێخ‌نووریش لە ساڵانی ١٩٢٢دا، بەدەم هەمان زایەڵەوە گوێ هەڵەخا. ئەوەتا گۆرانیش بۆ خۆی دەڵێ: شیعرە تازەکانی بە وەزنی هیجا هەڵبەستراون کە هەرچەند شیعردۆستەکانی کۆن بە خوێندنەوەی ڕانەهاتوون... جا هەر ئەو سەرەتایە بە تێکڕا، هەموو هەنگاوەکانی گۆران دیاری ئەکات کە ویستوویەتی کێشی هیجا بە ژماردنی بڕگەکان، وەک بابەتی فۆلکلۆری نەتەوەیی و سەردەمی مەولەوی شیعری کوردی هەڵبەستێ، زۆربەی کێشە فۆلکلۆرییەکان و بگرە شیعرەکانی مەولەویش، کێشی «٥-٥» واتە دە بڕگەیی تیا بەکار هاتووە. بەڵام گۆران سەرمەشقی تاقیکردنەوەکەی لەوەدایەکە جگە لەم کێشە و هەندێ کێشی ورد و کورتی دی، لە چەند شوێنێکا کێشی «٥-٦» ١١ یا «٨-٥» ١٣ و لە کورتەکانیشا «٤-٤» ٨ بڕگەیی داهێناوە.

نموونەیەکی فۆلکلۆری وەک ئەم بەیتە سەیر بکەین:

هەناسەی ساردم کێو لە بن دێنێ
ئاخۆ خواکەی من چیت بەسەر دێنێ
هە نا سەی سار دم ـ کێو لە بن دێنێ
ئا خۆ خوا کەی من ـ چیت بەسەر دێنێ

لە بەرامبەر ئەمەشدا، دەتوانین، لەم هەڵبەستە ورد بینەوە:
بەئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە،
لە باغچەی بەهار گوڵم چنیوە.

«ئافرەت و جوانی»

بو نموونەی کێشی کورت و جووتەکان دەتوانین لە هەڵبەستی ڕەوتێکی جوان ورد بینەوە:

لەژێر زەردەی خۆرەتاوا
بەناو چیمەنی گوێ ئاوا

لە هەڵبەستی ئاواتی دووریشدا ئەتوانین ئەوکێشە درێژە تازەیە بە دی بکەین کە گۆران دایهێناوە:

ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەری پەڕت
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دڵبەرت؟

هەر لەو هەڵبەستەدا، گۆڕانکاریی کێش، وەک یاری و جێیی سەمایەکی ڕێکوپێک بە دی ئەکەین، کە لە شوێنی تریشا دووبارە بوونەتەوە.

لەمە بەدوا دێینە سەرباسی زمان و وشەی کوردی و داهێنان لە وشەکانا، کە ئەم باسەش لەگەڵ ئەوەی سەرەودا، «فۆرم» پێک دێنن.

هەر وەک لە باسی کێشدا، لە سەرەتای بەهەشت و یادگارا گۆرانمان بە شایەت گرت. ئەوا بۆ پاکۆی زمان و بە کوردی هەڵبەستن و داهێنانەکان هەر خۆی بە شایەت ئەگرین، کە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات هەرچی ئەو هەڵبەستانەی غەزەلئاسا و وشەی عەرەبیی زۆر تیا بەکار هاتووە ئەوەکۆنن، تا بەکار هێنانە کەش زیاتر بێ، کۆنترن.

بەڵێ «گۆران» خۆی بەم مانایە، ئەوەمان تێدە گەیەنێ، کە پێداویستی تازەکردنەوە بەشێکی گرنگی زمانی کوردییە. خۆی هەر لەبنەڕەتا یەکێ لە فەرمانەکانی شیعر، کەپێویستە بە جێی بێنی، پارێزگاری و داهێنانی زمانە.

جا بە دوای ئەم ڕایەدا، سەرێ بدەین، لەو هەڵبەستانەی کە زیاتر ئەم دیاردەیەی بە خۆیەوە گرتووە:

ئەگەر تێکرا بنوارینە هەڵبەستەکانی بەهەشت و یادگار و دووهاوینەگەشت و گەلێ لە شیعرەکانی تازە بابەت لە بەشەکانی کەدا، هەست بەوە دەکەین، کە زمانی شیعری گۆران هەتا بڵێی سادە و ڕۆشنە، کە هیچ گرێیەکی داتاشراو بە درەختی داڕشتنیەوە نابینی و ئەو وشە سادە و ئاساییانەی کە ڕۆژانە من و تۆ پێی دەدوێین، هەر وشەیە و بۆ خۆی فەرمانێکی تایبەتی پێ سپێردراوە لە وێنەکێشانی هەڵبەستی گۆرانا.

گۆران کە جوانییەکی نەخشاندبێ یا تەنانەت دیمەنێکی ناسۆریشی نەخش کردبێ، وەک خۆی بێ کەم و زیاد، ئەوەی باس کردووە و لە زەینیا ئەو نەخشەی گۆران توانیوێتی تابلۆکان بە ڕەنگ و دەنگ و سیمایانەوە شتێ لای خوێنەر بە جێ بهێڵێ.

«گۆران» شاعیری وەسفە نەک تەنها بۆ جوانی، وەسفی هەموو دیمەنێ، بێ موبالغە وەک خۆی داوێتی بە دەستەوە.

وەک دەبینین:

قژکاڵی لێو ئاڵی، پرشنگی نیگاکاڵ
ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێ ئاڵ

سەرگۆنا نەختێ ئاڵ ... کەمێک، نەک وەک پەڕەی گوڵ، سوورێک یەجگار کاڵ. ئا لێرەدا دەرئەکەوێ، کە زمانی شیعری گۆران، لە هەموو خەسڵەتەکانی، وشەکان، ڕەنگ و دەنگی دروست کردووە. لە شوێنێک وەک نەقاشێکیی هونەرمەند فڵچەی لە وشەکان وەرداوە و ڕەنگی تابلۆکەی کردووە، لە شوێنێکی دی وشەکان دێنە گۆ و وەک ئەکتەرێکی سەرشانۆ خۆیان لە خۆیان دەدوێن هەروەک لە «جوانی لادێ» دا ئەڵێ:

وەختێ کە ئەکەی چەشنی نەسیم لەنجە بەرەوماڵ
ئەگریجەی تەڕ پە خشە لەسەر کوڵم و خەت و خاڵ
شەڕیانە: شەماڵ، پەنجە لەسەر ڕەنگی ڕەش و ئاڵ
ئێوارەیە وا، هەڵگرە سا گۆزەیی تازە
...........................

وەک لەسەر شانۆیەک یا هەر لە ژیانی دووکەسا، مشتومڕێک پەیدا بێ لەسەر هەڵبژاردنی شتێ. ئەوەتا پەنجە ئەگریجەی ڕەش لا ئەدا و بە شەماڵ ئەڵێ:

دە لاچۆ باکوڵمی ئاڵ دەرکەوێ. شەماڵیش ئەگریجەی ڕەش و تەڕ ئەداتەوە بە سەر کوڵمی ئاڵاو دەڵێ من حەزم لەم ئەگریجە ڕەشەیە...

شەڕیانە... لە سەر ڕەش و، ئاڵ...

مشتومڕیانە و هاتوونەتە قسە، بە دەنگی بەرز، کەوتوونە خۆ، هەر سەرەتای ئەو کۆپلەیە کە دیمەنەکەمان بۆ دەرەخسێنێ، وەک سیناریستێ، دەستنیشانی ئەوەشی کردووە، کە پێویستە کامێرا بە تەواوی جووڵە و بزواندنی گۆزەهەڵگرمان نیشان بدات، واتە بە تەواوی کامێرا «کلۆز» ئەبێت لە سەر گۆزەهەڵگر، تا وەکوو لە بەرەوە لێمان دوور کەوێتەوە، تا بزانین وەک، «نەسیم» لەنجە ئەکات. وەک شنە بایەک تێپەڕ ئەبێ، تا جارێکی کە «دووربین» کلۆز ئەبێت لە سەر تەواوی دەموچاو، کە پەنجە و شەماڵ شەڕیانە.

جا ئیتر بە دوای ئەوەدا: «لە درزی پەچەوە»، «جوانی بێ‌ناو»، «بۆ کچێکی بێگانە» یا لە «پاییز»دا یا لە «هاوڕێم بێکەس»دا، لە هەر شوێنێ، تووشی دیمەنەکانی گۆران دێیت، تەماشا ئەکەی، هەرشتە بۆ خۆی بە دەنگی خۆی لە خۆی ئەدوێ، هەر ڕەنگە و وەکوو خۆی بە چاوی خۆی، وەک خۆی چاوێکت لێ داگرێ. بەڵێ گۆران شاعیری وەسفە، بەڵام هەر شتە بۆ خۆی لە خۆی ئەدوێ، ئەوەش خەسڵەتی داهێنانی هونەری زمانپاراوییە لای گۆران.

ئەگەر درێژەی پێ نەدەین و لێکدانەوەی شێوە و فۆرمی شیعری گۆران لێرەدا بە جێ بهێڵین، ئەوا دەبێ شتێ لە ناوەڕۆک بکەینە سەرباسێکی تایبەت و لە پێشا بکەوینە دیوی سێبەری عەسرو ئێوارە، بە ڕووی شارەکەمدا، هەروەک ئاغای هەقشناس بە نەزمێکی ڕەوان باسی کردووە و ئەڵێ: «شارەکەم سنە.»

جا ئێمەیش شاری هەڵەبجەی شەهید، شاری هەنار و تایەر و موختار و گۆران، بە یاد دەکەینەوە.

بەڵێ بۆ ئەوەی لە بنەڕەتەوە، هونەرمەندێک، یا داهێنەرێک بخەیتە چوارچێوەی، بیروباوەڕیەوە لێکدانەوەی باری ژیان و شوێن و گوزەرانی ژیان شتێکی پێویستە.

هەڵەبجەی شەهید شوێنی لەدایکبوونی گۆرانە لە ساڵی ١٩٠٤ زایینیدا. لە بنەماڵەیەکی زانا و خوێنەواری سەربەئاین، عەبدوڵلا بەگی سلێمان بەگی عەبدوڵلا بەگی کاتبی فارسی هاتۆتە دنیا. وەک لە پاشکۆی ئەم دیوانەدا باس کراوە، بنەماڵەی کاتبی فارسی بەو شێوەیە هاتوونە هەڵەبجە.

هەڵەبجە لە بنەڕەتا بە سیانزە ماڵە ناوبانگی بووە، بە هۆی ئەوەی کە سیانزە ماڵهاتوونە سەر باخ وباخاتی میرو شێخ قادر وکانی ئاشقان و ئەو سیانزە ماڵەش تائێستا بە نەوەکانیان دەڵێن لە سیانزە ماڵەن. دوایی جاف و میرو پاشاکانیان دڵیان پیا چووە و بەرەی وەسمان پاشای برای مەحموو پاشا لەوێ گیرساوەتەوە، ئەگەرچی ماوەیەکیش مەحموو پاشا لە هەڵەبجە و پریس ژیانی بەسەر بردووە.

دیارە جاف بە هۆی ئاووهەوا و پیت و بەرەکەتەوە ئەم شوێنەیان وەک هەموو شارەزوور بە دڵ بووە.

ژیان لەناو کۆمەڵدا، ژیانی موڵکداری بووە، خاوەندەسەڵات مالیک بووە و بێدەسەڵاتیش ڕەعیەت.

هەر وەک ئەزانین بنەماڵەی کاتبی فارسیش کە هەر جاف بوون و ژن و ژنخوازیش، لەگەڵ بەگزادەدا پلەوپایەی بۆ دیاری کردوون. بەڵام ئەوەندە خاوەن موڵک و دەسەڵات نەبوون کە ژیانی گۆران بە ئاسانی ڕەخسابێ. لە حوجرە و لە بەردەسی باوکیا خوێندنی ئاینی و ئەدەبیاتی فارسیی بە سەر بردووە، هەر وەک خۆشی چەند جار گێڕاوێتەوە بەشی زۆری تێگەیشتنی لە ئەدەبی فارسیا، بەتایبەتی سەبارەت بە «حافز» لای شێخ بابە ڕەسووڵ زیاتر کەڵکی وەرگرتووە.

مەلا شێخ تۆفیقی بەرزنجە، خوا لێی خۆش بێ، بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ باوکما، ڕەفیقە فەقێ بوون. وتی: باوکت سەرچاوەی خوێندەواریی لە ئێمە ڕۆشنتر بوو، بۆیە لێم پرسی فەقێ عەبدوڵلا، ئەم هەموو شتە لەکوێ ئەزانی، وتی زۆر ئەخوێنمەوە. لەم مشتومڕەوە گۆران کتێبێ بە دیاری ئەدا بە شێخ تۆفیق، بە ناوی «زەخائیرو لمەحفووزات» کە بۆی هێنام و سەیرم کرد، بە خەتی خۆی پێشکەشی کردبوو.

بە خێرایی ئاماژەم بۆ ئەندەکێ لە بارەی گوزەرانی گۆران کرد، کە پێویستە لە ڕووی هۆنەرییەوە، پەیوەندییە دەروونییەکانی داهێنەر بدۆزرێتەوە.

جا گۆرانێک لە بناری هەڵەبجەدا، چەشی وشەی کوردیی ڕەسەنی جاف و زاراوەی هەورامانیی تەڕو پاراوو دیمەنی سروشتی پێدەشت، تا لووتکەی بەرزی گەردنکەش، لە پەیوەندێکی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی سەرەتاییدا و سەردەمی نزیک بە داستانی کۆن لە سنووری گوێثاگردانا، دەبێ وەک بەهرەی شیعری بە دەست هێنابێ، سەلیقەی بۆ داهێنانیش لە سنووری چەشێکی ئەدەبیی ئەوتۆدا بێ، کە لەگەڵ باری ڕۆشنبیریی بنەماڵەکەیدا سەرچڵ بێ. ئەم لێکدانەوە بەرکوڵە هەوێنی هزری گۆرانمان بۆ دیاری ئەکات و لە دوو مەزەنەدا گۆرانمان بۆ کۆ دەبێتەوە.

یەکەم ئەوەیە کە جوانیی سروشت و جۆری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەڵسوکەوتێکی ڕۆمانسیدا گۆران دەکاتە شاعیری شەیدای جوانیی سروشت و پێ هەڵدان بە جوانییەکانی سروشتا، تەنانەت وای کردووە کە هەندێ جار، پاییزی لەکەژاوەیەکی ڕازاوەدا خستۆتە بەر هەست و تێڕوانینی خوێنەر، کە لەوەوبەر پاییز بەو چێژ و خۆشییەوە، نەینواندووە لای خوێنەری سەردەمەکە.

ئەوەتا لە «هەوری پاییز» کە ئەڵێ:

لە دەریاوە قەتارەی هەوری بارشت کەوتە دووی پێشەنگ
بەسەر سنگی چیادا، چۆکی داداوە، کش و بێدەنگ

ئەم دیمەنە و ئەم هەڵوێستە کە گۆران لە ڕووی هەوری پاییزا گرتوویەتی بۆ ئەوەیە کە پاییز بەسەر سروشتا بگری و لە جوانترین شێوەدا بۆمان دەگرێتە چوارچێوەیەکی بلوورین و لە ناو ئەو چوارچێوە جوانەدا وێنەکەی کە گۆران پێشانمان ئەدا دێتە دەنگ و بە ڕەنگ و بۆی خۆیەوە ئەڵێ:

بەفر ئاسۆی بڵند بگرێتە چوارچێوەی بلوورینی
لە چەم هەڵسێ خوڕە و هاژەی شەپۆلی ئاوی خوێنینی

ئەگەر بێت و لەم گۆشەنیگایەوە، لە گۆران ورد بینەوە، ئەبینین کە هەمیشە سروشتی بە جوانیی ژیانەوە بەرچاو خستووە، هەر وەک لە «ئافرەت وجوانی» یا ئەڵێ:

بە لام تەبیعەت هەرگیزاوهەرگیز
بێ ڕووناکیە بێ بزەی ئازیز

یا لە «ڕەوتێکی جوان»دا:
ئەوەندە جوان لەوە جوانتر
لە شنەی بای شەو ڕەوانتر

هەتا ئەگاتە

پێی ناز ئەنێ بەسەر ئەرزا
جوانێ لە بەژنێکی بەرزا

لەناو سروشتی بێگەردی سەردەمی گۆرانا، ژیان بۆ خۆی هەر وەک هەیە، خاڵی نەبووە لە تراژێدیا ڕۆمانسیەکانی دەروونی پر سۆزو شۆر.

لە پلە و پایەی کۆمەڵایەتیی گۆرانا و لە ئاستی نەدارایی ڕۆژگارا، گۆران لە بەردەم هەموو ئەو جوانییانەدا زۆر ناکام ئەبێ، گەلێ پەپولەی لە دەست بەر ئەبێ وگەلێ گوڵی ئاواتی هەڵئەپرووکێ:

ئەی چاو چە شنی بازی قەفەس هە ڵوەرێ پەرت
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دولبەرت؟
«ئاواتی دووری»

هەر لە دیدار و بیستن و بۆن و لامیەوە بە هەموویانا ئەگەر/ێ سواڵی یادگارێکیان لێ ئەکات بەڵام بێهوودەیە. بە ناکامی پەنا ئەباتە بەر خاتیرە و وێنەی خەیاڵی ئەو عیشقەی لێ داوا ئەکا تا وەختی ئیحتیزار

چەشنی ئاوێنە،
دایم بنوێنە:
عەشقی قەدیمی یار
تا وەختی ئیحتیزار

هەروەها «خۆزگەم بە پار»، «سکاڵا» و لە «جوانی سەرەڕێ»دا تەسلیمی جوانی ئەبێت:

تۆیش لە گەڵ هەر جوانێک ئەبینم تا ئەمرم
ئەبیتە مرواری بۆ ملوێنکەی شیعرم

جا لێرەوە گۆران جوانیی سروشت و هەموو ئەو جوانییەی، لە تراژێدیای ژیانی ڕۆمانسییانە، ڕایدەکێشێتە بەردەم واقعی ژیان، کە لە گوڵی خوێناویدا، لە هەردوو شیعری هیوادا، لە هەردوو شینی بێکەسی هاوڕێیا، لە گوڵی ناکاما... بوونی وزەی بەرهەڵستی و ڕووبەڕوو بوونەوە ئەدۆزێتەوە. داهێنان لای گۆران بۆ خزمەتی نەتەوەکەی بووە، تەنانەت ژیانیشی هەر بەو جۆرە بناوانی لێ‌هەڵگرتووە کە شیعرەکانی کوردستان و سروودەکان و... بەڵگەی ئەو ڕاستییەن، جائەگەر لەسەر خواستی کەسانی وەک «ڕەفیق حیلمی» و تۆفیق وەهبی، چوویێتە فەلەستین و بەدوای ئەوەدا گەڕاوە ڕێگایەکی باشتر بۆ خۆشیی کورد بگرێتە بەر هەر بە نیازی نەتەوەکەی بووە.

گۆران لە کاتێکا تەواو لە بیری کۆمونیستییەوە نزیک بووە، بۆ کۆنفرانسی مامۆستایان ئەو شیعرە پڕسۆزو پڕ شانازییەی تیا وتووە:

ئەگەر دوێنێ مامۆستاکان
یەک سوڵتانیان پێ ئەگەیان

ئەوشانازییەی گۆران کردوویەتی بە ڕابوردووی نەتەوەکەیەوە، هەمیشە لەگەڵیا ژیاوە و ویستوویەتی وەک ئاڵای شانازیی کورد بەرە و پێشەوە بشەکێتەوە، بۆیە داوا ئەکات کە ملیۆنان سوڵتان پێ بگات. ئەوەندەش ڕەگی قووڵی شانازییەکان لە بیری گۆرانا پەخش و داچوو بووە کە بەر لە هەموو شتێ ئاینی نەتەوەکەشی مەبەست بووە:

نەوەی شێرکۆ وسەلاحەدین
پاڵەوانی غەزای ڕێی دین.
ئەوەی بۆ پاسی قەلای قودس
وەک بەردی رووی شۆرا بێ ترس
لە بەر شیر و تیرا وەستا
تا دەنگی هەی ئامان هەستا
لە گرۆی خاچ
کە خاچیان کردبوو بە پاچ
بۆ رووخاندن،
بۆ ئاسیا پڕ لە مردن
پڕ لە کەلاوەی شار کردن

باوەڕ ناکەم مروڤ لە ئاستی ئەم دیمەنەدا، دەستەپاچە بێ. جا دیارە گۆرانی خاوەنمەبەست زیاتر کەوتۆتە سەر ڕەچەی زانینی ڕاستی، ئەوەتا سەلاحەدین ئەوشانازییە ئاینییە، خاچپەرستانیش کاولکەر و دوژمنی دین. بۆیە دێمە سەر ئەوە باس لەوە بکەین، کە گۆران چۆن و چ خزمەتێکی بە کورد کردووە.

هەر بۆ ئەوەش بووە ڕووی لە دەرگای بیروباوەڕی مارکسیزمی کردووە، تا ئەمە خوایە کورد بە شتێ بگا، بەتایبەت بۆچوونی ڕۆشنبیرانی سەردەمی گۆران، لە دوای جەنگی جیهانیی دووهەم، لەمڕووەوە، بە کۆمەڵ و بە تاک لەم ڕێگایەوە، شوێنپێیان هەڵگرتووە.

واتە شوێنپێ هەڵگرتنی مارکسیزم، چ وەک لایەنی ڕۆشنبیری یا سیاسەتی بە کۆمەڵ لە ناو حزبەکاندا بەردەوام، جێی مشتومڕ بووە.

بۆ نموونە تاکۆنگرەی پێنجەمی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەگەر ورد بینەوە، دەبینین چەندین جار دروشمی مارکسییەت بەسەر دەرگای پرۆگرامیانەوە بووە و لەم ڕووەشەوە چەندین کێشەی

سیاسی له ناو پارتیدا ڕووی داوه.

هەروەها هەڵپەی داوی ماویستی به دوای پارتیداکه ئەویش هەر له مارکسییەت سەرچاوه ئەگرێ، پێناسەی زۆر لاوان وگرووپ وکۆمەڵی ناو کوردستان بووه.

به پێویستی ئەزانم لای خوێنەری کورد و به تایبەتی نەوەکانی لەوه دوا، ئەوه بزانن کەگۆران دوای گەڕانەوەی له شوورەوی ئەو نیشانەی خۆشبینییەی جاران به ڕوویەوه نەما.

بۆ ئەمەش له دوو دانیشتنا قسەی خۆی کردووه، ئەوه بوو له حەفتاکانا یا له سەرەتای هەشتاکانا مشتومڕێ له نێوان دوکتۆر عیزەدین و خوالێخۆشبێ، شاعیری ناودار سالح دیلانا هەڵایسا و له لاپەڕەی یەکێ له ژمارەکانی هاوکاریدا لەمەڕ ئەو ڕا و بۆچوونەیان نووسی.

هەر چۆنێ بێ، گۆران هەرچی بوو بردییه خاکەوه، بەڵام شیعرەکانی و ڕێبازی داهێنانی له ناوەڕاستی سییەکانەوه گەلێ خزمەتی به نەتەوه گەیاندووه، بۆنموونه:

١- تووڕ هەڵدانی عەرووزی عەرەبی. چونکه له ڕاستییا ئەم خاڵه دوو شتی مێژوویی بۆ کورد تۆمار ئەکات که هەمیشه تاجی سەری ڕۆڵی پێشکەوتنخوازی و داهێنانی ئەدەبی کوردییه.

میللەتی کوردی بێ دەسەڵات و پشت و پەنا که دوژمنەکانی وایان چاوەڕوان ئەکرد ناوی کوێر بێتەوه، کەچی له ناوەڕاستی خاوەرمیانەدا پێش هەموو نەتەوەکان کەوت و توانیی هیجای بڕگەیی خۆی به کار بێنێ.

تەنانەت هەتا ئێستاش شیعری نوێی عەرەبی، عەرووزی هەڵنەبواردووه، ئەگەرچی ئەمان میراتی نەتەوایەتیی خۆیانه. بەڵام له ئەدەبی فارسییا، نه نیما و نه ئەحمەد شاملوو، نەیانتوانی کێشێکی خۆماڵیی فارسی بدۆزنەوه و بانگەوازی بۆ بکەن.

٢- پاکۆی زمانی کوردی له ڕێبازی داهێنانی شیعری گۆرانا هەمیشه شتێکی سەرەکی بووه، نەک دروشم. بۆ ئەمەش تا ئێستا له شیعری تورکی و فارسیشدا، وشەی عەرەبی زەق و ناقۆڵا به کار هاتووه و دێ، که له زۆر شوێنا له جێی خۆی و به واتا عەرەبیەکەی به کار نەهاتووه. له یەکێ له بەرهەمەکانی شاملوودا، شیعرێکم بەرچاوکەوت «سه سرود برای آفتاب» ٣٨ وشەی عەرەبیی تیا بوو، بەڵام ئەمڕۆ به زمانی ئەدەبی کوردی به دەگمەن ڕێ دەکەوێ وشەیەکی عەرەبی له ناو دەیان نووسەرا وا به کار بێت. ئەوەش هەوڵ وکۆششی گۆرانه له داهێنانەکانیا.

٣- پێشکەوتنی مێژوویی شیعری کوردی له بواری نوێخوازی و داهێنانا له سەر دەسی بەهەشتی و پایەبەرز شێخ نووری و هاوڕێکانییا، پەرەپێدانی له سەردەستی گۆرانا، به هەموو خاڵەکانی سەرەوەش دەتوانین بەوەی ڕەچاو بکەین، که ئەوکاره یەکێکه له کۆڵەکه سەرەکییەکانی لەناونەچوونی فۆلکلۆر و فەرهەنگی کوردی و لایەنی ئەدەبی کوردی، ئەگەر ململانێی سیاسی له کوردستانا ئەوەنده ئاڵۆز نەبووایه، ئەدەبی کوردی ئاڵای پێشڕەوایەتی و شیاریی میللەتی له دەستا بووه و له دەستیایەتی و هیچ ڕێبازێکی سیاسی ناتوانێ له دەستی بسێنێ.

ئیتر بۆ ئەوەی هەموومان، چ لە ڕووی ئەوەوە یا لە ڕێی هەڵوێستەوە، لەناو شیعرەکانی گۆرانا، ڕووبەڕووی خۆی ببینەوە، منیش لێرەدا هەر بەو نیازە سەرنجێ دەدەمە سەر ئەو شیعرانەکە لە نەخۆشخانەوە ئەڵێ:

بەڵێ دوکتۆر خۆشکان! ماتم
هەر من نیم ماتی وڵاتم
لەناو هەزارانا: تاک، تاک
لێومان هەیە پێ بکەنێ
لای ئێمە بۆ دنیای شادی
وا تازە خەڵک هەنگاو ئەنێ.

ئیتر هەروەک لێوی ماتی بەسەر خەندەیا لێک نا، لە نەخۆشخانەی بەرقیخە.
ڕۆژی ١٩٦٢/١١/١٨، لە سلێمانی لە باوەشی کوردستانی دایکا، چاویشی بەسەر ماتی و نائومێدیا لێک نا!*

ئەژی گۆران
٢٥ی حوزەیرانی ١٩٩٥

# پێشەکی

کە لە ساڵانی ۱۹۵۳ و ۱۹۵۴ دا لە«ژین» لە گەڵ مامۆستا گۆران دائەنیشتم، گەلێ جار ئەمدی هەندێ دەفتەرە شڕ لە چەکمەجەی مێزەکەی بەردەمی دەردێنێ و شیعری لەبەر ئەنووسێتەوە و ئـەیدا بـە پیترێکخەرەکەی چاپخانە و دەفتەرە شڕەکان ئەخاتەوە شوێنی خۆیان[1].

کە لە سەرەتای ئەیلوولی ۱۹۵۴یشدا مامۆستا ژینی بە ناچاری بەجێهێشت و زۆریشی پێ نەچوو گیرا و دوابەدوای خۆی هۆگر و ئەژیی کوڕیشی کەوتنە بەر پەلامار و منداڵەکانی تریشی ورد بوون، بیرم لەوە کردەوە چۆن ئەو دەفتەرانەی مامۆستا وەرگرمە لای خۆم و نەهێڵم لەبەر نەبوونی کەسێ ئاگاداریان بکا، بفەوتێن. چووم بۆ ماڵی مامۆستا و چوویشم بۆ ئیدارەی ژین. پاش گەڕان و پشکنین هەرچی دەفتەر و قاقەزە شڕەی مامۆستام بەگیرکەوت هەڵمگرتن و هێنامن. بەڵام من خۆیشم لە خۆم ئەمین نەبووم. لەبەر ئەوە هەر زوو بیرم لەوە کردەوە کەسێکی وایان بۆ بدۆزمەوە دەسپاک و دڵپاک بێ و لە هیچیشدا نەبێ. دۆزینەوەی کەسانی وا زەحمەت نەبوو. بەو چەشنە ئەو دەفتەرانەم بە ئەمانەت لای خێزانێک دانا.

کە پاش شۆڕشی پیرۆزی تەمووزی ۱۹۵۸ بە نیازی سەردانـی دۆست و بـرادەران چـوومەوە سلێمانی، سەرم لەو خێزانەیش دا. چەندم پێخۆش بوو کەبیانووی ماڵ پاش بەخێرهاتن و هەواڵپرسین و ئاو و چا بۆ هێنان، هەڵسا چوو سندووقی جلەکانی خۆی کردەوە، دەفتەرەکانی بۆ هێنام و خستنیە بەردەستم.

* * *

پێش ئەوەی لە دوادوایی ساڵی ۱۹۵۲دا گۆران بناسم، ئاشنای شیعریشی نەبووم. بەڵام کە پاشان بووین بە دۆست و هاوڕێی کار و بیر، وامان لێ هات لەوانەیە بڵێم ڕۆژ نەبوو نەچمە لای بۆ ژین و بەڵکوو لە بەردەستیشیدا بووم بە «ڕۆژنامەنووس»، دیوانە چاپکراوەکانی خۆی پێشکەش کردم و بە دەستی خۆی و بە وشە ڕەنگینەکانی ڕستەی دیاریی لەسەریان بۆ نووسیم. چەشی ئەدەبیی تیا پەروەردە کردم و بوو بە مامۆستام. منیش دیوانەکانیم پتر لە جارێ خوێندەوە و هەموو هەفتەیەک شیعرە تازە بڵاوکراوەکانیم لە لاپەڕەکانی ژینەوە ئەقۆستەوە.

کە لە ناوەڕاستی ۱۹۵۷یشدا ئازادیم دەسگیر بووەوە و لە کەرکووک نیشتەجێ بووم، ماوەیەک

سوودم لە ماوەی بێکاری و پاشان لە کارکردنی ناو کتێبخانەی گشتیی کەرکووک وەرگرت و دەستم کرد بەگەڕان بە دوای شیعری کۆنی گۆراندا. بۆیە کە پاش شۆڕشی تەمووز، وەک وتم، ئەو دەفتەرانەم کەوتەوە دەست، ئەوەم بە دەسکەوتێکی ئێجگار مەزن دانا. ڕاستە کەشی وابوو. ئەی ئەگەر لە ڕۆژێکی ڕەشا بفەوتانایە، یا ئەو خێزانە بە دڵسۆزییەوە هەڵیانە گرتنایە، من چیم پێ ئەکرا لەوە زیاتر کە هەندێ خەمی تاڵ بخۆم و میللەتی کوردیش گەنجینەیەکی تری ئەدەبی، وەک سەدان گەنجینەی تری لەکیسچوو، لەکیس ئەچوو...

* * *

دەفتەرەکانم لەگەڵ خۆم بردەوە بۆ کەرکووک. دانیشتمە سەر ڕاستکردنەوەی ئەو شیعرانەی لام بوون لەبەر دەفتەرەکان و نووسینەوەی ئەو پارچانەیان کە نەمبوون. جا کە لێبوومەوە و دڵم ئاوی خواردەوە، دەفتەرەکانم وەک دیارییەکی بەنرخ هەڵگرت و هەڵسام چووم بۆ سلێمانی بۆ لای مامۆستا گۆران و پێشکەشیم کردن. هەر مەپرسە ئەویش چەندی پێ خوش بوو، باوەڕ بکەن لە خۆشییانا وەخت بوو شاگەشکە بێ ... ئەو ئێوارەیە تا درەنگێکیش هەر پەڕەکانیانی ئەم دیوو ئەودیو ئەکرد.

* * *

پاش ماوەیەک گۆران ئاگاداری کردم کە نیازی لە چاپدانی کۆمەڵە شیعرێکی تری بە ناوی «سروشت و دەروون»ەوە هەیە کە لەمێژ بوو گفتی لەچاپدانی دابوو. منیش نوسخەیەکی تەواوی شیعرە بڵاوکراوە و بڵاو نەکراوەکانی لای خۆمم بۆ نووسییەوە و بۆم نارد. «سروشت و دەروون»ە کەی خستە ژێر چاپ و فۆرمەیەکیشی لە چاپخانەی ــ وا بزانم ــ کامەرانی لە سلێمانی لێ چاپکرا. ئیتر نازانم لەبەر چی بوو پرۆژەکەی تەواو نەکرد و تا سەری نەبرد؟ ڕەنگە بێ لەبەر نەداراییی خۆی و ناچیزیی ئەو پارمەتییە ٦٠ دیناریە بووبێ کە وەزارەتی مەعاریف گفتی دابووێ بۆ لەچاپدانی ٦ فۆرمە بیداتێ!

لەوەپاشیش من هەر ڕێگاکەی خۆمم بەر نەدا. گۆران هەر شیعرێکی نوێی دائەنا، لای خۆم ئەمنووسییەوە. لە پەیجۆری گۆڤار و ڕۆژنامە کۆنەکانیشا هەر بەردەوام بووم بەڵکوو شیعرێکی پێنەزانراوی تری بدۆزمەوە. بەم جۆرە، ئەتوانم بڵێم، من بووم بە سەرچاوەی یەکەمی شیعری گۆران. دەسنووسەکانی لای من، بوون بە نوسخەی یەکەم و چەند دانەیان لەبەر نووسرایەوە. گۆران خۆیشی هەر بەمچاوە سەیری ئەکردم. تەنانەت کە دواجار لە هاوینی ١٩٦٢دا لە مۆسکۆ گەڕایەوە، ئەو دەفتەرەی شەش پارچە شیعرە دواییەکەیی تیا بوو کە لەوێ داینابوون، بەرلەوەی لە هیچ گۆڤارێکا بڵاو بکرێنەوە، بە منی دا.

گۆران لەو ماوەی دواییەی ژیانیدا و بەتایبەتی پاش گەڕانەوەی دواجاری لە مۆسکۆ، زۆر بە پەرۆشەوە بوو نەمرێ تاکۆمەڵەی شیعرەکانی لە دیوانێکدا ئەبینێ. دیار بوو لەوێ دیبووی چۆن کۆمەڵە شیعری شاعیرە مەزنە کۆن و تازەکانی ئەو وڵاتە لە بەرگی قەشەنگ و لەسەر قاقەزی گرانبەها و بە نەخش و قەڵەمکێشیی جوانەوە، بە دەیان هەزار دانە بڵاو ئەکرێنەوە و خەڵک چەند مانگ پێش کەوتنە

بازاڕیان ناوی خۆیانیان بۆ ئەنووسن و سەرەیان بۆ ئەگرن. بەڵام بەداخەوە ئەو ئاواتەی لەگەڵ خۆی بردە گڵ و بەدیهێنانی بەجێ هێشت بۆ دۆستانی شیعری. ئیتر لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ ئەم ئاواتە پیرۆزە لە دڵی مندا، وەک لە دڵی سەدان کەسی تریشدا، گینگڵ ئەخواتەوە و گەلێ جار، گەلێ کەس بیریان لەوە کردۆتەوە هەوڵێ بۆ لە چاپدانی ئەم دیوانە بدەن، بەڵام مەسەلەکە هەرگیز لە سنووری بیر لێ کردنەوەیەکی ڕووت دەرنەچووە. تا دواجار لە ۱۹۷۸دا لیژنەیەک لە هەندێ لە ئەدەبدۆستان و کەسان و دۆستانی گۆران پێکهات کە بریتی بوون لە هێرۆ و هۆگر و ئەژی گۆران ود. عیزەدین مستەفا و کاکەی فەللاح و حەمە کەریم فەتحوڵڵا و جەلال دەبباغ و بنووسی ئەم چەند دێڕە بۆ کۆ کردنەوە و ڕێکخستنی دیوانەکە و ئامادە کردنی سەرەتایەک بۆی، بە هیوای ئەوەی پاشانیش پەخشانە ئەدەبی و ڕۆژنامەنووسییەکان و نووسینەکانی کەیشی لە دوو بەرگی تردا بلاو بکەینەوە. دەسگای چاپەمەنیی «پێشەنگان»یش گفتی دا ئەو بەرهەمانە لەسەر ئەرکی خۆی لەچاپ بدا. سەرەتای کاری ئەم لیژنەیە ئەو شیعرانەی گۆران بوو کە پێشتر من کۆم کردبوونەوە. بۆیە بانگەوازێکمان بۆ هەموو ئەدەبدۆستان بلاو کردەوە لە ڕۆژنامەکاندا[٢] بۆ ئەوەی چی شیعری بلاونەکراوەی گۆرانیان لا بێ بۆمانی بنێرن. لەگەڵ ئەوەش کە زۆر کەس بە دەنگمانەوە هات، لە پارچە شیعری منالانی «بەفر» بەولاوە شیعرێکمان دەسگیر نەبوو نەمانبێ.

کاری لیژنەکە هەر ئەوەندە بوو، بەڵام لەناو ئەندامەکانیا کاک جەلال سەرلەنوێ لە بەر دەسنووسەکانی من، سەرجەمی شیعرەکانی نووسییەوە و بابەتبەندیی کردن و ڕەزامەندیی ڕەقابەی بۆ لە چاپدانیان وەرگرت. دوکتۆر عیزەدینیش بڕیار بوو سەرەتایەکی تێروتەسەل بۆ دیوانەکە بنووسێ، بەڵام پاشان وا بە باش زانرا سەرەتاکە بکرێ بە «دیراسە» و پاش بلاوبوونەوەی سەرانسەری بابەتە ئەدەبییەکانی گۆران بنووسرێ، تا هەموویان بگرێتەوە.

زۆری پێ نەچوو دەسگاکەی گفتی لە چاپدانی بەرهەمەکانی دابوو، تێکچوو. بۆیە من مەسەلەکەم خستە بەردەستی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتیی نووسەرانی کورد و ئەویش بڕیاری دا چیی پێ بکرێ بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە لە ئەستۆی خۆی بگرێ و هەوڵی بۆ بدا. جا ئێستا کە بە دەستپێشخەریی یەکێتیی نووسەرانی کورد و بە یارمەتیی مەردانەی کاک عەلی بۆسکانی کە پارەیەکی باشی بۆ لە چاپدانی ئەم دیوانە بە قەرز دا بە یەکێتییەکەمان و بە هاوکاریی پیرۆزی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاریی عێراق کە ڕازی بوو تێکرای بەرهەمەکانی گۆرانمان لە چاپخانەکەی خۆیدا بۆ لە چاپ بدا و بە تەقەلای چالاکانەی بەڕێوەبەر و کرێکارانی چاپخانەی کۆڕ، ئەم خواستە بەجێیەی هەموو ئەوانە دێتە دی کە بە تەنگ کولتووری کوردەوەن، ئەبێ ئەم کارە بە گەورەترین کاری ئەدەبیی ئەم ساڵانەی دواییی گەلەکەمان و بە باشترین زیندووکردنەوەی یادی ۷۵ ساڵەی لەدایکبوونی گۆران دابنێین کە لە ساڵی رابوردوودا بەسەرمانا تێپەڕی و لە هەمان کاتا سوپاسی گەرمی هەموو ئەم لایەنە بەشدارانەیش بکەین.

له سه‌رده‌می ژیانی گۆران خۆیدا دوو کۆمه‌ڵه شیعر و قه‌سیده‌یه‌کی درێژی له چاپ دراوه، جگه له‌وه‌که زۆربه‌ی شیعره‌کانی به درێژایی ۳۰ ساڵ ژیانی ئه‌ده‌بیی خۆی له گۆڤار و ڕۆژنامه کوردییه‌کانی عێراق و ده‌ره‌وه‌ی عێراقدا له چاپ دراون:

کۆمه‌ڵه‌ی یه‌که‌می «به‌هه‌شت و یادگار»ه که له ساڵی ۱۹۵۰ دا له‌سه‌ر ئه‌رکی مامۆستا عه‌لائه‌ددین سه‌ججادی له چاپخانه‌ی مه‌عاریفی به‌غدا له ۷۵ لاپه‌ڕه‌دا له‌چاپ دراوه و بڕیار وا بووه ببێ به ئه‌ڵقه‌ی یه‌که‌می «زنجیره‌ی دیوانی تازه» که له سه‌رده‌می گۆران خۆیدا ته‌نها ئه‌ڵقه‌ی دووهه‌می به دوادا هات و ئه‌وه بوو «فرمێسک و هونه‌ر له‌گه‌ڵ دوو هاوینه‌گه‌شت»یش هه‌ر له‌و ساڵه‌دا له‌سه‌ر ئه‌رکی کاک ره‌شید عارف و به پێشه‌کیی مامۆستا عه‌لائه‌ددین سه‌ججادییه‌وه وله هه‌مان چاپخانه له چاپ‌درا.

«به‌هه‌شت و یادگار» و «فرمێسک و هونه‌ر له‌گه‌ڵ دوو هاوینه‌گه‌شت» جارێکی تریش له ۱۹۷۱دا له سلێمانی له‌سه‌ر ئه‌رکی کاک عومه‌ر عه‌بدوڕڕه‌حمان خاوه‌نی «کتێبخانه‌ی سلێمانی» پێکه‌وه له‌به‌رگێکدا له چاپخانه‌ی کامه‌رانی له سلێمانی له چاپ درانه‌وه.

قه‌سیده درێژه‌که‌شی که هه‌ر له سه‌رده‌می خۆیدا بڵاو کراوه‌ته‌وه، «په‌یامی کورد بۆ میهره‌جانی چواره‌می گه‌نجان و قوتابییان له بوخارست)»ه که له ۱۹۵۴دا له چاپخانه‌ی ژین له سلێمانی له چاپ دراوه.

پاش مه‌رگی گۆران، له لایه‌ن هۆگری کوڕی و براکانییه‌وه له ۱۹۶۸دا کۆمه‌ڵه شیعرێکی تری به ناوی «سروشت و ده‌روون له‌گه‌ڵ ئۆپه‌ریتی ئه‌نجامی یاران» له‌چاپ‌دراوه. جا نازانم ئه‌و «سروشت و ده‌روون»ه‌ی که مامۆستا خۆی نیازی له چاپدانی هه‌بوو له ۱۹۵۸دا و خستیشیه ژێر چاپ و ته‌واوی نه‌کرد، هه‌ر ئه‌و پارچه شیعرانه‌ی تیا ئه‌بوو که له‌م کۆمه‌ڵه‌دا هه‌ن یا جیاوازییان هه‌یه؟

ئێمه له‌م به‌رگی یه‌که‌می «سه‌رجه‌می به‌رهه‌می گۆران»ه‌دا که تایبه‌تییه بۆ شیعره‌کانی، هاتووین «به‌هه‌شت و یادگار» و «فرمێسک و هونه‌ر»ه‌که‌یمان، وه‌ک چاپه‌که‌ی سه‌رده‌می خۆی بڵاوکردۆته‌وه، ئه‌وه نه‌بێ که سه‌ره‌تاکه‌ی مامۆستا عه‌لائه‌ددینمان لابردووه که بۆ «فرمێسک و هونه‌ر»ی نووسیوه و دیاره هه‌ڵه‌کانیشمان ڕاست‌کردۆته‌وه. ئه‌م کتێبه‌ی ئێمه له ۱۳ کۆمه‌ڵه پێک‌دێت که «به‌هه‌شت و یادگار» و «فرمێسک و هونه‌ر»ه که‌ی کۆمه‌ڵه‌ی یه‌که‌م و دووهه‌مینی مامۆستا گۆران، وه‌ک خۆی له داوێنی «به‌هه‌شت و یادگار»ه که‌یه‌وه نووسیویه، ویستوویه له «زنجیره‌ی دیوانی تازه»دا «دوو هاوینه‌گه‌شت» و «فرمێسک و هونه‌ر» و «سرشت و ده‌روون» و «شیعر بۆ منالان» بڵاو بکاته‌وه. ئه‌وه بوو خۆی پاشان «دوو هاوینه‌گه‌شت» و «فرمێسک و هونه‌ر»ه که‌ی خسته پاڵ یه‌ک و پاش‌و پێشی پێ کردن. ویستیشی «سروشت و ده‌روون»ه که‌ی چاپ بکا، به‌ڵام ته‌واوی نه‌کرد. ئێمه‌یش هه‌ر به نیازی شوێن پێ هه‌ڵگرتنی مامۆستا خۆی له‌م دیوانه‌دا، وه‌ک وتمان، «به‌هه‌شت و یادگار»ه که‌یمان کرد به کۆمه‌ڵه‌یه‌ک و «فرمێسک و هونه‌ر» و «دوو هاوینه‌گه‌شت»ه که‌یشمان پێکه‌وه کرد به کۆمه‌ڵه‌یه‌کی تر. ئه‌و شیعرانه‌یشی

که به بۆچوونی خۆمان لەگەڵ بابەتی «سروشت و دەروون» یەک ئەکەوتن، بەم ناوەوە کردمانن بە کۆمەڵەی سێهەم. کۆمەڵەیەکیشمان بۆ «شیعر بۆ منالاّن» دانا کە کۆمەڵەی دەهەمە. «لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازا» و «پەیامی کورد بۆ میهرەجانی چوارەمی گەنجان و قوتابییان لە بوخارست»یشمان لەبەر درێژی و هاوبابەتی کرد بە کۆمەڵەیەکی تر. کۆمەڵەکانی تریش ئەمانەن: «لە کۆڕی خەباتا»، «ئۆپەرێت»، «پەیس لە یەک پەردەی کورتا»، «شیعری گەپ»، «سروود»، «وەرگێڕاو»، «بۆ زاخاوی مێشک» کە ئەو مەتەڵە شیعرییانەی تیایە مامۆستا وەختی خۆی بۆ خوێندەوارانی ژینی داناون و لەوێدا بڵاویکردوونەتەوە. دوا کۆمەڵەیش شیعری «هەمە جۆر»ە. دیارە ئێمە لە جوێکردنەوەی ئەم کۆمەڵانەدا ــ لە «بەهەشت و یادگار» و «فرمێسک و هونەر» دا نەبێ ــ ئەوەمان ڕەچاو کردووە هەر پارچە شیعرێک لە شوێنێکا دانێین کە بۆی بگونجێ[٣].

بەم‌شێوەیە کارێکمان کردووە ئەوەی ئارەزووی لە هەر جۆرە شیعرێکی گۆران بێ، لەجیاتی ئەوەی بەپێڕستی سەرانسەری دیوانەکەدا بگەڕێ، بتوانێ بەپێی بابەت پێڕستی کۆمەڵەکەی تەماشا بکا و شیعرەکە بدۆزێتەوە.

* * *

مامۆستا گۆران خۆی هەندێ وردە پەراوێزی لە «بەهەشت و یادگار» و «فرمێسک و هونەر»ەکەیدا و هەروا لەسەر چەند پارچەیەکی کۆمەڵەی «سروشت و دەروون»یش نووسیوە. ئێمە ئەو پەراوێزانەی ئەومان وەک خۆیان بڵاوکردۆتەوە و خۆیشمان لە هەندێ شوێندا هەندێ پەراوێزمان نووسیوە. بە مەبەستی تێکەڵی یەک نەبوونی ئەو پەراوێزانەی ئێمە و مامۆستا، لەداوێنی پەراوێزەکانی خۆمانەوە نیشانەی (م.م. ک)مان داناوە. بەم‌جۆرە هەر پەراوێزێک لەم دیوانەدا ئەو نیشانەی پێوەبێ هی خۆمانەو هەرکامیش پێیەوە نەبێ هی مامۆستا گۆران خۆیەتی.

* * *

ئێمە پێ‌بزانین گۆران شیعری بڵاونەکراوەی زۆر کەمە. هەرچی وتووە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی دەرەوە و ناوەوەی عێراقدا بڵاوکراوەتەوە. بەپێی ئاگاداریی ئێمە گۆران لە گۆڤاری «هاوار»ی سووریا و ڕۆژنامەی «ژیانەوە» و «ژین» و «ئازادی» و گۆڤاری «گەلاوێژ» و «دەنگی گێتیی تازە» و «هیوا» و «شەفەق» و «بەیان» و «بڵێسە» و «ڕووناهی» و نامیلکەی «دیاریی لاوان» و «یادگاری لاوان»ی عێراقدا شیعری بڵاوکردۆتەوە. لەم دیوانەیدا هەرچی شیعرێکی کە پێمان زانیبێ، بڵاو کراوەتەوە، سێ پارچە نەبێ کە یەکەمیان لە سەرەتای نیسانی ساڵی ١٩٥٤دا لە ڕۆژنامەی «ئازادی»دا بڵاوکراوەتەوە و دووهەمیشیان هەر لەو ساڵەدا لە ڕۆژنامەی «دەنگی داس»دا بە ناوونیشانی «دەرەبەگ» بڵاوکراوەتەوە[٤]. تا ئەم دیوانەش پێشکەشی ڕەقابە کرا ئەو دوو پارچەیەمان دەسگیر نەبوو[٥]. سێهەمیشیان هەرچەند بە دەستەوە بوو، بەڵام بۆ بڵاوکردنەوە دەستی نەئەدا. بیستوویشمانە پارچە شیعرێکی بچووکی بە ناوونیشانی «ڕەشەبا» هەیە [٦] ئەویشمان دەسگیر نەبوو. مامۆستا «ڕەفیق

حیلمی»یش باسی غەزەلێکی حەوت بەیتی ئەکاکەگۆایە یەکەم پارچە شیعرە گۆران دایناوە، بەیتی یەکەمی لە بەرگی دووهەمی «شیعروئەدەبیاتی کوردی»یەکەیدا بلاّوکردۆتەوە و ئیتر ئەوی دیکەی دیار نییە. ئێمەیش ئەم تاقە بەیتەمان لەکۆمەڵەی «هەمەجۆر»دا بلاّوکردۆتەوە[٧]. سەرەڕای ئەمانە کۆمەڵێ سروودیشی لە بەندیخانە داناوە دوانیانمان بە ناتەواوی لا بوو هەروا بلاّومان کردنەوە. ئەوانی تری فەوتاون، مەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئەرشیفی تایبەتیی بەندیخانەکاندا بدۆزرێنەوە.

لە بیرمە، ڕۆژی ٢ یا ٣ی تەمووزی ١٩٥٥ بوو، مامۆستا گۆران لە ژووری ڕیازەی بەندیخانەی کۆنی بەعقووبەدا هەردوو قۆڵی بە بەرزەوە بەسرابوونەوە. بنووسی ئەم چەند دێڕەش لەگەڵ مامۆستا سەعید ناکام لە بەرابەری ژوورەکەی ئەوەوە لە ژوورێکی تاکەکەسیی زیندانی نوێدا دەرگامان لەسەر داخرابوو، لە پەنجەرەی ژوورەکەوە بۆمان ئەڕوانیی و قسەمان لەگەڵ ئەکرد. ئەو ڕۆژە لەپاش دەمەقاڵەیەکی توندوتیژ لەنێوان مامۆستا و بەڕێوەبەری بەندیخانەدا، بەڕێوەبەر فەرمانی دا شارە زەردەواڵەیەك لە ژوورەکەدا بوو بیورووژێننە گیانی. دیارە ئەویش بە دەستی هەڵواسراوەوە هیچ داکۆکییەکی لە خۆی پێ نەئەکرا، ئەو تراژیدییەکۆمێدیاییە پارچە شیعرێکی بۆ هێنا، لەوێوە بانگی لێ کردین و لەوبەرەوە بۆی خوێندینەوە. بەداخەوە نە شیعرەکەمان پێ لەبەر کرا و نە دەسەڵاتی نووسینەوەیشیمان ئەبوو. پاشان کە یەکمان گرتەوە زانیمان خۆشی لە بیری نەماوە ... بێگومان ئەو شیعرە ئەگەر بمایە یەکێك ئەبوو لە شاکارەکانی ئەدەبی زیندانەکان ...

لەم دواییەشدا دۆستی بەڕێز و ئەدەبپەروەرمان عەلی بەگی حەسەین بەگی جاف پارچە شیعرێکی بۆ ناردین لەو بابەتە سەرپێییانە بووکە مامۆستایانی قوتابخانە لە موناسەباتدا بە ناچاری بۆ قوتابییانیان ڕێك ئەخەن تا بیانڵێنەوە. لەبەر ئەوەی زمانی شیعرەکە زۆر کۆن بوو لە بەریش نووسرابووەوە و ئەگەر ڕاست بێ هی گۆرانیش بێ هیچی لە شیعری ئەو زیاد نەئەکرد، تۆمارکردنیمان بە پێوست نەزانی.

کاك ئاکۆ غەریب مەعرووف ناوێکیش لە ڕێگای کاك کەمال میراودەلییەوە پارچە شیعرێکی بۆ ناردین گوایە لە مەلا ئەحمەد ناوێکی پیری بیستووە لە بەر بۆی خوێندوەتەوە. کاك ئاکۆ لەگەڵ ئەم پارچە شیعرەدا حیکایەتێکی درێژیشی نووسیوە کەگوایە ئەو مەلا ئەحمەدە بۆی گێڕاوەتەوە چۆن گۆرانی دیوە و گۆران چۆن و لە چ موناسەبەتێکدا ئەو پارچە شیعرەی وتووە. هەرچەند پارچە شیعرەکە شەقڵی گۆرانی پێوەیە، بەڵام شەقڵەکە شەقڵی گۆرانی نوێیە. سەرگوزەشتەکەش وەك ئەو مەلا ئەحمەدە بۆ کاك ئاکۆی گێڕاوەتەوە ئەبێ بەر لە ساڵی ١٩٤٠ ڕووی دابێ چونکە مەیدانی سەرگوزەشتەکە هەڵەبجەیە و مامۆستاش لای کەمی لەوکاتەوە هەڵەبجەی نەدیوەتەوە، سەرەڕای ئەوە کە سەرگوزەشتەکە خۆیشی لە دەستهەڵبەست ئەچێ. لەبەر ئەم هۆیانە و هۆی تریش کە لێرەدا مەودای باسکردنیمان نییە، ئێمە لەم پارچە شیعرە بەدگومانین، بۆیە نەمانخستە بڕبڕەی دیوانەکەوە. بەڵام ئەم دوو بڕگەیەی کە لەنگ نەبوون، لێرەدا ئەخەینە بەرچاو:

ئەی دیدە پڕ ئەشک، ئەی دڵ پڕ لە خەم،

گولاڵە سوورەی گوێ ڕووبار و چەم!
تێرتێر نەتمژی لە مەمکی ژیان،
تا دەرکەی چرۆ
ختووکە و خەندەت لێ بوو بە گریان،
کاتی گفتوگۆ ...

* * *

لە دوادواییی ئەم چەند دێڕەدا ئەمەوێ خۆشحاڵیی زۆری خۆم دەربڕم کەوا ئەم کارە گەورەمان بۆ مەیسەر بوو و بەشێکی گەورەی شکۆی بەجێهێنانیشی بە من برا و، ئاواتەخوازم بتوانم هەروا لە بڵاوکردنەوەی بەرگی دووهەمیشیدا کە سەرانسەری وتارە ئەدەبی و پارچە پەخشانەکان و موحازەرەکانی بەشی کوردیی کوللییەی ئاداب وکارە ڕۆژنامەنووسییە جۆربەجۆرەکانی ئەگرێتەوە، بەم جۆرە بەشدار بم.

**محەمەدی مەلا کەریم**

---

١) لە ژمارەکانی ١٢٢٨ - ١٢٣١ی ڕۆژانی ١٠ - ١٩٧٦/٢/١٤ی ڕۆژنامەی «التآخی»دا زنجیرە وتارێکم لەمەڕ کتێبە بەنرخەکەی دوکتۆر حوسەین عەلی شانۆف (کورد ئۆغلی): شعر الشاعر الکردی المعاصر عبدالله گوران، بڵاو کردەوە کە مامۆستا شوکور مستەفا کردوویە بە عەرەبی. لە یەکێ لەو وتارانەدا بە شێوەیەک گومانم لەوە دەربڕیبوو کە عەلی شانۆف بە زمانی مامۆستا گۆرانەوە گێراویەتەوە کە مامۆستا باسی «دەفتەرەکانی بەندیخانە»ی خۆی بۆ کردووە. ئێستا کە ئەم سەرەتایە ئەنووسم وام بە دڵدا دێ کە من بە هەڵە چووم و مەبەستی مامۆستا لەو دەفتەرانە ئەم دەفتەرە شرانەیە کە خۆم لێرەدا باسیان لێ ئەکەم.

٢) بڕوانە ڕۆژنامەی «ژیری نوێ»، ژمارە ٢٧٧، پاشکۆی عێراق، ژمارە ١٢ - ١٣.

٣) لەم بابەتبەندیەماندا کەڵکمان لە بابەتبەندیەکەی کاک جەلال دەباغیش وەرگرتووە کە پێشتر لێی دواین.

٤) بۆ ئاگاداریی پتر لە بارەی ئەم دوو پارچە شیعرەوە سەیری وتاری «لەگەڵ مامۆستا گۆراندا لە یافا»ی ئەحمەد دڵزار بکە لە ژمارە «٢٥»ی ڕۆژنامەی «ژیری نوێ»دا.

٥) ئێستاش هێشتا دەسگیرمان نەبوون.

٦) سەیری ژمارە «٣١٦»ی ڕۆژنامەی «ژیری نوێ» بکە.

٧) سەیری لاپەڕە «٣٥٥»ی ئەم دیوانە بکە.

# بەکورتی سەرگوزەشتەی ژیانی گۆران

• گۆران، یاخود عەبدوڵڵا بەگ کوڕی سلێمان بەگی کوڕی عەبدوڵڵا بەگە. باوکیشی و باپیریشی لە شیعر و ئەدەبدا بەهرەیان بووە و بە کوردی و بە فارسی نووسیویانە و شیعریان وتووە، بەتایبەتی عەبدوڵڵا بەگی باپیری، کە گۆرانی بە ناوەوە ناو نراوە لە زمان و ئەدەبی فارسیدا دەستێکی درێژی بووە و هەر بۆیەش بە (کاتبی فارسی) ناو براوە.

• گۆران لە ۱۹۰۴ یا لە ۱۹۰۵دا لە هەڵەبجە لە دایک بووە. بنەماڵەی باپیری لە بەگزادەی «میران بەگی» بوون لە ناوچەی «مەریوان» و عینایەتوڵلا بەگی کوڕی ئەمانوڵلا بەگیان بە خۆی و خێزانیەوە دێتە سلێمانی و لە ناوچەی قەرەداغ ماوەیەک دائەنیشێ. زۆری پێ ناچێ کۆچی دوایی ئەکا، عەبدوڵڵا بەگی کوڕی ــ باپیری گۆران ــ لەگەڵ هەموو خێزانەکەیاندا کە لە برایەکی بچووکی و دایکی و ژنەکەی و منداڵەکانی خۆی پێکهاتووە ڕوو ئەکەنە هەڵەبجە چونکە خۆیان بە جاف زانیوە و لەوێ جێگیر ئەبن. لەو سەفەرەدا دایکی عەبدوڵڵا بەگ و براکەی بە «سێبەرۆ» ئەمرن و ئەمێننەوە عەبدوڵڵا بەگ و منالەکانی خۆی کە ئەمانە بوون: مستەفا بەگ، نووری بەگ، نەفێ خان، سلێمان بەگ، حەبیبە خان. لەمانە نەفێ خان شوو ئەکا بە مەجید بەگی عوسمان پاشا. حەبیبە خانیش شوو ئەکا بە یەکێ لە شێخانی خانەگای لای پاوە. مستەفا بەگ و نووری بەگیش کەسیان لە پاش بە جێ نامێنێ. بەڵام سلێمان بەگ ئەم منالانەی ئەبێ: عەلی، شەمسە، محەمەد، عەبدوڵڵا. عەلی و شەمسە بە لاوی مردوون. محەمەدیش کە مەشهوور بووە بە «حەمە بەگە ڕووشە» پاش مردنی باوکی بە دوو ساڵ ئەکوژرێ. بەمچەشنە لەم بنەماڵەیە هەر عەبدوڵڵا ــ گۆرانی دوارۆژ ــ ئەمێنێتەوە.

• گۆران لای باوکی قورئان و سەرەتای خوێندنی خوێندووە. پاشانیش لە «مزگەوتی پاشا»ی هەڵەبجە بووە بە فەقێ و تەنانەت ماوەیەکیش بە «فەقێ عەبدوڵڵا» ناسراوە.

• لە دوا ساڵەکانی جەنگی یەکەم و سەرەتای هاتنی ئینگلیزدا، بۆ ماوەیەک هەڵەبجە چۆڵ ئەبێت و خەڵک ڕوو ئەکەنە لادێکانی دەوروپشت.ماڵی باوکی گۆرانیش لە بەهاری ۱۹۱۹ وە تا پاییزی ئەو ساڵە ڕوو ئەکەنە چەمی بیارە و لەوێ لە باخێکدا هەوار ئەخەن و بۆ پاییز ئەوسا ئەگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە.

• گۆران خۆی بۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمیی گێڕاوەتەوە، وتوویە: «لە بیرمە کە یەکەم قوتابخانەی

زەمانی تورک لە هەڵەبجە دانرا، بۆ پۆلی یەکەم وەرگیرام، بۆ پۆلێک وەرگیرام کە مودیرەکەمان، بە رەحمەت بێ، تاهیر ئەفەندیی مەلا ئەمینی جەففار پێی ئەوت پۆلی ئیحتیات». وەک گۆران خۆی گێراویەتەوە دەوامی لە قوتابخانەی «رەسمی»یشدا پچڕ پچڕ بووە. پۆلی چوارەمی لە سەردەمی داگیرکرانی هەڵەبجەدا لەلایەن ئینگلیزەوە تەواو کردووە.

• هەر لە ۱۹۱۹دا سلێمان بەگی باوکی گۆران کۆچی دوایی ئەکات. پاشان لە ۱۹۲۱دا محەمەد بەگی برای، بە هاندانی مستەفا سائیب، لەگەڵ عەبدولواحید نووریی خاڵۆزایدا ئەیانێرێ بۆ قوتابخانەی عیلمییەی کەرکووک بۆ خوێندن، بەڵام هەر لەو ساڵەدا مومحەممەد بەگی برایشی ئەکوژرێ. ئیتر گۆران کەسی وای نامێنێ گوزەرانی خوێندنی خۆی و ژیانی دایکی ببا بە ڕێوە، لەبەرئەوە دەست لە خوێندن هەڵئەگرێ و لە ساڵی ۱۹۲۲ ەوە تا ساڵی ۱۹۲۵ گەڵێ دەستەنگی ئەچێژێ.

• گۆران بۆ یەکەمجار لە ۱۹۲۵دا بە مامۆستایی لە قوتابخانەی هەڵەبجە دامەزراوە و تا ۱۹۳۷ لە قوتابخانەکانی ئەو ناوچەیەدا ماوەتەوە. پاشان گوێزراوەتەوە بۆ ئەشغاڵ ـ بەشی کاروباری ڕێگاوبان و تاگیرانی یەکەمی لە ۱۹۵۱دا، جگە لەو چەند ساڵەی کە لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی تری کوردا ئەچێ بۆ یافا و لە ئێستگەی ڕادیۆی ڕۆژهەڵاتی نزیک بە مەبەستی بەشداری لە خەباتدا لە دژی فاشیزم بەشی کوردستان ئەکەنەوە، لە ئەشغاڵدا ئەمێنێتەوە.

• لە تەشرینی دووهەمی ۱۹۵۲دا لە بەندیخانەی یەکەمی دێتە دەر و ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و ئەبێ بە بەرپرسی ڕۆژنامەی «ژین». تا ئەیلوولی ۱۹۵۴ لەسەر ئەم کارە ئەمێنێتەوە. لە ۱۷/ ۱/۱۹۵۴دا بۆ جاری دووهەم لەگەڵ کۆمەڵێ لە ئاشتیخوازانی سلێمانی ئەگیرێ و حوکمی ساڵێ بەند و ساڵێ خستنە ژێر چاودێریی پۆلیسی بەسەرا ئەدرێ. ماوەی حەپسەکەی لە سلێمانی و کەرکووک و کووت و بەعقووبە و نوگرە سەلمان و ماوەی چاودێرییەکەشی لە بەدرە بەسەر ئەبا.

• لە ۱۲/۹/۱۹۵٦دا ئەم حوکمەی تەواو ئەکا و بەرئەبێ و ئەچێتە بەغدا چەند ڕۆژێک لەوێ لە یەکێ لە پرۆژە حوکوومەتییەکانی بینادا ئەبێ بە چاوەش عەمەلە. زۆری پێناچێ دیسانەوە لە هێرشی میریدا بۆ سەر نیشتمانپەروەران بەبۆنەی دەسدرێژییە سێقۆڵییەکەی سەر میسرەوە، ئەگیرێتەوە و لە ۱۷/۱۱/۱۹۵٦دا دادگای عورفی لە کەرکووک حوکمی یا سێ ساڵ بەندی یا بە بارمتەدانانی هەزار دیناری نەختی ئەداکە تا سێ ساڵ ورتەی‌وای لە دەم دەرنەیەت و کردەوەی‌وای لێ نەوەشێتەوە میری پێی دڵگران بێ... گۆران نە هەزار دینارەکەی ئەبێ‌و نە ئەشیەوێ گفتی‌وا بە میری بدا، بۆیە ئەخرێتەوە بەندیخانە و تا ۱/۸/۱۹۵۸ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی پیرۆزی ۱۴ی تەمووز تیا ئەهێڵرێتەوە. گۆران ئەم ماوەیەی لە بەندیخانەی کەرکووک‌و بەعقووبە بە سەر بردووە.

• پاش بەربوونی لە زیندان ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و پاش ئەوە بە ماوەیەك لەگەڵ وەفدێکی میللی سەر لە یەکێتیی سۆڤیەت و چینی میللی و کۆریای دیموکراتی ئەدا.

• لە سەرەتای ۱۹۵۹دا سەرپەرشتیی گۆڤاری «شەفەق» ئەگرێتە دەست و بە ناوی «بەیان» دەری ئەکا و لە ئیسکانی سلێمانیش دائەمەزرێ و تا ناوەڕاستی ۱۹٦۰ کاری تیا ئەکا. ئەنجا بە بیانووی ئەوەوە کەگوایە بێ پرس کاری بەجێ هێشتووە ــ کار بەجێ هێشتنەکەی بۆ چوون بووە بۆ شەقڵاوە بۆ بەشداربوون لە کۆنگرەی دووهەمی مامۆستایانی کورددا ــ لەسەر کار لای ئەبەن.

• لە ناوەڕاستی ساڵی ۱۹٦۰دا دێتە بەغدا و ئەبێ بە موحازەرەدەر لە بەشی کوردیی کوللییەی ئادابی زانکۆی بەغدا و بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی ئازادی.

• لە سەرەتای ۱۹٦۲دا ژانەسک زۆری بۆ ئەهێنێ. دەرئەکەوێ کەگەدەی تووشی نەخۆشیی «شێرپەنجە» بووە، عەمەلیاتێکی سەرکەوتووی لە بەغدا بۆ ئەکرێ، بەڵام بەداخەوە پاش وادە.

• پاش ئەو عەمەلیاتە لە نیساندا ئەچێ بۆ مۆسکۆ و سێ مانگێك لە نەخۆشخانەی «کرێملین» و سەنەتۆریی «بەرڤیخە» بە سەر ئەبا و پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ عێراق.

• پاش گەڕانەوەی بە ماوەیەکی کەم نەخۆشیەکەی سەر هەڵئەداتەوە و تەنگی پێ هەڵئەچنێ. لەبەر ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و لەوێ لە جێدا ئەکەوێ.

• لە سەعات نۆو نیوی سبەینێی ۱۹٦۲/۱۱/۱۸دا چاوی بە گجاری ئەنێتەوە.

سەرچاوە:

١ . شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، ڕەفیق حیلمی.
٢ . نامەیەکی تایبەتیی کاك ئەژی گۆران بۆ ئامادەکەری ئەم دیوانە.
٣ . ئاگاداریی تایبەتیی خۆم. م.م. ك.

پێشکەشی بەهەشت و یادگار

پێشکەش بۆ:

ئەو شۆخ و نازدارانە کە جوانییان وەک تیغ نابڕێ،

وەک چرا پێش چاو ڕووناک ئەکاتەوە!

# سەرەتا
# بۆ بەهەشت و یادگار

«بەهەشت و یادگار» کۆمەڵە شیعرێکە لە دیوانەکەم سەرانسەر لەگەڵ بابەتەکانی جوانیو دڵداری خەریکە. هەڵبەستی وای تیایە بیستوپێنج ساڵ، بەڵکوو زیاتر، لەمەوپێش دانراوە، هەروەکوو هی چەند مانگێک لەمەوبەریشی تیایە. بەشی زۆری کۆنەکان بە وەزنی عەرووز و کوردیەکی کۆنی تێکەڵاو بە زمانی بێگانە نووسراون. ئوسلووبیشیان کۆنە یان وەک هی «سالم» و «نالی» لەسەر پێوشوێنی غەزەل هەڵبەستراون، یان ئەو جۆرە ئوسلووبەیان تیاکراوە بە سەرمەشق کە مامۆستا «م. نووری» و هاورێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرت و لە سەردەمێکی سنووردارا - ١٩٢٠ - ١٩٣٠ - شیعری کوردیی ناوچەی سلێمانییان پێ تازە کردەوە.

ئەم کۆنانە زۆربەیان، بە ناوی یادگاری کۆنەوە، کراون بە بەشێکی جیاواز، خراونەتە لای دواوەی ئەم نامیلکەیەوە. بەڵام گەلێکیان لە باری سەرنجی نرخی ئەدەبییانەوە ـ دیارە بەپێی بۆچوونی خۆم ـ لەگەڵ تازەکان تێکەڵ کراون.

شیعرە تازەکان بە وەزنی پەنجە ـ هیجا ـ هەڵبەستراون کە هەرچەند شیعردۆستەکانی کۆن بە خوێندنەوەی رانەهاتووڵ، بەڵام لەبەرئەوەی وەزنی تایبەتیی نەتەوەییمانە و لەگەڵ خەسائیسی زمانەکەمان چاتر رێک ئەکەوێ، بە پێویستم زانی لە ماوەی تەقەلای ئەدەبیی خۆما، رۆژبەرۆژ بەرەو لایەنی بەکارهێنانی ئەم وەزنە بچم، تا لەم چەند ساڵەی دواییدا وەزنی عەرووزم بە تەواوی، ـ لاموایە بۆ ئێجگاری ـ بەرەڵلا کرد، مەگەر پێویستێکی هاندەری تایبەتی روو بدا.

هەر وەکوو وتم تا چەند ساڵێک لەمەوبەر بە وەزنی عەرووز شیعرم وتووە، بە وەزنی پەنجەش لە زۆر کۆنەوە، بەڵکوو لەگەڵ وەزنی عەرووز شان بە شانی یەک، دەستم کردووە بە هەڵبەست دانان. ئەمانەش لە دابەشکردنی ناو دیوانیانا، زۆرتر بابەتیان، نەک ئوسلووبو وەزن و زمان، خراوەتە بەر سەرنجی بایەخ. لەبەر ئەوە رێگای هەرە چاک بۆ جوێکردنەوەی تازە و کۆنیان، وردبوونەوە لە زمان ولوغەتی پێنووسینیان راسپێری ئەکەم، هەچ هەڵبەستێک وشە و تەرکیبی عەرەبی و فارسیی زۆر تیا بێ، بە ئەندازەی ئەو زۆرییە، کۆنە، پێچەوانەی ئەوەش دیارە پێچەوانەیە!

دوایی، لە کاتی نووسینەوە و ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیەدا بۆ چاپ، لە شیعرە کۆنەکاندا هەندێ وشە و تەعبیری چەوت تووش هاتم ئەمتوانی بیانگۆرم بە وشەی کوردیی پەتی، یان بە چەشنێکی پەسەندترو دڵگیرتر دەستکاریان بکەم. بەڵام ئەمە، لە باری سەرنجی ئەوکەسانەوە کە بە شوێن لێکۆڵینەوەی تەئریخی ئەدەبی کورد و چۆنیەتیی گەشەکردن و گۆرانی زمانی کوردیدا ئەگەرێن، زیانی زۆرترە لە سوود، با بێزاریی خۆیشم لەولاوە بوەستێ لە تەقەلای شاردنەوەی خەوشو ناتەواویم بەچەشنێکی لە ئەندازە بەدەر، بەڵکوو لە سنووری ئەندازەی تێکۆشینی خەڵقی تریشا.

لەبەرئەوە بریارم دا دەستی دەستکاریان کەم و زۆر بۆ درێژ نەکەم و هەر وەکوو هەن و بوون بیانخەمە پێش چاوی خوێندەوارانی خۆشەویست!

**گۆران ـ هەولێر: ١٩٥٠/٦/٢٥**

# ئافرەت و جوانی!

بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە، لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە،
شەونمی درەخت لە ڕووم پڕاوە، لە زەردەی[1] زۆر کەل سەرنجم داوە،
پەلکەزێرینەی[2] پاش بارانی زۆر، چەماوەتەوە بەرامبەر بە خۆر،
هەتاوی نەورۆز، مانگی جۆدرەو[3] زۆر هاتوون و چوون بە ڕۆژ و بە شەو.
خوڕەی قەڵبەزی[4] کەفزیوینی چەم، لە هەزار چەشنە پرشنگی ناو تەم،
میوەی گەیشتووی زەرد و سووری باخ، جریوە و جووکەی دارستانی شاخ،[5]
لەگەرووی شمشاڵ، لە تەلی کەمان گەلێ هەڵساوە ئاوازەی جوان جوان.
ئەمانە هەموو جوانن، شیرینن، ڕۆشنکەرەوەی شەقامی ژینن!
بە لام تەبیعەت هەرگیزاوهەرگیز، بێ ڕووناکیە بێ بزەی ئازیز؛
بێ ئاوازەیە دەنگە نەرمەکەی با نەیدا لە گوێم، تیر نەڵێم ئۆخەی!
کام ئەستێرەی گەش، کام گوڵی کێوی ئاڵە وەک کوڵمی؟ گۆی مەمکی؟ لێوی؟
کام ڕەشی ئەگا بە ڕەشیی چاوی؟ برژانگی؟ برۆی؟ ئەگریجەی خاوی؟
کام بەرزی جوانە وەک بەرزیی باڵای؟ کام تیشک ئەگاتە تیشکی نیونیگای؟
کام تاسە، کام مەیل، کام چاوەنواڕی تەلیماویە وەک هی دڵداری؟

---

١) زەردە: هەتاوی ئێواران.
٢) پەلکەزێرینە: قەوس و قەزەح.
٣) مەبەست لە مانگی «مارت» و «مایس»ە.
٤) قەڵبەز: شەلال.
٥) مەبەست لە دەنگی باڵداری ناو دارستانە.

# ڕەوتێکی جوان

لەژێر زەردەی خۆرەتاوا، بەناو چیمەنی گوێ ئاوا،
چەن بە ئاهەنگ، چەن سیحراوی ئەگەڕێ قاز، یان مراوی!
یا کەو لەسەر بەفری نزار، بۆ لووتکەی هەزار بە هەزار،
چەن تیسکووک، چەن گورجوگۆڵ ئەکشێ: پشت لە تۆی[1] تەختی دۆڵ!
یا کەروێشکی تیژ و قەڵەو لە بەر تریفەی مانگەشەو
چەن جوان ئەڕوا بە قونەقون سرک‌و گورج‌و سپی‌و خڕپن!
یا پۆڕ لە گوێرێگای دەشتا لەگەڵ سایەقەی پاش وەشتا[2]
چەن ورد و جوان، بە لەنجەولار ئەشێلێ سەوزەگیای بەهار!
یا کۆتری حەوشی مزگەوت چەن خنجیلانەی لێ دێ ڕەوت!
ئەوەندە جوان، لەوە جوانتر لە شنەی بای شەو ڕەوانتر
لە لەرەی پرشنگ، ئاوازە لە خوڕەی ئاو، شیعری تازە
بە ئاهەنگتر، بە خورۆشتر بە گوێچکەی دڵ دەنگی خۆشتر
پێی ناز ئەنێ بەسەر ئەرزا جوانێ لە بەژنێکی بەرزا!

---

١) مەبەست: تۆ لە بنی دۆڵەکەدا بە گوێچەما دەڕۆی، کەوەکانیش بەرەو لووتکە بە باڵا هەڵەگەڕێن پشت لە تۆ، لێت دوور ئەکەونەوە.
٢) وەشت: باران.

# ئاواتی دووری

ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەری پەڕت،
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دڵبەرت؟
کوانێ دوو چاوی مەست؟ کوانێ؟
کوانێ برۆی پەیوەست؟ کوانێ؟
کوانێ زوڵفی ڕەش؟
کوڵمی ئاڵ و گەش؟
کوا هەیکەلی جەمال؟
کوا حوسنی بێ‌میسال؟
ئەی گوێ! زەلیلی چاوم و بەر تۆ پەنا ئەبەم!
دەنگێ لە یاری دوورەوە، چی‌بکەم لە زیل و بەم[1]؟
با بێ، خەندەی پڕ ئاهەنگ بێ!
نەغمەی نازی شۆخ و شەنگ بێ!
زڕەی بازن بێ!
بەرەو لای من بێ!
هاڕەی هەیاسەکەی،
ورشەی کراسەکەی! ...

ئەی حیسی شاممە! لە چاو و لە گوێچکە مەئیووسم،
بۆنێ لە یارەوە دێنێ خیتامی ئەفسووسم؛
با بێ: بۆنی هەناسەی بێ
پڕ بە سینەم وەک تاسەی بێ!
با بێ بۆی مەمەی
لە درزی سوخمەی
بۆنی وەنەوشە، گوڵ
مێخەک، عەتر، سمڵ ...

ئەی لامیسە! ئەگەرچی نەبوو دەنگ و ڕەنگ و بۆ،
وەک شێت بە عەقڵی خامەوە خۆم خستە بەختی تۆ!
کوا تەماسی[2] لەشی نەرمی؟
کوا لەزەتی کۆشی گەرمی!
کوا مەمکی پڕ چنگ؟
لیمۆی باخی سنگ؟
کوا ماچی لێوی ئاڵ
جورعەی[3] ئەبەد، خەیاڵ؟

ئەی خاتیراتی عومری گوزەشتەم، دەخیلی تۆم!
خنکاوی بەحری دووری نەکەی عەشقی ڕەنجەڕۆم؛
جیلوەت لە چاوم ون نەبێ
هەرگیز لای تۆ نوستن نەبێ!
چەشنی ئاوێنە
دائیم بنوێنە:
عەشقی قەدیمی یار
تا وەختی ئیحتیزار[4]!

---

١) زیل و بەم: تیژ و بۆر یا باریک و قەبە (سیفەتن بۆ دەنگ لە مۆسیقادا)
٢) کوا تەماسی: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا نووسراوە «کەواتەماسی». ئاشکرایە هەڵەی چاپە. م.م.ک.
٣) جورعە: قوم، فرێ لە شتی خواردنەوە.          ٤) ئیحتیزار: سەرەمەرگ.

# گوڵی خوێناوی!

(١)

کوڕ:

بڕوانە! شایی‌یە، چۆپییە، لەو ماڵە
گوێ بگرە! زوڕنایە، دەهۆڵە، شمشاڵە!
زەرد و سوور تێکەڵ بوون، ژن و پیاو، هەرایە
لەو ناوە هەر هاڕەی هەیاسەی تۆ نایە!
سا تو خوا خێرا کە با بڕۆین دەست بگرین
بە کامی دڵداری پێکەوە هەڵپەڕین!

کچ:

گوڵ نەبێ بۆ سەرم ئاڵ چەپکێ، زەرد چەپکێ
نایەم بۆ زەماوەن، نایەم بۆ هەڵپەڕکێ!

کوڕ:

کچ لە ڕێی جوانیتا، کچ لە ڕێی جوانیتا
کچ لە ڕێی نیونیگای هاتوچۆی کانیتا
پاییزە، گەڵای دار ڕژاوە، باغ ڕووتە،
گوڵ کوانێ؟ گوڵ لێوی بە بزە پشکووتە!

کچ:

گوڵ نەبێ بۆ سەرم زەرد چەپکێ، ئاڵ چەپکێ
نایەم بۆ زەماوەن، نایەم بۆ هەڵپەڕکێ!
بتدایە دڵ بە من، بە هەموو مەعناوە
دوو چەپکت ئەهانی لە باغچەی پاشاوە! ...

کوڕ [ئەڕوا و لەبەر خۆیەوە بە گۆرانی ئەڵێ]:

باغچەی پاشا لەوبەر ئاوە
خێڵی دوشمن دەورەی داوە

ئەڕۆم: ڕێگام لێ گیراوە
ناڕۆم: چاوکاڵ لێم تۆراوە!

[بەرە بەرە لە دێ دوورکەوتەوە.]

(٢)

کوڕ:
بە باغچەی پاشادا وردگەڕام، خوار و ژوور
زەرد هەبوو، بۆم چنیت؛ چنگ نەکەوت گوڵی سوور
نازانم ئەمجا دێیت بۆ شایی و هەڵپەڕکێ؟

کچ:
نایەم، گوڵ ماوبەتی بۆ سەرم سوور چەپکێ!

کوڕ [یەخەی مراخانیی ترازان]:
ناتەوێ ئەم زامی سەر دڵەم لەباتی؟

کچ:
هەی هاوار! تفەنگی دوشمنیش پێکاتی؟
ڕاکشێ تاوێ سەر بنێرە سەر ڕانم؛
با بگریم بۆ دڵێ بۆ گوڵێ دۆڕانم!

# حوزنی پەچە

ژنێکی شۆخ لە چاوی بەڵەک بە مەئیووسی
خلی ئەکردەوە هۆن هۆن دڵۆپی مرواری؛
بە ئاو ئەبوو دڵی بەردین لە ئاهو ئەفسووسی[1]،
بە ئاوی ساردی پەتی نا، بە مایعی ناری!

وتم: فیدایی جەمالت بم ئەی پەریشێوە!
ئەوا توایەوە هەستیم بە سۆزشی گریەت:
چییە کە هەیکەلی مەرمەڕ، غوباری وا پێوە،
قەمەر شکات‌و سکاڵا ئەکا لە هەوری خەفەت؟

سەری بە عیشوە لەقان‌و بە لەهجەیێکی حەزین
وتی: بچۆوە بپرسە لە جینسی پیاوی برات،
کە کەوتە گۆشەیی گیرفان گوڵێکی ئاوریشمین
چییە تەفاوتی بوون و نەبوونی، قیمەتی لات؟

وەیا هەتا لە دەروونی ڕەشی گلا ئەنوێ،
بە چی لە زیخی دراوسێ فەرق ئەکا گەوهەر؟
ئەوە حسێبە بەگەوهەر، ئەگەر دروستت ئەوێ
کە بۆتە جازیبی ئەنزاری عام بۆ ئەفسەر[2]!

منیش ئەگەرچی بە جیلوە، بە جازیبەی جوانی
گەلێ لەفەوقی گوڵام و گرانترم لە گوهەر،
وەلێ لەبەر ئەوە، هەیهات! ئەسیر و زیندانیم
مەداری فەخر و سروورم بووە بە قوتبی کەدەر!

* * *

بەڵێ! هەتاکوو جەمالی پتر بێ دیلی پەری
دیارە مەیلی زوهووری زیاترە، ئەگری:
ئەکا لە سیقلەتی بەندی ژیانی خۆی نەفرەت!
ئەکا لە پیاو و لە جەهل و تەعەسوبی لەعنەت!

---

١) ئەفسووس: ئەسەف، حەسرەت.     ٢) ئەفسەر (افسر): تاج.

# خۆزگەم بە پار

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نازدار،
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار!
خۆزگەم بە پار!

خۆزگەم بەساڵی ڕابوردوو،
عومری کورتی دڵداریم بوو،
لەپڕ هات و لەناکاو چوو...
یەک: پڕ بە دنیا ئارەزوو،
دەریایەک تاسە ... ئەمە دوو،
جێمابووم لە پاری مردوو!

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نازدار،
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار،
خۆزگەم بە پار!

ڕۆژ نەبوو چاوم بە دیدار
شاد نەبێ، نەسرەوێ ئازار،
ڕۆژ نەبوو یار بە لەنجەولار،
چەشنی ئاسکی هەردەی بەهار،
بە بەردەمما نەکا گوزار،
نەمپێکێ نیونیگای خومار!

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نازدار،
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار،
خۆزگەم بە پار!

هەر ڕۆژە عیشوەیەک، نازێ،
هەر خەڵوەتە چەشنە ڕازێ،
لەو توانج، لە من نیازێ!
بۆ ماچێ، نوقورچێ، گازێ،
هەر بەزمە دەنگێ، ئاوازێ،

بە چاو بینینی دڵخوازێ
بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نازدار،
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار،
خۆزگەم بە پار!

بڵێن بە یار بێ ناوچاوێ
دیمان لە تاو دووری، تاوێ
ئەیڕشت لە فرمێسک لافاوێ
ئاخی هەڵئەکێشا تاوێ
بە یادی باڵا لاولاوێ،
چاوڕەشێ، ئەگریجە خاوێ!

بڵێن بە یار، بڵێن بە یار، یاری نازدار،
سەد هەزار جار خۆزگەم بە پار، منی هەژار،
خۆزگەم بە پار!

پرسی کێ؟ بڵێن داماوێ،
هێلانەی دڵ لێ شێواوێ،
دوانزە مانگ لە یار بڕاوێ،
دوانزە مانگ! بۆ یار گریاوێ،
بەئاستەم نووزە تیا ماوێ،
ئەیوت: ناونیشانی ناوێ،
ئەزانێ یار، خۆی، کام هەژار، ڕۆژی سەد جار،
ئەکا هاوار: خۆزگەم بە پار! خۆزگەم بە پار!

# سکاڵا ...

له سه‌مای به‌رزی ناوبانگی حوسنا
تاقه ستاره!
نه‌بووی له وزه‌ی ده‌ستکورتیی منا،
ئاشکرا و دیاره!
هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه ڕووم لێ وه‌رگێڕای
یه‌کجار ته‌سادوف
دڵه‌ی حه‌ساس نا، به‌ردم پیشان‌دای
به‌ڵام ته‌ئه‌سوف:

وات‌زانی که من موسته‌غنی‌و غه‌ڕڕام
حه‌ریستربووی لێم
تێهه‌ڵچووی به ده‌م، ئیشاره‌ت، په‌یغام
په‌یمانت دا پێم!...

هه‌یهات! مه‌لی دڵ، خوێنگه‌رمی شه‌باب
ته‌فره‌ی ئاسان بوو،
که‌وته شوێن قسه‌ت، فڕی به شیتاب،
وێڵی ئاسمان بوو

که‌چی نه‌یشتهێشت بێ له‌سه‌ر سینه‌ت
بنیشێته‌وه؛
لات‌برد له ڕێگای هه‌وای مه‌حه‌ببه‌ت
دوورت خسته‌وه!

* * *

مه‌لی ناو فه‌زای نامو ته‌ناهیم!
دڵی لاوم ڕۆ!
مانووی ئیتیزار ڕێی وه‌عده‌ی واهیم[1]:
نووری چاوم ڕۆ!

---

١) واهی: عه‌به‌س، بێهووده.

# بۆ جوانی سەرەڕێ

بۆ یەک شەو لای‌دایە ئەم دێیە ڕێی وێڵم،
وەک ساوای یەکشەوە کە دێ پاش نەمانی
ئەم دێیە جێ‌دێڵم: بێ نیشان، بێ شوێنپێ،
ئەو نیگا نیوکەچەی ئەو چاوە مەستانە!
پەنجەی ناز بەر بدە لە چمکی مشکیی شەرم،
سڵ مەکە لە مەیلی بەگەرمی ڕوانینم،
سەرنجێک من ئەیدەم لەو بەژن و باڵایە،
ئەمەوێ کە دەرچووم لەم دێیە بەیانی،
چونکی ئاخ! ئەگەرچی ئێوە من ئەمرێنن،بەڵام
تۆیش لەگەڵ هەر جوانێک ئەبینم تائەمرم،

بەیانی، ڕۆژ هەڵهات، سوار ئەبم جێی‌دێڵم
چۆڵ ئەبێ بە یەکجار لە ناو و نیشانی،
ئەی پەری! سڵ مەکە، لا مەدە بۆ لاڕێ!
شۆڕ مەکە بۆ بەرپێ، بەرز و گەش بڕوانە!
دەرکەوێ لێوی ئاڵ، زوڵفی خاو، کوڵمی نەرم،
پیاوێکم جوانییە قیبلەگای ئایینم؛
- لە سینەی پاکەوە بۆ جوانی تەنیایە،
خاتیرەم هەڵگرێ جوانترین نیشانی!
تۆ،خۆت و «دێ»ت لای من هەر ئەمێنن؛
ئەبیتە مرواری بۆ ملوێنکەی شیعرم!

# بەستەی دڵدار

لەژێر ئاسمانی شینا،
لەپاڵ لووتکەی بەفرینا،
کوردستان گەڕام،
دۆڵاودۆڵ پێوام؛

* * *

نە لە شار و نە لە دێ:
نەمدی کەس
وەک تۆ جوان بێ!
تۆیت و بەس
کچەکوردێک دڵ پێی شاد
وەک فریشتە و پەریزاد بێ!

* * *

نە باریکی، نە گۆشتن،
نە کچۆڵەی، نە شاژن،
نە زۆر چاوڕەشی
نە ئیجگار گەشی
بەڵام بە نیگای شیرین:
نەمدی کەس
وەک تۆ بە تین
تۆیت و بەس!
لێت بێ بزەی مانگەشەوی!
بەژنڕێک و ڕەوتیکەوی.

* * *

لەو ڕۆژەوە تۆم دیوە
عەشقێک لە دڵ چەسپیوە!
ساتێ دوور بی لێم،

گڕ بەرئەبێ تێم!
کە دەست لە یەخەت گیر نابێ!
لە لای کەس
دڵ ژیر نابێ؛
تۆیت و بەس
پەنای هیوا و خەوبینینم،
ئاواتی گیانی شیرینم!

* * *

ئەوساکە تۆم نەدیبوو،
ژینم تاڵیو ترشی بوو؛
بێ شادی و ئارام،
بێ‌هیوا و ناکام،
ئەژیام: ژینی سەرسەری؛
نەمبوو کەس
بۆ ڕابەری؛
تۆیت و بەس
ڕێگای هیوا نیشاندەرم،
سەختیی ژیان ئاسانکەرم!

* * *

ئەی گەورە کچی «زەووس»[1]!
خوشکە جوانەکەی «ڤینووس»[2]!
تو ئەپەرستم،
بۆیە وا مەستم!
بۆ ئایینم ئەگەڕێ
هەندێ کەس؛
با جاڕ بدرێ:
تۆیت و بەس

* * *

قیبلەی ئایین‌و باوەڕم،
خوای بەهەشتی دڵی تەڕم!
وەك سەرەڕۆی شوێن ئامانج،
نە زازا ما نە کرمانج،
گەڕام کوردستان،
گەرمیان و کوێستان:
نە لە شار و نە لە دێ،
نەمدی کەس
وەك تۆ جوان بێ؛
تۆیت و بەس
کچە کوردێك وەك گوڵ وا بێ،
کوردستانی پێ ئاوا بێ!

---

١) زەووس: باوەگەورەی خوایەکان ــ بتەکان ــ ی یۆنانی کۆن.        ٢) ڤینوس: ئافرۆدیت (خواژنی جوانی)، ئەستێرەی زوهرە.

# جوانی لە لادێ

ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە،
ڕێی‌کانی قوبان[1]! مونتەزیری جیلوەیی نازە؛
بەردەرگەکەتان قیبلەیی ڕووی ئەهلی نیازە،
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

سەر جادە موعەتتەر کە بە بۆی خونچە و مێخەک،
بەو لەنجەیەوە بەستە بڵێت ورشەیی خامەک،
هاڕەی کەمەرە و پڵپڵە وگوارە و کرمەک ...
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

چەن جوانی بەرەو مەغریب ئەچی زەردە ئەدا لێت،
پرشنگی خشڵ ئەبلەق ئەکا دەوروبەری ڕێت،
ڕۆژی دەمی کەل حازرە بۆ پێشکەشی بەرپێت،
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

ئێوارەیە وا، دەرکەوە سا جوانە کچی دێ،
ئەی ویردی قسە و بەستەیی گشت کوڕگەلی سەر ڕێ!
سووتاوی جوانیتن هەموو کێیی کوڕی کێ!
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

وەک سوێسکە برۆ، ئاسکەنیگای چاوی ڕەش و مەست
پڕعیشوە بچەرخێنە، ئیتر هیچ مەبە دەربەست:
چەن ماڵ ئەڕمێ[2]! چەن شل ئەبێ هێزی دڵ و دەست!
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

وەختێ کە ئەکەی چەشنی نەسیم لەنجە بەرەو ماڵ،
ئەگریجەیی تەڕ پەخشە لەسەر کوڵمو خەت و خاڵ،
شەڕیانە شەماڵ، پەنجە لەسەر ڕەنگی ڕەش و ئاڵ!
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە
ڕێی کانی قوبان! مونتەزیری جیلوەیی نازە،
بەردەرگەکەتان قیبلەیی ڕووی ئەهلی نیازە!
ئێوارەیە وا، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە!

---

١) قوبان: سووککراوی قوربان.
٢) چەن ماڵ ئەڕمێ: چەن ماڵ ئەڕووخێ.

# لە دەرزی پچەوە

جادە چۆڵ و سێبەر بوو، کات بەیانی،
بۆ سەوزایی دەورو پشتم، بۆ ئاسمان،
ئەڕۆیشتم بە ئەسپایی، کش و مات،
لەپڕ، نازانم چۆن سەرم هەڵبڕی،
لەگەڵ ئەوەی لە عاباوە ئاڵابوو،
باڵابەرز و بچکۆلەپێ و ئیسکارپین[1]؛
ئەڕۆییم و دزەی نیگام جارجارێک،
بە ڕەوتی کەو، لەنجەی تاوس و قومری
مابووی بگاتە عاستم چەن هەنگاوێ،
دەست و پەنجە و مەچەکێک و نیگایەک
قۆڵ و مەچەک ساف و سپی وەک شووشە،
بێینە سەر چاو: چاوێک، بڵێم چ چاوێک؟
کەوا کەوتە بەر شەپۆلی هەستی من،

ئەڕۆیشتم خەیاڵاوی ئەمڕوانی:
بۆ شاخی بەرز، خانووی تازە، دنیای جوان
لاشە ست و دڵ کەیلی تاسە و ئاوات!
بەرامبەرم بەژنێک دەرکەوت وەک پەری!
لە دیمەنی شیرینی ئاشکرا بوو،
گۆرەوی و پووز: سفت و سپی و ئاوریشمین!
لە ژێر عابای ڕەشا ئەیدی نازدارێک:
گورج گورج، جوان جوان ئەهات و جادەی ئەبڕی
درزێ کەوتە پەچە و دیم نیگای چاوێ،
چی بنووسم؟ خوایە هێزی ئینشایەک!
سەرپەنجەکان یاقووتێک بوون بە ورشە،
کانیی سیحر، دەریای عیشوە، گێژداوێک،
لەو ڕۆژەوە هەر نوقم ئەبێ بەرەو بن!

---

١) ئیسکارپین: قوندەرەی پاژنە عانەیی یە.

# بۆ خانمێک

قاسید وتی پێم:بگرە سەبر، خانم ئەوا دێت؛ سا فەرموو، سەبر بێ بە فیدای خاکی بەری پێت!
حەسرەتکەشی ئەو شان و مل وگەردنەڕووتەم، وەختە بمرم بۆ نەفەسی بۆنی توالێت!
ئاهم بووەتە هەوری بەری تینی هەتاو بۆت، فرمێسکم ئەدا نم، لە هەموو ساحەیی سەر ڕێت!
هەر دیاری کە دا حاشیەیی حوسنی ملووکیت: بۆ ڕەسمی سەلام نەبزی دڵە زەربی ترامپێت!
گەر بێت و بفەرمووی، مەلیکەم! مەیلی نشیمەن[1]، بەو خوایە لەسەر دیدە ئەکەم تەسویەیی جێت!
ئەمجا بە پەڕوباڵی تەڕ و فێنکی بۆسە، تێرتێر ئەسڕم، خانمەکەم، گەردی سەفەر لێت
نازانم ئەبێ چۆن بگەمە باسی ویسالت تۆ خوازنی جوانییت و ئەکەم فەرتی حەیا لێت؟

---

١) نشیمەن: جێگای دانیشتن.

# هەڵبەستی ڕەنجاو

کەی تۆم دیوە؟ کەی ئەتناسم؟ کەی؟ کەی؟ کەی؟ دڵداری چی؟ پەیمانی چی؟ حەی! حەی! حەی!
وەک سیحرباز هاتووی بەندی دەلەسە ئەخەیتە پێم، دیلم ئەکەی، نا بەسە!
بەس تەفرەم بە، بەس بە ئەفسوون[1] گێلم کە، بەس کوێرم کە، ئەمجا دوشمنشێلم کە!
گوێم پڕ بووە لە ئەفسانە[2]ی دڵداری، بەلەعنەت بێ زوهرەی جوانیو عەیاری!
عومری جوانیم لە هێلانەی بێڕەنجا، چەن بێتاسە، چەن ئاسوودە ئەگونجا؟
تا ناسیمت، تا خۆت هاویشتە سەر ڕێم، تا دێوجامە[3]ت ڕاگرت نیشانت دا پێم؟
هاوار! تومەز لەودیو پەردەی گوڵگوڵین، لەکارا بوو! بیری بەد، دەستی خوێنین!
بە لەعنەت بێ زوهرەی جوانی سروشتی[4]، دائەفلیقێ هەر دڵێ کەوتە مشتی!

---

١) ئەفسوون: سیحر. ٥ ٢) ئەفسانە: ئوستوورە، خەرافات. ٣) دێوجامە: پەردەیەکی ڕەنگاوڕەنگە لە ڕاودا بەکاردەهێنرێت. ٤) زوهرە: ڤینووس، ئەستێرەیەکی گەش (گەلاوێژ؟). سروشت: تەبیعەت یان خیلقەت.

# هەڵبەستی پەشیمان

کفرە لای من لە یار ڕەنجان  پێی لێ ئەنێم ئەی زوهرەی جوان!
هەرزەگۆییم[1]کرد هەرچیم وت،  وا ئەو چڵکەم بە فرمێسک شت،
بە فرمێسکی پەشیمانی،  ئەی زوهرەی ناز، زوهرەی جوانی!
من ژیانم، گیانم، هەستیم،  هیوام، تاسەم، شادیم، مەستیم،
بیرم، هۆشم، هەرچیم هەیە  بەهرەی جیلوەی ئەو زوهرەیە
کەڕووی لێ نیشت گەردی شیعرم،  هەی جوانەمەرگ خۆم! هەی بمرم!
ئەی ڕووناکیی ڕێی باوەڕم!  خوای بەهەشتی دڵی تەڕم!
قیبلەی عەشقم! هۆی ئاوازەم!  هێلانەی هەڵبەستی تازەم!
چۆن ئەتوانم بڕەنجم لێت،  هەی خاک بەسەر ئینسانی شێت؟
تۆ بی زەردەخەنەی چاوت  لێوی بەعاستەم تۆراوت،
تۆ بی سپیەتیی شان و مل  لە عاستی ڕووتی و یەخەی جل،
تۆ بی بەستەی ڕۆیشتنت،  لەوحەی ڕەسمی دانیشتنت،
تۆ بی بەبیترین نەغمە:  شڵپەی ماچی ئەو ناو دەمە!
تۆ بی هەموو جیلوە[2]ی جوانیت:  لێم خۆش بە، دڵم ڕەنجانیت!
ئەی زوهرەی ناز! زوهرەی جوانی!  گەردنکەچی چاوەڕوانی
وەستاوم، سا دڵم خۆش کە،  شیعری پێشووم فەرامۆش کە[3]!

---

١) هەرزەگۆیی: ناماقووڵ وتن، ناماقووڵی کردن.

٢) جیلوە: لە «جلی»وە، دەرکەوتن، درەوشانەوە.

٣) فەرامۆشکردن: لەبیربردنەوە.

# بۆ گەورە کچێک

ئەی گەورە کچی دڵبەرو شۆخ! وەختی مناڵیت
دابووم دڵێکی پوختە بە ئەو ڕۆحە عەفیفەت،
تۆزێ ون ئەبووی کرپەی ئەبەست عامیلی ئولفەت
گەردی لە دڵم ئەسڕی پەل و پەنجەیی بازیت!

گا ئەموشی ئەو ڕوومەتە نەرمە بە بەری دەست،
گا شانە و گوڵباخم ئەدا لەو قژە زەردەت،
گا ماچم ئەکرد لێوی قوت و چاو و برۆی مەست،
چەن ساتێ وەها ئولفەتی تۆم بووبوو بە عادەت،

تا کوو لەپڕا کەوتمە ناو دۆزەخی[1] غوربەت،
کەم کەم سپی بوو یادت[2] لەسەر لەوحی خەیاڵم
ئێستا کە لەپاش بووردنی شەش ساڵە بە عەودەت،
دڵشادم و تۆ دەمدەم ئەکەی پرسشی حاڵم!

بۆ ڕاستی نەڵێم گەورە کچی عیشوە سەراپا،
ئەوسا نییە تا ناخی[3] نیگای دیدە بەری بێ
ئەوسا نییە تا ناوی قسەش دیوی دەری بێ،
ئەوسا نییە، ئەوسا نییە، ئەوسا نییە بەخوا!

---

۱) دۆزەخ: جەهەنم. ۲) ئەم وتەیەی کەلیمەی «یادت»، لەسەر شێوەی سلێمانی تەلەفوزی پێ ناکرێ.
۳) ناخ: قەعر، بن.

# نیاز[1]...

سەردەمێک بوو دنیای گیانم تاریک و چۆڵ بوو؛
کام «بەرۆچکە[2]»ی گەرمە دڵم، چەشنی سەهۆڵ بوو؛
قەریحەم وشک، تەبیعەتم زەرد و ژاکاو بوو
زەردەخەنەم ئاخی سەرلێو، فرمێسکی چاو بوو!
بە ئاسمانی هیوامەوە ئەستێرەکانم
بە هەزاران شا ئەستێرەی گەش گەشی جوانم،
هەموو نوقمی دەریای تەمی ڕەش و تاریک بوون،
وەک وەنەشەی چنراو لەگەڵ سیسبوون خەریک بوون،
سەردەمێک بوو بێ‌نەغمە بوو باغچەی ژیانم،
بێ‌ورتە بوو ناو هێلانەی بولبولەکانم،
لەرەی دەنگی شادمانی و نەشئەم خنکابوو؛
شەپۆلی بای بەهرە و جۆشم مەنگ ڕاوەستابوو.
تەلی عوود و کەمانم پس[3]، کونی شمشاڵم
بەسرابوو وەک گرێی دڵ و زمانی لاڵم!
سەردەمێک بوو: نە تریفەی مانگی هاوینم،
نە گزنگی هەتاوی سەر لووتکەی بەفرینم،
نە لەرزینی چینی سەر ڕووی گۆماوی شینم،
نە بریقەی دووری چەمی پاش زۆر بارینم،
نە ورشەی گیای مێرگی سەوزی دەمەو بەهارم،
نە شنەی بای دارستانی چڕی نزارم
چەشنی جاران دایەخورپان ناخی دەروونم،
ئەیهێنایە سەر هەڵقوڵین سەرچاوەی ڕوونم!
سەردەمێک بوو، سەردەمێکی دووردرێژ بوو،
نوێنی ئارام بۆ من لەسەر چەرپایەی لێژ بوو،
نە خەوم خەو، نە خەیاڵم وەک خەیاڵ وا بوو،
هەستیم وێنەی ئوقیانووسی ژێر ڕەشەبا بوو،
لەشم بێهێز، گیانم بێزار، دڵم غەمگین بوو،
هیوام تاریک، مەیتی عەشقم تابووتی ژین بوو!
ناهومێد بووم، وام ئەزانی دەردێکە کاری،
بەرەو پیری چوون هێناویە دیاریی ئێجگاری!

ئیتر ئەبێ کونجێ بگرم، دۆش دابمێنم،
لەسەر مەرگی عومری جوانیم یاسین بخوێنم!
چاوە نوارِ بم ساکەی گەردوون، گەردوونی بێباک،
جانەوەری گۆڕ هانئەدا بمکاتە خۆراک؟!
بەڵام ئەی یار، یاری نازدار، شۆڕەژنی شۆخ!
بە لێوی ئاڵ، بە چاوی ڕەش، چاوی ڕەشی تۆخ
بە باڵای بەرز، بە ئەندامی نەرم و شلو جوان،
ڕەوتی شیرین، عیشوە و نازی گفتوگۆ و جووڵان،
بەم جوانیانە کە زینەتی بەهەشتی دنیان،
بەم جوانیانە کە لە تۆدا هەموویان پەیدان،
لەو ڕۆژەوە دیومە سیحری زەردەخەنەی تۆ،
دنیای دەروون مەلەکانی هاتوونەوە۴ گۆ
سەرچاوەکەی عومری جوانیم هاتۆتەوە قوڵ،
باغچەی ژینم پڕ بۆتەوە لە نەمامی گوڵ! ...
ئێستا ئەگەر بێت هیچ نەبێ لوتفی تۆ جار جار،
بملاوێنێ ئەی ژنی شۆخ، ئافرەتی نازدار!
قەسەم بە تۆ! قەسەم بە ناز! قسەم بە جوانی!
هەموو هەستیم ئەچێتەوە دۆخی جارانی! ...
قوڵپی گەشی خوێنی جوانی دێتەوە لەشم،
دیسان شەبەق ئەدا ئاسۆی ئاسمانی ڕەشم ...
ئیتر ڕابوورد من پیر ببم، یان دڵم بمرێ،
یا بلووری شادمانیم هەرگیز گەرد بگرێ!
ئەمجا ئەی یار، ئەی خواژنی عەشقم، ئەی ڤینوس،
ئەی هەیکەلی بەدەن لە عاج، توالێت ئابنوس،
هیچ نەبێ تۆ، بۆ خاتری جاهی ئەپۆلۆ۵،
مەلی شیعرم مەیدان مەدە بکەوێ لە گۆ!

---

١) نیاز: رجا. ٢) بەرۆچکە: بەر رۆژ. ٣) پس: لە پسانەوە، [بەمەعنا] پچران و خاوبوونەوە هاتووە.
٤) هاتوو نەوە: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا نووسراوە «هاتوتەوە». ئێمە لامان وابوو ئەوە هەڵەی چاپەو ڕاستەکەی «هاتوونەوە»یە. م.م.ک. ٥) ئەپۆلۆ: خوای شیعرو حیکمەتی یۆنانی کۆن.

# جوانی بێناو

قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ،
ئەی کچە مەنگە کەی بە دەنگی چپە دوو،
ئەی ئەندام وردیلەی نەرمۆڵەیێیسکسووک،
ڕاستە من ڕێبوارم، سەرپێی ئەڕوانم،
ئەڵێی نەک هەر ئێستا، عومرێکی درێژە
ئەی کچە کاڵەکە! جوانی‌تر با زۆر بن،
با ڕەنگیان پەرداخت بێ و جێگەیان سەرچڵ بێ،
گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە،
لە هەموو ئاسمانا ئەستێرەی بەربەیان!
لە تەختێک هەڵدەستێ هەزار و یەک نەغمە:
کانیەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو:
جوانترە لە لای من لە دەریای بێ‌سنوور
قژ کاڵی لێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ،
دەربەست نیم ڕێبوارم، دەربەست نیم ڕەوتەنیم،
هی ئەوەی نیگارێک[1] لە یادم کێشراوە،

ئەی کچە جوانە کەی سەرگۆنا نەختێک ئاڵ!
گەندەمووی دەموچاومەچەک هەڵنە گرتوو
ئەی بەرگی ساکارت دڵگیرتر لە هی بووک!
بەڵام وا جوانیی تۆ کاری کرد لە گیانم،
بەو دەستو پەنجانەت برینم سارێژە!
لە باغچەی بەهارا گوڵباخی بەر خۆر بن،
بە واتەی خەڵکی‌تر با ناویان شاگوڵ بێ،
کە لە ژێر سێبەری تووترکا خامۆشە!
ئەخاتە دڵی من هەستێکی سپی و جوان!
ئەوەیان شیرینتر دێتە گوێم زۆر نزمە!
لە بنیا بلەرزێ مرواریی زیخ و چەو،
شەپۆلی باتە بەر تیژگی ڕۆژ شڵپ و هووڕ!
ئەی کچە جوانە کەی سەرگۆنا نەختێک ئاڵ!
ئەزانی شپرزە و دەربەستی ئێجگار چیم؟
شۆخێکی نایابە، بەڵام ئاخ، بێناوە.

---

١) نیگار: ڕەسم، سوورەت.

# بۆ کچێکی بێگانە

زۆر قژی زەرد سەرنجی ڕاکێشاوم،
شان و مل و گەردنی ڕووتی بێگەرد،
بەژن و بالآی کەڵەگەت و شۆخ‌و شەنگ،
پێستی سپی بە خوێنی گەش مەیلەو ئاڵ،
دەم و لێوی وەک گوڵی بەربەیانی،
وەک لەنجەولار، زەردەخەنە، نەغمەی دەنگ،
هەمووم دیون، کاریان کردۆتە هەستیم،
هەموو: یەک یەک، یاخۆ دەستە بە دەستە
ئەمانەم گشت لا جوان بووە و لا جوانە،
بۆی نەشکانووم توینیەتی و ئارەزووی دڵ،
لە هەچ باخێک گوڵێکی سوورم دیبێ،
هەر ئەوەندەش گیرۆدەی گوڵی سوور بووم:
ئەمجا ئیتر کەوتوومەتە بەیایی
جوانەی‌تریش هەر وەکوو ئەم جوانانە،
هەر سەرگەردان، هەر ئاوارە، هەر برسی
چونکە کاتێ دێنێتە دی خۆزگەی دڵ،
لەش با هەردەی بەهار بێ ئارایشتی،
بۆ کلۆڵیم، ڕەنجەڕۆییم، بەدبەختیم،
بە ڕواڵەت چەن پرشنگدار و شیک بوو،
کۆشی گەرم و دەروونی سارد و سڕ بوو،
لەبەر ئەوە، ئەی قژزەردی بێگانە،
بەڵام ئەوەی لێی وورووژاندم هەستم،
گران هەتا دوا هەناسەی ژیانم،
دیوانەکەی «برۆنس» کە نەغمەی شیعری،

زۆر چاوی شین داویە پرشنگ لە چاوم،
سنگی نەرم و مەمکی قوتی توند وەک بەرد،
لەشولاری کەمێک گۆشتن، کەمەر تەنگ،
کولمی قەڵەو، چەناگەی ناوەڕاست چاڵ،
ئەمانە گشت، گەلێکی‌تریش جوانی،
شەرمی تاوتاو، نازکردنی ڕەنگاوڕەنگ
سەردەمێکی عومرم بوونە هۆی مەستیم.
ناخی گیانیان بۆ پڕ کردووم لە بەستە!
بەڵام هەرگیز تەنیا جوانیی ئەمانە
هەر گەڕاوە مەلی برسیم چڵاوچڵ
بۆی چووم هەزار دڕک لە پێم چەقیبێ!
ناشارەزا و پەپوولەی دوور بە دوور بووم!
بۆ جوانێکی‌تری پێش ئاشنایی
نەیتوانیوە دامرکێنێ ئەم گیانە،
«بۆچی؟» باشە پێت بڵێم با، ئەپرسی:
جوانیی گیانیش هاوکاری بێ، جوانیی گڵ،
ئاسمانێکی ئەوێ فەڕ با بە گشتی!
تا ئێستاکە هەر نازداری من ناسیم،
پێچەوانەی ئەوە، دڵی تاریک بوو؟
زمانی نەرم، نیهادی ئێجگار دڕ بوو!
جیلوەی جوانیت لە بیرم چێ ئاسانە،
ئەو کتێبی شیعرەیە داتە دەستم!
لە بیرم چێ ئەو جوانەی دای نیشانم:
ئەڵێی کچە پێنە کەنێ، یان ئەگری!

# ئاهەنگێک لەناو ڕان

ڕێبوار [بە لای ڕانا تێەپەڕێ نزیک بە مێرگی بەهار] :

هەنگەزەردە ئەبڕێ ڕێی دوور
بۆ بینینی گولاڵەی سوور،
تا نەگەڕێ مێرگی بەهار
دەم نانێتە ناو دەمی یار!

شوان:

بەڵام منی شای گشت هەنگی هەردەی بەهاران،
بۆ بینینم خۆیان ئەگرن ڕێی دەشت نازداران!
سۆزی شمشاڵ ئەخەمە کار دەمی تێواران:
پۆل پۆل ئافرەت، شیردۆشی جوان، ئەکشێ بۆ ناو ڕان!

ڕێبوار:

هەنگەزەردە ئەبڕێ ڕێی دوور
بۆ بینینی گولاڵەی سوور؛
چۆن بە پێی خۆی دێ گوڵی گەش
بۆ لای شوانی کەپەنک ڕەش؟!
نەک گوڵێک و نەک سیان و چوار،
چەن لە دێدا هەبێ نازدار؟!

شوان:

کە مۆڵم دا مێگەلی تێر لەسەر سەوزە گیا:
زەردەی هەتاو ئەگرێتە زێڕ ڕووی دەشت و چیا؛
هەر نازدارە، بۆ هەڵپەڕکێ جۆشێ لە سەریا،
لە شمشاڵم ئەنێ بە ناز ڕووی نیازی جیا!

ڕێبوار:

هەنگەزەردە ئەبڕێ ڕێی دوور
بۆ بینینی گوڵاڵەی سوور،
لەناو دێوە پۆل پۆل نازدار
ئەشێلن سەوزە گیای بەهار
بۆ لای شوانی شمشاڵ پڕ جۆش ...
هەی بەختی باش! ژیانی خۆش!

شوان:

حەڵقەی چۆپی لەسەر فەرشی گیای قەراغی ئاو،
لە بەردەمما هەڵئەپەڕێ گا گورج و گا خاو،
* منیش چەشنی پەپوولەیەك گوڵ دایبێتە ناو
کێ زۆر شۆخ بێ لە بەرپێیا ئەوەستم تاو تاو!

ڕێبوار:

هەنگەزەردە ئەبڕێ ڕێی دوور
بۆ بینینی گوڵاڵەی سوور،
هەر لە دێوە هەتا ناو ڕان
بە لەنجە دێن شیردۆشی جوان،
هەڵئەپەڕن بۆ شمشاڵژەن
هەی بەختی باش! ژیانی شەن!

کۆمەڵێ ئافرەت [نەختێك لە دوورەوە]:

هۆ شوانی بەهرەدار! تێخوڕە، چاوەڕێین،
ئارایشت تەواوە، ئامادەی هەڵپەڕکێین!
پەرۆشی ئاوازەی بەسۆزی شمشاڵین،
بێ سیحری فووی دەمت، بەزم و نۆش بەتاڵین،
تێخوڕە، ئامادەین پاداشتی ئاوازە
تێرت کەین لە قووتی دڵ کە جوانی و نازە!

هۆ شوانی بەختیار! تێخوڕە، درەنگە،
بێ شمشاڵ لە دەشتیش وەکوو ماڵ دڵ تەنگە!

تێخوڕە، تێخوڕە،
مێ[1] تیر و گوان پڕە،
کاتی ڕان مۆڵدانە،
تا بڵێی دەشت جوانە!
لێو بەرە بۆ شمشاڵ،
بە سۆز و ناڵەناڵ:
بلەرزێ لەشی کێو!
بجۆشێ دڵی دێو!
نەوەستێ هەڵپەڕکێ:
تا بارەی بەرگەل دێ!

---

١) مێ: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا نووسراوە «من» بەڵام دیارە هەڵەی چاپە. م.م.ک.

# شەوێک لە «عەبدوڵڵا»[1]

«هۆڵ[2]» زۆر گەورە، ئێجگار ڕووناک     هەموو شت جوان، هەموو شت پاک
«جەو» لێی ئەتکێ شادمانی،     بۆنخۆشی، مۆسیقا، جوانی
هەر مێزە و کورسی دەورەی داو،     تێکڕژاون ئافرەت و پیاو
ئافرەت: چرای کۆڕی ئاهەنگ،     لەنجەی جوولان، مۆسیقای دەنگ،
لەسەر هەر مێزە، یەک دوانێ     بۆ چەشنی جوانی نیشانێ!
یەکێ قژزەرد، یەکێ چاوڕەش،     یەکێک لێو وەک گوڵغونچەی گەش.
یەکێک جوانیی وەک هەتاوە،     تین و تیشکی لە پێش چاوە؛
یەکێک مانگی شۆخ و شەنگە     سیحری جوانیە کەی بێدەنگە؛
یەکێک شێوەی دوان خۆشە،     جوان نییە بەڵام جوانپۆشە! ...
هەر ئافرەتە هێندە ژیرە،     پەرداختر کات کوێی دڵگیرە:
پێستپەمەیی لەش نەرم و شل:     نیوەڕووتی تەنکیی جل،
کەمگۆشتی نەختێک کەڵەگەت:     نەختێکە بۆی شان و چاکەت،
قژ ئاوریشمین بە توالێت     عەتر و سیحری لێ ئەتکێت،
چاوڕەش بە کل ئەوەندەی تر     بۆ تەماشاکەر گورچکبڕ؛
شۆخی مەڕمەڕگەردن و سنگ،     لەسەر سنگی ڕووت بۆ پرشنگ
ڕستێک مرواریی دانراوە،     مایەی ڕێشکە و پێشکەی چاوە!

* * *

تاک تاک مێزی وەکوو هیی من     دەوری داوە کوڕی بێژن
ئەمانەش یا بادەنۆشن،     یان بە تەماشا سەرخۆشن!
تاوێک چاو ئەبڕنە جوانێ     دانسێکی نایاب ئەزانێ،
پێ و پل و چەرخەی هاتوچۆ     جوان جووت ئەکا لەگەڵ تانگۆ[3]
تاوێک نەغمەی «ڤاڵس» و خەیاڵ،     لەگەڵ نەشئەی ستاوتی تاڵ،
دەستیان پێ ئەداتە بەر سەر،     بیریان ئەڕوا بۆ دنیای دەر!
تا کەی؟ بەڵکوو تا دوای[4] دانس،     «چەپ...چەپ...»چەپڵەی پاش نەغمەی ڤاڵس!

* * *

سەعات فری، شەو درەنگ بوو. هێشتا نیوەڕۆی ئاهەنگ بوو!
تازە باندی[5] پشت سێپای نۆت: گەرمی هەوای فۆکستڕۆت!
تازە شۆخی هەڵبژاردەم کەوتۆتە سەرنجی دەم دەم،
بە دوو چاوی وەک دەریای شین، پڕ لە زەردەخەنەی شیرین
بەڵام منی بێگانەی کوێر، شەونشینیم لێ نایە زۆر،
ناچار لەگەڵ هاوڕێم هەڵساین، خەو ئەم بەهەشتەی لەکیس داین!

---

١) عەبدوڵلا: جێگایەکی دانس و مۆسیقایە لە بەغدا.
٢) هۆل: قاعە.
٣) تانگۆ: مقامێکی مۆسیقای رۆژاوایی‌یە. ڤاڵس و فۆکستڕۆتیش هەروەها.
٤) دوایی: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گوران خۆیدا بەمجۆرە نووسراوە «دوایی»، بەڵام بە بیری من ئەوە هەڵەی چاپە و راستەکەی «دوای»ە چونکە بەمجۆرە مەعنای بەیتەکە قووڵتر ئەبێ. م.م.ک.
٥) باند: فیرقەی مۆسیقا، نۆت: دەفتەری نۆتەی مۆسیقادا کە لە بەردەمی مۆسیقاژەندا لەسەر سێپایەک دائەنرێ.

# بووکێکی ناکام

هەی سوار سوار بێ! هەی تفەنگچی دەست باتە تفەنگ!
هەی ژنی جوان ئارایشی خۆی کا بۆ ئاهەنگ!
لەژێر تارای سورمەچنا هەرە جوانی دێ،
«کچی جووتیار!» بەرەو کۆشکی ئاغا کەوتە ڕێ
کۆشکی ئاغا گەچکارییە، ئاوێنەبەندە،
کەس نازانێ بە ژمارە، پەنجەرەی چەندە!
حەوز و فوارەی حەوشی مەڕمەڕ، باغچە و چیمەنی
بەسەرناچێ هەرگیز سەوزی و گوڵی دەگمەنی!
جوانی لادێی ڕووتی وەکوو تەڵی وەنەوشە
بە ئاوریشم و بە ئاڵتوونی ئەم کۆشک‌و حەوشە
لە تەوقی سەر تا بەری پێ پەرداخت و پۆشتە،
سوار کراوە، شۆخ و نازدار وەکوو فریشتە
خراوەتە ڕێ بۆ پەردەی ئەتڵەس و گوروون،
بۆ باخەڵی ئاغای پێش چاو بە چلچرا ڕوون!.
ئاغای خاوەن‌هێز و شکۆ، خاوەن‌سامداری،
لەکاتێکا درێژ ئەکا دەستی دڵداری
بۆ گەردنی گوڵی کێویی لە جێ هەڵکەنراو،
نمی فرمێسک بە دی ئەکا لەسەر کلی چاو!
مووچڕکەیەک بە سەرتاپای لەشیا ئەگەڕێ:
ئاگادارە فرمێسکی سۆز، دێتە خوار بۆ کێ!
کچی جووتیار بۆ بەهەشتی ژین و دڵداری،
لەگەڵ کوڕی شوان بەستبووی پەیمانی یاری!
کوڕی شوانی بڕژاوی ئیش، لە بەر هەتاو قاڵ،
مەچەک ئەستوور، لەش کەڵەگەت، دەفەی ناوشان چاڵ.
تیری خوای عەشق هەتا شاپەڕ دڵی سمیبوو.
کچی جووتیار لە بەرچاوی بت بوو، پەری بوو!
ئەم نازدارەش بە شەو و ڕۆژ نەخشی خەیاڵی
کوڕی شوان بوو: باڵای بەرزی، ناوشانی چاڵی!

ئـــیتر ڕێگـــای دارســـتان و نـــاو ڕان و دێـــبەر
بـــوو بـــە شـانۆی ســەرگروشتەی دڵــدار و دڵــبەر:
هـــەر بـــن‌دارە، بـــن‌دەوەنە، هــەر بسـتە خـاکـە
ئـاگـاداری چـەن بـەنڎیک بـوو لەم عەشقە پـاکـە!
هـــەتا ڕۆژێ بـــۆ کـــڵۆڵی ئـــاغای شکـــۆدار،
لەسەر ڕێـێ ڕاو، کـاسەیەک دۆی وەرگـرت لە نـازدار،
گـــڕی لەشـــی دامـــردەوە بـــە دۆی ســەرتەزێن،
بـــەڵام کـووڕەی دڵـی کـەوتە بـەر بـای بـاوەشێن!
دەست و کـاسە و پـەنجەی دۆگـیر، نیگای چـاوی ڕەش،
هـــەستیی ئـاغای فـڕێدایـە نـاو ئـاگـری گـەش!
پـــیاوماقووڵی ڕاسـپێری کـرد تـارەک[1] ســازبکرێ،
زوو ئـەم شـۆخە نـەرمونۆڵەی بـە بـووک بـۆ ببرێ
کوڕی شـوانـەکـە ئـەمەی بیـست شێت بـوو، دایـەکێو،
زەویـی داگـرت بـە تـفکردن، ئـاسمان بـە جـنێو!
چـەن جـارێ شــەو مـاڵی ئـاغای دایـە بـەر تـفەنگ،
دەغـڵی سـووتان، بـاغی بـڕی، بۆ ئـەتک و بۆ پـەنگ:
کـلکو یـاڵی چـەن چارەوێی قـەل کـرد بـە خـەنجەر،
بـــەسەر ڕانـــی ئـــاغایا دا و مـــەڕی دایــە بـەر
تـــاکـــو دوایـی ڕۆژێ بـەختی نـۆکـەری ئـاغا
خـــەوی لێ خست لە ســـێبەری درەخـــتی بـــاغا؛
پـەنجەی کـینە لەســەر پـیلکەی تـفەنگ کـەوتە کـار،
کـۆستی دڵـی بـۆ ئـێجگاری کـەوت کـچی جـووتیار!
ئـــێستا ئـــەوا هـــەرچـی بـڵێی نـیعمەت و نـازە
هـەمووی ئـەدا بـە یـەک دڵـۆپ فـرمێـکی تـازە،
لەبـــەر دەرگـــای چـــاوی ڕەشـا بـلەرزێ و بـڵێ:
دەســتی زۆردار ســەد ســەر ئـەکـا، نـاگـاتە دڵـێ!

---

[1] تارەک: دەبێ کورتکراوەی (تەدارەک) بێت، واتە (ئامادەکاری).

# لە لادێ

کــراس کــەتانی کــەواســەوزی بــەژنوباڵابەرز،
بە شان و گۆزەوە چەن جوانی ئەی پەریی سەر ئەرز!
لە دوورەوە چ نــــمایانە پــــێچو ســــەرپۆشت!
چ زوو ئـەگـاتە دەمـاخم شـەپۆلی بـۆی خـۆشت!
شــەماڵی ڕێگــەیی کــانی ئــەخاتە بــاڵاکــەت،
لەرانـەوەی لەشـی زیـوینی شـۆڕەبیی کـەڵەگـەت!
ئەڕۆی بە عـیشوە، بـە لەنـجە، بـە وەزنـی گـۆرانـی
ئەڕۆی ... زڕەی کەمەرەت دێ هەتاکوو بەرکـانی!
ئـەگـەیتە کـۆمەڵی پـیاوانـی بـەردەمی مـزگەوت،
سڵێک ئەکەی وەکو ئاسک لە سێبەری ئەشکەوت!
لە ڕێگــەتا هــەیە پــۆل پــۆل لە لاوی دێ کـۆمەڵ،
کە هەریەکـە گـوڵی هـێناوە چـەشنێ، پـڕ بـاخەڵ!
هەموو بە عـەزرەتەوەن گـوڵ فـڕێدەنە بـەر پـێت،
خـوایـە ئـاخۆ گـوڵی کـێ بـە دڵـتەوە ئـەلکێت؟...

غەزەلیات:

# ئەڕۆی ئۆغر

کلاّولار، گورجی کەوڕەفتار! نەزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
لە تیری ئاهی ناکامیم حەزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
بە دووتا ئەشکی حەسرەت خوێن ئەبارێنێ بەسەر دەشتا،
تەماشای لالەزاری ڕاگوزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
لە لای خەڵقی گەدایە گەردی ژێر پێی موڵکی دڵداری
بە سایەت وەک هوما تاجم لە سەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
بە لەرزە و زەلزەلەی ئەو پڵپڵانەی دەوری پووشینت،
بینای هەستیم هەموو زێرو زەبەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
ئەوا واعیز ئەڵێ لادە لە قیبلەی عەشق و جوانی ڕوو،
سەماعی وەعزی سەرتاپا زەرەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
فریشتەی یا پەری یا حۆری ئەی شۆخی مەلەکشێوە؟
بە عیشوە و خوو لە هاوجینسی بەشەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
بە تای دووڕی غەزەل ئەچنم لە حەسرەت ڕشتەیی گێسووت[1]،
مەتای عومری درێژکردووم لەبەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
ئەڕۆی ئۆغر؟ ئەڕۆی ئۆغر؟ نەزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
حەیام، عەقڵم، دڵ و دینم هەدەرناکەی‌ئەڕۆی ئۆغر؟

---

١) ئەگەرچی لەچاپەکانی پێشوودا (دووری) نووسراوە، بەڵام ئاشکرایە ئەوانەی دیوانەکەیان ئامادە کردووە لێی ئەگەیشتوون. ڕاستییەکەی ئەوەبە لێرەدا نووسراوە(واتە بە تاڵی دووڕی غەزەل... هتد).

# هەرچەن...

هـەرچـەن بـە بـەر مەلالی فـرەم تـەنگە قـافیيە،
یە کێ عـومری خـەم هـەناسەیە کـی سـاردی کـافيیە!
خۆزگەی خەمم بە قەڵبەزی سەرچـاوە کـەی «زەڵـم»،
چاو وشکـی کـرد و ئـەو وە کـوو خـۆی تـافەتافيیە!
لای من چ جامی نـەشئە چ مـیحرابـی دیـنی عـەشق:
ئـەم چـاو و ئـەو بـرۆی کـچە کـوردێکی جـافيیە!
زنـجیری زوڵـف و چـاهی زەنـەخ وا لە ڕێگـەیا،
کـێ لەو حـیجازی حـوسنە ئـومێدی تـەوافـیە؟
تا دێ سروور و سیححەت‌و سـەبرم زەعـیف ئـەبێ،
هـەر تـەبعی تـا سـەما لە فـی راقـا مـونافیيە!
تـف لەو ژیـانە کـە بـێ دەردیعـەشقە ئـاسوودە،
بـەخ لەو مـلەی کـە زوڵـفی نـیگارێ تـەنافيیە!
«گـۆران»، تـەماعی مـاچ و ویـسالی بـڕیوە لێت،
یـەک ئـیلتیفات و نـیوەنیگایە کێ کـەفافيیە!

# ئەی شەوقی گەلاوێژ!

ئـەی شـەوقی گـەلاوێژی بـەیان نـووری نیگاهت!
ئـەی عـەتری سـەبا بـۆی نـەفەسی زوڵـفی سیاهت!
ئەی حوسنی تـولووع وێـنەیەکـی فـەیزی حوزوورت،
ئەی حوزنی غورووب ڕۆژی ڕەشی دووریـی تـەباهت!
ئەی کۆشک و سەرای بـاغی بـەهەشت مەیلی سەوابت!
ئـەی ئـاگـری دۆزەخ شـەرەری خـەشمی گوناهت!
ئـەی عـیففەتەکـەت داغـی حـەسەد بۆ دڵـی جیبریل،
هـەر بـۆ هـەوەس و عـیشوەیە خـۆ لارەکـولاهت!
چـۆن مـەحکەمەیی عـەشق نـەدا حـەق بـە جـەمالت؟
خـەندەی لەبـی مـەعـوومە ئـیفاداتـی گـەواهت!
وەک بـلبلەکـەی فـەجری ئـەزەڵ ویـردمە ئـەی یـار:
بـۆ ئـەوگـوڵە وا خـەڵقی ئـەکـا حـەمدی ئـیلاهت!
بـێ عـەشقی هـەوای پـاییزە بـۆ قـەلبی فـسردەم،
ئـەی ڕۆژی بـەهار مـەرحـەمەتی[1] تـینی پـەناهت
بـێداریـیەکـەم زوڵـمەتی شـەو بـردی قـەراری،
تـۆ و زوڵـفی پـەشێو، دەربـخە سا چیهرەیی ماهت!
ئـەستێرە هـەموو داغـی سـەمای سـینەتە «گـۆران»،
ئـەی عـەرشی عـەزیم نـاڕەحەتی دووکـەڵی ئـاهت!

---

١) مەرحەمەتی:لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا هەر ئەوەندە نووسرابوو:مرحمة.ئێمە وامان بۆ ڕاستکرایەوە.م.م.ک.

# تاویٚ نه‌گه‌ڕا...

تـاویٚ نـه‌گـه‌ڕا چـه‌رخـی مـوخالیف بـه حیسابم،
بـــیٚناڵه نـــیه ســـانییه‌یه‌ك تـــاری ڕوبـــابم!
هه‌ر له‌حزه‌یه‌کی مه‌هدی هه‌زار گریه بـوو، ئـه‌فسووس،
ســـالاٚنی مـــناڵیم و هـــه‌موو عـــومری شـه‌بابم!
گـه‌ر ڕاسـته مـه‌له‌ك نـامه‌یی ئـه‌عمالم ئـه‌نووسیٚ
بـا سـوور بـیٚ وه‌کـوو خـوێنی جگـه‌ر خـه‌تتی کیتابم!
شـــه‌معێکه له‌ســه‌ر لێـوه‌له‌ره‌ی مـه‌ینه‌تی مـن ڕۆژ،
ئـــه‌ستێره‌یی شـــه‌و شـاهیدمن ســه‌خته عـه‌زابـم!
ئـــێسته خـــه‌له‌لی عـــافیه‌تیش بـــاری بـــه‌ده‌نمه،
هـــه‌ر ده‌رده ئـــه‌دا پـاچی له بـونیانی خـه‌رابـم!
تـوخوا دڵـه‌کـه‌م کـوانیٚ خـوتووراتـی جـوانیت؟
بـۆ ڕه‌ش بـوو هـه‌موو ئـوفقی خـه‌یالاٚت و سـه‌رابـم؟
هـــه‌یهات، چ بـــیٚمیهر و وه‌فـا ده‌رچـوو نـیگارم،
حـاڵی بـه گـه‌رم پـرسش ئه‌کـه‌م، سارده جه‌وابم!
زیـاتر سـه‌به‌بی عـه‌قڵ و شـوعووره خـه‌فه‌تی مـن،
بــۆ غـه‌فڵه‌ت و نـیانه هـه‌موو نـۆشی شـه‌رابـم!
ساقی بـه فـیدای دیـده‌یی مـه‌خموورت ئـه‌کـه‌م دیـن:
لێـوڕێژم ئـه‌ویٚ پـیاڵه‌یی مـه‌ی ئـه‌جری سـه‌وابـم!

٩

# له بەختی تار...

له بەختی تاری شەو ناکەم شیکایەت، شەبیهە چونکە بەو زوڵفی سیایەت!
نییە قابیل بڕینی ڕاهی دووری وەکوو پرچت کشاوە بێنیهایەت!
بە هیچ خاکستەرێ ناگەم نەکا بۆم لە ئەنجامی لەهیبی حوب حیکایەت!
کە تیری نیونیگات چەرخانە ئینسان، قەفەس خاڵی ئەکا مورغی دیرایەت!
لە چاوی بەد، خوا عومری جوانی قوبووڵ کا لێم بە پاداشتی ویقایەت!
خەوی منداڵ و سەهری عاشقی زار، ئەبەخشێ حوزنی نەغمەی لایەلایەت!
هووەیدایە لە ڕەنگی ئاڵی دەستت[1] کە دائیم پیشەتە قەتڵ و جینایەت!
هەتاکەی، بادەنۆشی عەشقی تۆ بم، هەتاکەی، بێ مەزەی ماچی کیفایەت؟
دەخیلت بم هومای زولفەینی دڵبەر، بەسەر سەرما بکێشە فەیزی سایەت!
بە «گۆران» ناکرێ قەت تەرکی سەودا، کلا نابم لەسەر جادەی هیدایەت!

---

١) دەستت: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا نووسراوە «دەشت». دیارە هەڵەیە. م.م.ک.

# کە نیشکە جوانەکە!

کەنیشکە جوانەکە بۆچی فریبیِ‌حوسن و جەمال
هەڵتەداتە سەمایی تەکەببور و عەزەمەت!
«الی الابد» نیە بۆ کەس مەلاحەت و شەوکەت
هەموو بەهارێ مرووری سەریعە بەرق‌میسال!
کەنیشکە جوانەکە: گوڵباغی شۆخ و ڕەونەقدار،
کە ئێستە مەوقیعی باڵایی، سەرتە مەستی غروور،
ئەبینی ئاخری ڕۆژێ سوقووت ئەکا مەقهوور،
لەژێری پێی عەجووزا ئەبێتە تۆز و غوبار!
کەنیشکە جوانەکە: ئێستا ئەگەر بە سیحرو فسوون،
هەزاری وەک من ئەکێشیتە داوی شۆر و جنوون،
بە ئیبتیسامی نەوازش لەبت بکەی تەهزیز،
دڵی هەزاری وەکوو من لە عەشق ئەکەی لەبریز
بەڵام سبەینێ کە پیری وەکوو حولوولی خەزان،
بە ڕەنگی زەردەوە دەستی لەگەردنت ئاڵان؛
ئەکێشی ئاهی تەحەسور لەبەر خەساری دڵان:
دڵانی پڕ لە شەباب و غەرامی جانبازان!

# مەدەنییەت

مەدەنییەت: گوڵی بەهاری حەیات،
مەدەنییەت: هەوایی نەشئونوما،
مەدەنییەت: وەسیلەیی ئیحیا،
بۆ هەموو میللەتو عومومی وڵات!

مەدەنییەت، ئەلەکتریک، قەمەر
ئەی زیابەخشی حاڵی نەوعی بەشەر!

قەومی کوردی هەژاری بێچارە
وێڵی تەیهی جەهالەتە، هاوار!
ماندوو، مردووە غەرقی تۆز و غوبار
تەی ئەکا ئەم موحیتی ئەسرارە!

سەرسەری، بێنەسیبی ڕوئیەت و گوێ،
ژێری پێی دوومەڵ و بەدەن توێ توێ!

مەوقیعی پڕ دڕندەیە، خەتەرە،
ناوپەلی فیلە، کۆشی عیفریتە،
چاوی مەرگی هەمیشە لێ زیتە
ئاخ کە ئەم قەومە چەندە قوڕبەسەرە!

مەدەنییەت، ئەلەکتریک، قەمەر،
ئەی زیابەخشی حاڵی نەوعی بەشەر!
ئەی شوعاعی هەتاوی حەقق و نەجات،
مەدەنییەت! دەخیلە سا پەلەپەل؛
پڕ زیاکە سەمایی تاری ئەمەل؛
با ببینین بەهەشتی ڕاستی حەیات!

# سێبەری هیوا

تەسادوفەن کە جوانیت، جەمالی بێوێنەت
بەرامبەری نەزەرم ناگەهان تەجەسسومی کرد،
لەبەرئەوەی بەشەرێکم زەبوونی دڵ، هەڵبەت،
حەقم بوو پەردەیی شەرمو حەیام دڕی، لامبرد!
بڕیمە نەخشی جەمالت، بەبێ حەزەر لە قسەت،
لە هەردوو چاوەوە نووکی بلێسەیی سەودا؛
لە وردترینی دەمارم وەکوو پزیسک پژا
تەحەسسوساتی دڵێکی پەرۆش بۆ ئافرەت!
بەجۆش وکوڵ، هەیەجان وا موازەنەی تێکدام،
هەموو مەراکیزی حیسسم مەزەننەکەوتە غەڵەت:
کە دیم لە چاوی بەڵەکتا تەلەمموعاتی غەرام
وەکوو بریسکە بریسکی نجوومی شەو دەرکەوت؛
کە نیوە زەردەخەنەی ناز و عیشوەیی گەرمت
بە درزی لەعلەوە گرتی خەتێکی مرواری،
کە هاتە گوێمەوە دەنگت بە نەغمەیی نەرمت،
وتت: چ مفتە تەماشا بە نرخی بێعاری!

# ژن

ژنە کە جیلوەیی حوسنی بە عیشق ئەکا پەرواز،
ژنە کە قووەت ئەخاتە خەیاڵی ڕەقسەنگیز،
ژنە مووەللیدی عیشق و ژنیشە عیشقنەواز،
ژنە کە تاری ڕوبابی حەیات ئەکا تەهزیز!
سەمایی واسیعی دڵ گەر لە ژن بکەی خاڵی
تەجەللیاتی بەدایع غرووب ئەکا، دەیجوور
بەسەر سەمایی تەهیدا گوشاد ئەکا باڵی،
لەکەوکەبی ئەمەلت ون ئەبێ تەبەسسومی نوور!
ژنە کە گەوهەری سەر تاجی ئیحتیرامە، ژنە:
بە نووکی نەشتەری ئەڵماسی تیژی عیشق و غەرام،
خوتووتی قودسیەتی حەککراوی قەلبی منە!
بە سیحری خاریقی ژن پڕ قەریحەمە ئیلهام:
لەکونجی خاتیرەما تا ژنێکی شۆخ نەکا
پەری سیفەت بە پەلوپۆی جەمالەوە جیلوە،
لەکوێ لە سەتحی زەمینا، لە سینەیی فەلەکا،
ئەبێتە مەنبەعی شیعرم بەدایعی ئەشیا؟

پێشکەشە بۆ

ئەو گیانە پیرۆزانەی لەپێناوی هونەری

جوانا فرمێسک و ئارەقی زۆریان ڕشتووە!

«گۆران»

## سەرنجێک

لەبارەی خوێندنەوەی ئەم کۆمەڵە شیعرەوە، هەرچی پێویست بێ پێشەکی بوترێ، هەر ئەوانەن کە لە سەرەتای بەرگی «بەهەشت‌و یادگار»دا نووسراون. لەبەرئەوە لەم بەرگەدا چاومان پۆشی لە پێشکەش کردنی سەرەتا.

# هاوڕێم بێکەس!

ئەی فریشتەی شیعری جوان!    کۆستی کەوتووی هەردووکمان،
بۆ ئەمجارە بێکەسە    کە وتمان بێکەس، بەسە!
شاعیرێک بوو، فەننان بوو،    ئەدای خوڕ، خرۆشان بوو،
بۆ باغچەی کزی کوردی    بولبول بوو نەغمەی وردی:
سەرەڕای بەهرەی فەننی    دڵسۆز بوو بۆ وەتەنی،
نرکەی شیعری ڕزگاری،    بێکەس، شتێکە دیاری:
لە هەموو کوردستانا،    لە ناو بیرئازادانا!

* * *

پەری شیعری شۆخ و شەنگ!    تۆ دڵتەنگ و من دڵتەنگ.
با سکالا بۆ یەکتر    لەگەڵ ئاخی سارد و سڕ
دوورودرێژ هەڵڕێژین:    مەیتی بێکەس ئەنێژین!
ئاشنای تۆ بوو، هاوڕێی من،    لێی داگیر کردین مردن!
ئەی پەری نازەوایە    فرمێسک لە چاومان نایە
چونکە بێکەس بچووک بوو،    پایەی کۆمەڵیی سووک بوو!
کام پیاوماقووڵ، کام گەورە    کە بەرزیی جێی زوور هەورە،
وێنەی ئەو جوامێر بوو!    بەرامبەر دوژمن شێر بوو؟
لەکاتێکا ئەوانە    نۆکەر بوون بۆ بێگانە،
دەست لەسەر سنگ ئەوەستان،    یان بۆ پایە، یان بۆ نان
بێکەس بوو وەک پاڵەوان    پەنجەی لە چاوی چەقان،
پەنجەی تیژی سەرزەنشت،    داخی دڵی خۆی پێ ڕشت!
بەڵێ بێکەس نابووت بوو،    جار جار برسی بوو، ڕووت بوو،
بەڵام کام تێر، کام پۆشتە    وێنەی ئەو، ئەی فریشتە،
بێباک وەستا بەرامبەر    نووکی سونگیی ستەمگەر؟
کێ وا: لەژێر زنجیرا    ئازادیی هات بە بیرا؟
بە شیعری جوان نەڕانی:    بە یادی کوردستانی!
ئەی شۆخو شەنگ، ئەی پەری،    زۆرتر بۆ ئەوەی بگری:
کە بێبەرگیو بێنانیی    خۆی لە ڕووی تۆ ئەزانی،
لەگەڵ ئەوەش تا مردن    نەکەوت لە تۆ پەرستن!

ملکەچی قیلەی ڕووت بوو، دێوانەی عیشوە و خووت بوو...
وەک هەندێ شاعیریتر ـ تا ڕادەیەک گورچکبڕ ـ
تەماع هەڵینەفریوان شیعر بفرۆشێ بۆ نان؛
ئابڕووت بەرێ وەک بردیان، بەو کردەوانەی کردیان!

* * *

لەپاشانا ئەی پەری! نابێ لە بێکەس بگری،
کە گیرۆدەی مەستی بوو، مەستیی ئەو مەبەستی بوو!
ناوچە و سەردەمی ژینی پڕ بوو لە ناشیرینی،
وڵاتی پەرێشان بوو، بو هاووڵات زیندان بوو؛
نەتەوەی هەموو هەژار، مایەی ڕەنجیان بۆ زۆردار،
هەموو برسی، دەغەزار، نەزان و نەخوێندەوار...
دیل بوون هەم بۆ بێگانە هەم بۆ ئەو زۆردارنە،
کە خۆیشیان ئەیانمژین، بۆ خەڵقیشیان سەرئەبڕین!
ئەمجا کە ئەیدی ئاوا: کەشتی بۆ گەرداو ئەڕوا،
هەزاران هاوار بکرێ کەس نییە ڕێی ڕاست بگرێ،
ناچار خۆی سەرخۆش ئەکرد، هەستیی فەرامۆش ئەکرد!
جار جار، کە زۆر پەست ئەبوو، کەمێکیش بەدمەست ئەبوو:
داخی دڵی خۆی ئەڕشت، بە جوێن، توانج، سەرزەنشت!

* * *

ئەی فریشتەی چاوخومار! بەڵام بێکەسی هوشیار،
بێکەسی دنیای نووسین، دانەری بەستەی شیرین،
مەبەستی من و تۆیە، بۆ ئەوە ئەم «ڕۆ ـ ڕۆ»یە!
تۆ: پەریی شیعر و جوانی، من: هاوڕێی گیانی گیانی،
دانیشین بە جووت، دڵتەنگ، بڕێژین فرمێسکی مەنگ،
بۆ شاعیرێک بێ کەس بوو، بەڵام «کەس» تێمەی بەس بوو!
سا باڵای بۆ ڕەشپۆش کە، گری شیوەنی خۆش کە،
بە پەردەی نزمی ماتەم، بەستەی کوردیی پڕ لە خەم
لەسەر مەیتی بخوێنە، وەفای جوانی بنوێنە،
بۆ شاعیرێک کە گیانی، لێی هەڵئەقولا جوانی،
ئەگەرچی هۆی بەختی خۆی جوانیی فەسال نەبوو بۆی!

ناقۆلاَ و تێکسمڕاو بوو، ڕوومەت کونج، کزی چاو بوو
هونەر بۆ ڕووخۆشیی بوو کە خەوشی[1] داپۆشیبوو!
بەڵام پەری! تۆ ژیری، خاوەندی هۆش و بیری؛
جوانیی بالاَ و دەموچاو، بەهرەی تا سەر نین بۆ پیاو؛
هەزار چاوجوان، قەدباریک کەوتوونە چاڵی تاریک،
چی بە جیّ ما لە دوایان بو دۆست و ئاشنایان؟
یا جوانێک تا «پیری» ما کام گیرۆدەی بیری ما:
خوێنی کوڵمی چەن گەش بوو؟ چاو و برۆی چەن ڕەش بوو؟
یەک جوانییە: بای پاییز گەلاَی زەرد ناکا هەرگیز،
کە لە گیان، سەرچاوەی دڵ سەر هەڵئەدا قوڵەقوڵ:
وەک ڕۆحسووکی، ڕووخۆشی، خوێنگەرمی، خزمەتکۆشی[2]،
دڵی باش، دەروونی پاک، بیری ڕوون، کردەوەی چاک،
پێشتری گشت ئەمانە: بەهرەی هونەری جوانە!
بەڕاستی ئەو فەننان بوو، سەلیقەی شیعری جوان بوو!

* * *

ئەی شێوەشۆخ، ئەی پەری! دانیشە لای ژوور سەری،
وەک یاری وەفادار بە، بەڕاستی خەفەتبار بە!
قژی زەرد با پەشێو بێ، بەستەی خەم لەسەر لێو بێ:
تۆ بڵێ و منی هاوڕێ، تا دەستم قەڵەم بگرێ
ئەنووسم: دێڕ دێڕ، بەن بەن، بۆ بێکەس شیعری شیوەن!

---

١) خەوش: عەیب، ناتەواوی. ٢) ڕووخۆشی، خزمەتکۆشی: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا نووسراوە «ڕووخۆش، خزمەتکۆش». ئێمە وامان ڕاست کردەوە. م.م.ک.

# لاوانەوەی سەرەڕێ

لە بەغدا دەرچووە، سەیوانە ئامانجی،    ڕێ چۆڵ کەن ئەی برای زازایی و کرمانجی،
ڕێ چۆڵ کەن بۆ مەیتی ڕێبواری مات و زیز،    توخوا! با کەم تەڕ بێ بە فرمێسکی پاییز!
با کەم با ڕەشەبا لە لەشی ساردوسڕ،    نەک بەردی سەرەڕێ بێتە گۆ، بێ بە گڕ!
ئەی برای کرمانجی! ئەی برای زازایی!    مەبەنە سەر مەیتی لێشاوی خۆڕایی!
ئەو مەحموود جەودەتەی کە قیبلەی هیوا بوو،    ئەو مەحموود جەودەتەی قەڵا بوو، پەنا بوو،
ئەو مەحموود جەودەتەی کە ڕۆژی تەنگانە    تۆڵەی بۆ ئەسەندین لە ئۆردووی بێگانە،
ئەو مەحموود جەودەتەی سروشتی خاکی بوو    سەرتاپای کردەوەی پاکی بوو، چاکی بوو،
ئەو کوردە، ئەو مەردە، ئەو ڕۆڵەی هەڵکەوتە،    ئەو زانا و ئەدیبە، ئەو مەحموود جەودەتە!
وەک تاجی سوڵتانی، دەک لاڵ بم، لە کیس چوو،    ئەی برا بۆچ ئەدەن پەلاماری پێوو؟ ڕێ بەردەن،
با بڕوا بۆ سەیوان تابووتی،    چاو شۆڕ کەن لەعاستی توانج و تانووتی!

# له سەرەمەرگی هیوادا

ڕۆڵـــەی تـــاقانەم، هـــیوای ژیـــانم،
ئـــەستێرەگـــەشەی بـــەری بـــەیانم،
ڕۆژی نـــەورۆزی پـــرشنگ‌زێڕینم،
تـــریفەی سـپـی مـــانگی هـــاوینم،
شـــــنەی شـــەماڵی کـــەلی بـــەهارم،
لەرەی ئـــاونگی مـــێرگی ئـــاودارم،
جریوە و جـووکەی شـادیی هـێلانەم،
شەوبۆی پەخشانی ئەم‌گشت هەردانەم،
خونچەی پشکووتووی باغی جوانیم،
ڕۆڵەی شـیرینم، ئـەی گـیانی گـیانیم!
تـــوخوا بـــەو جـووتە چـاوە شـینانە،
ئـــاخرنیگاتە تـــێر بـــۆم بـــڕوانـــە!
بـــا بـــە کـــلۆڵی، بـــە ڕۆڵـە ڕۆیـی،
کـــە دانـیشتم کـز، وەخـتی بێتۆیی:
بە یادی دوو گۆم، دوو گـۆمی بـێبن،
کە هۆ گریان بوو ماسیی ڕۆحی مـن،
هۆن هـۆن فـرمێسکم بـڕژێتە داوێـن
فرمێـسکی تا سەر جـەرگ ودڵ‌تـاوێن

* * *

هـــیوا! ئـەو لێـوەی بـە زەردەخـەنە،
گـــــزنگی ڕۆژی گـــــوڵانی مـــنە،
بـــۆ زەردەخــــەنەی ئـێستا تـێ‌نازێ؟
بۆ لەژێـر هـەوری مـەرگا ئـەلەرزێ؟
هەی هاوار، هەی داد هیوای شـیرینم
گیان ئەدەی، ئـەمریی، ئـیتر نـاتبینم!
ئیتر... ئـاخ ئـیتر... نـاتبینم هـەرگیز،
لە خـــەوا نـەبێ، شـەو شـەوی پـاییز
جار جار وەک بەرقی ئاو بۆ زۆر تینوو
دێت و نـاشکێنی تـاسە و ئـارەزوو!

* * *

سـا بـۆم بـڕوانـە تـێر بـەو چاوانە!
ڕۆڵـــــە مـــردنە و فـــرمێسکبارانـــە!
هـــیوا ڕۆڵـــە ڕۆ، کـۆرپەم ڕۆڵـە ڕۆ!
ئـــەوکـــوڵمە ئـــاڵە نـــەرمونۆڵە ڕۆ!
ئـــەو قـژە زەردە، ئـەو چـاوانـە ڕۆ!
ئەو نەغمەی «دایە»و «بابە» جوانـە ڕۆ!
تا دەممان لە گۆ ئەکـەوێ وەک تـۆ:
هـــیوای دایـــە ڕۆ! هـیوای بـابە ڕۆ!

# گوڵی کەمخایەن[1]

بۆ جوانێکی سیلکوشتوو

لە بەربەیانی شەباب و جوانییا ئەی گوڵ،
گوڵی گەشی پەمەیی وەک ستارە پرشنگدار!
لە خەندەتا ئەگەڕا جیلوەیی تولووعی بەهار،
لە نەغمەتا مەلی خوێندن ئەهاتە سۆزش و کوڵ!

لە چاوتا دوو گەلاوێژی ڕۆشنی پڕ تاو،
لەناو شەپۆلی فسوونا نیگای ئەخستە مەلە،
لە پێشی پێیی حوسنتا سەرانی دانووشتاو،
سەری سجوودی عیشق بوون بەرامبەری قیبلە!

وەهام ئەزانی کە ئەی گوڵ، نیگاهی شەوقی زەمان
لە سەیری شێوەیی شۆخت هەمیشە تێر نابێ،
وەهام ئەزانی کە هەرگیز کزەی گەلاڕێزان،
بە ناسکیی پەلوپۆی تۆ «مەحاڵە» فێر نابێ!

کەچی چ زوو، چکتوپڕ لە پەنجەیی وەرەما
لەشی شل و پەمەییت، ئەی گوڵی جوان، ژاکا!
چ زوو توایەوە حوسنت لە قرچەقرچی غەما،
دو پێشە ما... ئەویش ئەڕزێ لە سینەیی خاکا!

لە لالەزاری جوانیت نیشانەیەک مابێ:
هەر ئەو فوغانەیە ئەڕژێ لە ماتەمی یاران،
هەر ئەو دڵۆپەیە ئەتکێ لە دیدەیی گریان!
بەڵام ئەمین بە! شەو و ڕۆژ هەتا بەرو دوا بێ،

فوغان و گریە بەشوێنتا برانەوەی نایە،
فوغان و گریەیی پاش تۆ هەتیوی سەودایە!

---

١) خایەندن: خایاندن، دەوام کردن.

# شیوەنی گوڵاڵە

کچم، مایەی ژیانم، یادگاری
غەرامی کەمدەوامی عومری لاویم،
جگەرگۆشەی عەزیزم، نووری چاوم،
چ زوو مردی؟ کچم هەیهات کچی خۆم،
چ زوو کەوتیتە بن گۆمی عەدەم؟ خۆ
دەمێ پشکووتی تێر بۆنم نەکردی،
ئەجەل داد! ئاسمان داد! عەرشی خوا داد!
کچێکم بوو، کچێ، تەنیا کچێ، بەس!
قەبر! ئەی خاکی ڕەش، ئەی چاڵی تاریک:
لە دەورت هەڵچنیم خوشک و برا پاک،
چ داوێکە؟ چ ئینسافێکە، زاڵم؟
لەبەر یەک لوقمە، یەک پل گۆشتی مەعسووم،
ئەگەر، ئەی خاکی زاڵم، ئیختیارت
لە کردارت ئەگەر مەسئول سەمایە،
بەڵێ: هەرچی و هەچکەس بێ سەبەبکار،
ئەڕێژم ئەشک، ئەکێشم ئاهی بێ‌بن:

شەبابم، نۆبەرەی شیرینی داری
دڵۆپی خوێنی گەرمی ئاگراویم!
سەری تاڵە دەزووی ئاماڵی خاوم!
چ زوو مردی؟ چ زوو کەوتیتە بن گۆم؟
بە ئۆخەی تەڕ نەبوو لێوم وتم ڕۆ!
گوڵاڵەی خۆشەویست دەرلەحزە مردی!
حەکیم، علیمی بەشەر، دەرمان، دەوا داد!
ئەویشت ئاخری کوشت چەرخی ناکەس!
دڕندەی لاشەخۆری باوک و دایک،
کچێکم بوو ئەویشت کردە خۆراک!
جەهەننەم تاو ئەدەی ئەیکەی بە حاڵم؟
منت بۆچ کرد لە نووری دیدە مەحرووم؟
نییە، ناچارییە تۆیش کاروبارت،
تەبیعەت، هەرچی... حەتتا زاتی خوایە
پرۆتستۆی[1] ئەوم مەتلووبە ئێجگار:
سیلاحی عاجزی زنجیر لە گەردن!

کچم خۆ تۆ نەماوی تا ببینی
نە تۆی پێ دێتەوە نە عەقڵی ئەبرێ،
کچم تەنیا گوڵم، نەشئەی ژیانم،
کچم، ڕۆحم، کچم، هەیهات! هەیهات!

کە باوکت چەن بە ناسۆرە برینی!
لەسەر تۆ کام یەخە، کام ئەستۆ بگرێ؟
دڵی شادم، ترووسکەی چاوەکانم،
چ کۆچێ بوو! چ کۆچێ؟ وا کش و مات؟!

---

١) پرۆتستۆ: ئیحتیجاج.

# بۆ بولبول[1]

ئەی باڵداری ئێسکسووک! بولبولی دەنووکچووک!
باغچە بە باغچە ئەفڕی؛ وچانێکی لێ ئەگری:
کام سەرچڵ دڵت گرتی دەنگی لێ هەڵئەبڕی:
کام ئاوازە شیرینە، ڕووناکی و نەشئەی ژینە،
بە چوار دەوریا ئەپژێنی، دنیا پێئەکەنێنی
لەو گەرووە پچکۆلانە ئەم نەغمە بەرزو جوانە
چۆن دێتەدەر؟ چۆن ئەڕژێ؟ واگیان ئەسمێ، هۆش ئەمژێ؟
یا ئەو تۆزقاڵە دڵە چۆن ئەوەندە بەکوڵە؟
یا چۆن ئەو نەختە مێشکە بۆ فەن بووە بە بێشکە؟
چۆن؟ توخوا چۆن؟ ئەی بولبول، ئەی باڵداری بەهرەزل،
نە پەریت، نە ئینسانی، نە قوتابیی فەننانی،
کام بەستە، کام گۆرانی سیحری ڕووتە، ئەیزانی؟

* * *

منیش لای خۆم هەمیشە شیعرم کردووە بە پیشە،
وەک تۆ، بەڵام ئەم و ئەو: یەکەم ڕۆژە، دووەم شەو!
شیعری من کامیان چا بێ ئەمجا بێ فرمێسک نابێ؛
هەر خەمە و هەر هەناسە، یادە و ئەندێشە و تاسە
شیعری تۆ، گشت نموونە، ئاوی سەرچاوەی ڕوونە،
سەربەست ئەڕوا و خوڕەی دێ؛ ئەمیان لەکوێ، ئەو لەکوێ؟
ئەم شیرینی، ئەو تاڵی، ئەم فەساحەت، ئەو لاڵی،
ئەمیان ئاوازەی شادی، ئەویان نووزەی بەربادی
بەڵام بولبول، ئازایی ئەوەیە نەبی بایی،
بەم بەهرە و بەم هونەرە! ئەگەر یەزدانی گەورە
لەو نیعمەتەی پێی داوی، تۆزێکی نەک تەواوی
بەم شاعیرە هەژارە ڕەوا بدیایە، دیارە،

منیش لە تۆ زیاتر، پەسەندکەر و گوێ‌لێ‌گر،
سەری بۆ کەچ ئەکردم، سوجدەی ئەبرد، وەک بردم!

* * *

منیش دەروونم شاد بێ، ملم لە بەند ئازاد بێ،
دەوروپشتم گوڵزار بێ، عومرم یەکەر بەهار بێ،
بەرەڵڵا بم، باڵدار بم، دوور لە مەینەتی شار بم،
پەرداغی ئاوم گوڵ بێ، جێی حەسانەوەم چڵ بێ،
خواردنم، چڵ و بەرگم بە ئابڕووم، خوێنی جەرگم
نەبێتە ماڵ لەسەرم، بێ‌منەت بێ و بێ‌شەرم،
دڵم ئەوەندە مەست بێ، کونجێ نەبێ کە پەست بێ،
عەشقم وەک عەشقت پاک بێ، پڕ لە هیوا و ڕووناک بێ،
ئەبەدی بێ و پڕجۆش بێ، ئەوەندەی هی تۆ خۆش بێ
منیش ئەی مەلی پیرۆز، بە یەک چریکەی پڕسۆز،
بەستەی وات بۆ ئەخوێنم، کە جوان جوان بلەرزێنم،
ڕووی کام گۆم شین و مەنگە، کام درەخت شۆخ‌و شەنگە!
کام شاخ کە سەخت و بەرزە، بێخەمە بوومەلەرزە!
کام ئاسمان بێ‌بنە، ناخی پڕ کەم لە شنە!
یا کام دەریا زۆر قووڵە بنی بخەمە جووڵە!
بەڵام، داخی داخانم، من مەل نیم و ئینسانم!
لە دڵ، لە مێشک یەزدان بەخشیویە بە ئینسان
چەشنێکی زۆر لای ڕەشبین: بۆ دنیای گیان، دنیای ژین!
ئێمە عومرمان تا سەر ئەندێشەیە و دەردی سەر؛
ترسە و تاسەیە و پرسیار یەک لە شوێن یەک: سەد، هەزار:
بۆچی زاین؟ کەی، چۆن ئەمرین؟ چیمان لێ دێ کە مردین؟
چی ڕاستە؟ چی درۆیە؟ کام شت ئەنجام؟ کام هۆیە؟
یان تەنانەت بۆچ ئەگریین؟ فرمێسک لە چاو بۆچ ئەسڕین؟

ئیتر لەم چەشنە پرسیار، یەک لە شوێن یەک بە قەتار:
ئەمیان یەخەمان ئەگرێ، جوابی ئەممان پێ نادرێ،
ئەوی تر دێتە پێشێ ورد ورد گیانمان ئەکێشێ!

* * *

ئەی بولبول! هەژار خۆمان، بێدەستەڵات، پڕگومان،
بە دەشتی ژینا وێڵین، لەو جێگایەی جێی دێڵین،
هەچکوێ ئەچین بیابانتر، جێگای ترس و گومانتر
ئەی وەستای بەستەی شیرین! ئێمە هەتاکو ئەمرین،
یا ئەپرسین، یا ئەگرین، ئیتر چلۆن بخوێنین،
وەک تۆ، وەک گشت سەرخۆشێ پیاڵەی دڵخۆشی نۆشێ؟![2]

---

١) هەڵبەستی To A Skylark، ی شاعیری بەناوبانگی ئینگلیز پرسی بیش شیللی، سەرچاوەی ئیلهامی ئەم شیعرانەیە.
٢) لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا لەجیاتیی «سەرخۆشی» و «نۆشی»، نووسراوە «سەرخۆش» و «نۆش». ئێمە ئەوەمان بەلاوە هەڵەی چاپ بوو. م.م.ک.

# جیلوەی شانۆ

**بۆ پەریی سەما**

لە جەرگی[1] پەردەوە تک تک دڵۆپی عوود ئەڕژا،
بە نووکی تەئسیری
تەرەب ئەهاتە خرۆش، تالعی سروور ئەپژا!
بە ئاهی دڵگیری:

کەمان ـــ شەهیق و زەفیری فریشتەیی ئەلحان ـــ
ئەکەوتە ناو دڵی مردوویش هەناسەیی[2] هەیەجان!

نەوایی مۆسیقی،
کە مەخرەجی سیحری
تەلێکە[3] پێئەکەنێ یاکوتێکە حوزن ئەگری،
بە سۆزی تەشویقی،

مەتاعیبی گوزەران،
هێواش هێواش ئەتکێتە دەروونی نیسیاتێک
کە ڕەمزی لەززەتە، میفتاحە بۆ تەلیسمی ژیان،
ژیانی ئینسانێک!

* * *

لەپڕ کە باڵی ڕەشی هەڵبڕی قەلی پەردە:
پەریی جوانی، فریشتەی سەمایی نادیدە،
لە عەرشی شانۆدا
بە عیشوە پەیدا بوو:

نیگاهی مەست وەکوو شوعلەیی هیدایەتی سەودا
تەبەسومی موتەوالی شیفای هیوای مردوو
ئیشارەتی هەموو نوتقی فەسیح و ئەلحانی
وەکوو کیتابی موقەددەس بلند و ڕۆحانی!

بە سنعەتێک ئەلەقێ پووزی وەک ستوونی سپی،
وە پێی بچووکی مەهارەت لە ئەردی زەربە ئەدا،

به دڵ بوایە زەعیف بوو مەتانەتی دنیا
لە ژێریا ئەتەپی!

چ جوان دوو باڵی بلوورین وەکوو لقی مەڕمەڕ
نەرم نەرم ئەلەری،
شەپۆلی لێ ئەوەری،
شەپۆلی سنعەت‌و ئیلهام، شەپۆلی جیلوە و فەڕ!
کە چاوی ئاسمانی

لە بەحری بێ‌بن‌و دووڕی خەیاڵی بەرز ئەبڕی،
ئەکەوتە لەرزی لەتافەت لەرانەوەی جوانی:
لەشی لەکوڵمەوە تا سنگی نەرم‌و مەمکی خڕی،

کوڵم کە میوەیەکە ئاڵ‌و مزری سەرلقی لەش
وە نەرمی سینە کە لانەی خەوێکە یەزدانی
ـ خەوی عیشق، گڕی عیشقی هەمیشە گڕپە و گەش! ـ
وە گۆی مەمک کە تەماس وگوشینی وەک دوگمەی
ئەلەکتریک، ئانی
ئەخاتە سەر ڕەگی لەش کارەبایەکی تۆخەی!

دەمێک ئەبوو بە شنەی با بە ڕەوتی نەرم و نیان،
دەمێک ئەبوو بە پەڕێکی خەفیفی ئاوریشمین:
بە گەردەلوولێ حەزین
ئەکەوتە بەر جەرەیان بێ‌قەرار و سەرگەردان!

سەما، سەمای سنعەت:
حەیاتی جوانی، جەمالی بزووتن وگیانی
وجوودی عیشوە و ناز،
لە خواوە بەهرەیەکە پڕ بە پێستە بۆ ئافرەت؛
ئەویش بە سەد ئیعجاز
زیای سروور ئەڕژێنێتە ژینی ئینسانی!

* * *

فیدات ئەبم ژنی جوان، ئەی جەمالی سنعەتکار،

بەڵێ! دەلیلی سەعادەت ئەخەیتە پێش ئەنزار،
بەڵام هەموو تاوێ
دەوام ئەکا... لەپڕێکا وەکوو مەلی ئاوات
کە تۆ فڕییت هەیهات!
ئەویش لە پەردە ئەپێچرێ، نیشانەیەک، ناوێ

لە تۆ بمێنێ: پەنایە بە خاترەی مەئیووس،
وەلێ لە ئەو، لە سەعادەت: سفر... سفر... ئەفسووس

---

١) جەرگ: دیوی ناوەوە (بە مەجاز). ٢) هەناسە: تەنەففوس،نەک ئاخ. ٣) وەک تەلی «تاری، کەمان و کونی شمشاڵ.
٤) فریشتەی: لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستاگۆرانا نووسراوە «فریشتە»، بەڵام دیارە هەڵەی چاپە. م.م. ک.

# بۆ گەورەیەکی شیعردۆست

شیعری جوانت ئەوێ، قوربان، شیعری جوان، شیعرێک گەشە و زەردەخەنە با بە ژیان!
شیعرێ چەشنی ئەستێرە بجریوێنێ، ڕوون بێ، ناخی دەریای دەروون بنوێنێ،
وەک بولبولی ناو هێلانەی گەرموگوڕ، ئاسوودە بێ و بەستە بڵێ سەرومڕ!
شیعرێ کە وەک ساوا نازدار و جوان بێ، خۆراکی گۆشتی دڵ، شیلەی ژیان بێ!
شیعرێ کە هەر دەنگێکی زرنگەی زەنگ بێ هەر کەرتێکی نەخشێکی ڕەنگاوڕەنگ بێ!
شیعرێ گیانی تیا بێ و بژی و ببزوێ، زوبانی دڵ بزانێ و باش پێی بدوێ
قوربان، ڕاستت ئەوێ من و شیعری وا چەشنی عەجەم ئەڵێ «کوجا مەرحەبا!»
لەپێش هەموو شتێکا چونکی کوردم، چۆلەکەی ناو هەزاران داوی وردم،
باڵی فڕین، دەنووکی هاوارکردن، زیاتر چەقۆم نزیک ئەخا لە گەردن!
بولبولیش بم مادام قەفەسم تەنگە، زمانم لاڵ، نەغمەی شیعرم بێدەنگە!
جگە لەوەش لە هەموو شت خواپتر: دڵ خاڵییە، کوورەم تیا نییە ئاگر،
پەڕەی دڵێ زامدار نەبێ بە تیری خوای دڵداری، زوهرەی جوانی زنجیری
لەگەڵ ڕیشە و ڕەگی نەئاڵۆزابێ، دڵێ پیری خۆی لێ دابێ و ڕزابێ...
ئەو دڵە، کەی جێگای پەری ئیلهامە؟ گۆشتی بێگیان خۆی کامە، شیعری کامە؟
لەپاشانا، قوربان ڕەنگە بزانی، مەئموورێکی بچووک، وەک من، ژیانی
گەردنکەچی نانە، حوکوومەت، نانیش بۆی ژەم بە ژەم حیساب ئەکا بەپێی ئیش!
تا شان و مل وەک قەیدی کۆن تۆز نەگرێ ئیش بۆ میری، سەما بۆ ژووردەست نەکرێ
تا ماندوو بوون، نا کفرم کرد، تا مردن، کەی بۆ مەئموور ئەلوێ، قوربان، نان خواردن؟!
مێشکێ ئاوا دەردی سک ئەندێشەی بێ، لەناو دەریای ئیشا گێرە و کێشەی بێ،
کەی چاو بە دنیای جوانییا بگێڕێ،[1] هەرچی بینی بیخاتە پێنج شەش دێڕێ؟!
ئەمجا، قوربان، هیوام هەیە لە «گۆران» ئیتر داوا نەکەن هەڵبەستی جوان!
بەسەر شیعرا کەسێ زاڵە سەربەست بێ، بەرەڵڵا بێ، بەعارەقی عەشق مەست بێ،
بۆ من وەها ئەلوێ ئیتر خامۆش بم، با لە مەیدان ون بم و فەرامۆش بم!

---

١) لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆرانا لەجیاتی «کەی» نووسراوە «کێی». ئیمە ئەوەمان بەلاوە هەڵەی چاپ بوو. م.م.ک.

# بۆ سالم

بە یادی تۆ ئەگرێ دەستی عاجزم خامە
دەهایی ڕۆشن و بەرزت ئەگاتە ئیمدادم،
هونەر نییە کە ئەناڵێ ڕوبابی ئینشادم،
تەزەککورت سەبەبی سانیحات و ئیلهامە!

لە دائیرەی سەلەفا ئەی قەریحە ڕوون و ڕەوان،
کەسم نەدی کە وەکوو تۆ خوڕەی بێ ئاهەنگی،
بە حوزنی پڕ لە بەدیعە وەکوو «کەلیم» گریان،
ئەگەرچی وێنەیی «حافز» بە غەلغەلە و شەنگی...

لە ئاسمانی فەخردا شیعر بوو باڵێکت،
ئەوی ترت بە تەبیعەت شعووری میللی بوو،
لە شەوقی حوسنی بتێ بوو ئەگەر خەیاڵێکت،
ئەوی ترت خەم و عەشقی وەتەن مەئالی بوو.

نەبوو فەڕی لە نیگاهی غەریبتا تاران،
سەریر و ئەفسەری شاهیت ئەکرد فیدایی وڵات،[1]
کە کەوتە پەنجەیی غەدر و جەور زەویی بابان،
بەقەد غەدر غەزەلت وت، بەقەد جەور ئەبیات!

وتت بە حەزرەتی «نالی»[2] ڕەفیقی دەربەدەرت:
«خەیاڵی عەودەتی موڵکی ئەسیر نەخەیتە سەرت
زەلیلی نەجمو هیلالە[3]، شەوە سلێمانی
غورووبی کردەوە ڕۆژی شکۆهی بابانی...»

بنوو لە قەبرەکەتا موستەریح بە ئەی سالم،
لە تۆکوردترە ئێستا نەزان هەتا عالم![4]

---

١) بەم مەعنایە سالم بەیتی زۆری هەیە.
٢) ئیشارەتە بۆ قەسیدە درێژەکەی کە وەڵامی قەسیدەی نالیی پێ داوەتەوە.
٣) نەجمو هیلال: نیشانەیە بۆ بەیاخی تورکەکان.
٤) ئەم میسراعە وەزنەکەی لەنگە، ڕەنگە لە ئەسڵدا
بەم چەشنە بووبێ: لە تۆ کە کوردترە ئێستا نەزان هەتا عالم!

# دەروێش عەبدوڵلا[1]

## بۆ فریشتەی مۆسیقا

بە ڕەنگی زەرد و شێوەی دەست و شمشاڵی کزا، دەروێش
حەزمکرد بەستەیەک ببیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ،
لە سیماتا بەدیمکرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش،
وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبولی خەم بێ!

بەڵێ، دیارە، لەناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەتکار
وەکوو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا،
بەڵام تەختی روفاهو تاجی حورمەت میللەتی هوشیار
بە ئوستادێ ئەدا وەک تۆ لە ناو شمشاڵی کونکوندا

سەحەر بێنێتە گریان و قسە، سیحری پەریی نەغمە!
برای دەروێش! ئەزانم بۆ مەعیشەت وێڵ و ئاوارەی،
بە زەهری ناعیلاجیتە لە ناکەس ویستنی لوقمە،
بە مردنتە کە گوێی ناشی ئەخنکێنێ خرۆشی نەی!

بەڵام چی بکەین لە ناوچاوی ڕەشی بەعزێ زەکای گەورە،
وەکوو تۆوی گوڵی دەم با لەسەر بەردێکی ڕەق ئەڕوێن،
ئەگەر خلیقەت نەسیبی عومری تۆی مەحکوومی ئەم دەورە
نەکردایە، خوا عالم، لەکام عەرشت ئەسوو داوێن؟!

نە حەرفی مەکتەبێکت خوێند، نە ئوستادێ پەلی گرتی،
سیرف بەرزیی زەکا ئەم سنعەتەی فێرکرد بە شمشاڵت،
هەموو وەزنێکی گۆرانی، لە توولانی هەتا کورتی،
بە سەرپەنجەی هونەر کردت بە دیلی کۆششی زاڵت!

* * *

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی ڕۆحی بێگانە
میزاجی کوردەواریم تێکچووە، دەروێش عەبدوڵڵا،
دەخیلت بم دەسا بەو لاوک و ئای‌ئای و حەیرانە
شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی مات و چۆڵم کە!
لە بیتهۆڤن گەلێ زیاتر بە ڕۆحم ئاشنای، وەڵڵا
دە، ئەی دەروێش، سکاڵایەک لەگەڵ ڕۆحی کلۆڵم کە!...

---

١) دەروێش عەبدوڵڵا شمشاڵژەنێکی بەهرەدار بوو، چارەکە چەرخێک لەمەوبەر دیومە. زۆرتر لە هەورامان ئەژیا.

# هه‌ڵبه‌ستی ده‌روون

هه‌رچه‌ن ئه‌که‌م، ئه‌و خه‌یاڵه‌ی پێی مه‌ستم،
لێکدانه‌وه‌ی ده‌روون، قسه‌ی زمانم:
ئه‌مویست ده‌روون بکرایه‌وه وه‌ک تۆمار
ده‌رکه‌وتایه: ئاوات، هیوا، خه‌وبینین...
ده‌رکه‌وتایه: مانای مه‌نگی ده‌ریایی،
ده‌رکه‌وتایه ئه‌و دنیایه که شیعری
زه‌رده‌خه‌نه‌ی بێ ئاوێنه‌ی ده‌م و چاو
به‌ڵام ئه‌فسووس! که ئه‌و شیعره جوانانه
له ناوه‌وه ئه‌جریوێنن، ئه‌خوێنن

بۆم ناخرێته ناو چوارچێوه‌ی هه‌ڵبه‌ستم!
بۆچی وه‌ها دوورن له یه‌ک؟ نازانم!
ده‌رکه‌وتایه دنیای جوانتر له به‌هار،
پرشنگدارتر له ئه‌ستێره‌ی قوبه‌ی شین!
که نه‌رمه‌با له ڕووی ئه‌دا ئه‌سپایی
بێ فرمێسکه و زۆرتر له فرمێسک ئه‌گری
تیژگێک ئه‌دا ڕ وونا کتره له هه‌تاو!...
باڵدارێکن جێ ناهێڵن هێلانه،
هه‌رگیز قه‌ڵه‌م به کاغه‌زا ناهێنن!...

•

# جواب بۆ جەناب [1]

ئەی «ژیان» پاش شکایەتی دووری؛ ماچ کە چاوی جەنابی شێخ نووری!
ماچ کە چاوی بە تاسەوە، کە جەناب دەرسی ئەووەڵ گەیشتە خەتمی کیتاب!...
ڕاستە شیعری ڕەواج و قیمەتدار، باوکی تۆ بوو بنێری بۆ بازاڕ،
ڕاستە ئێستەش بە دۆسیە و [2] دەفتەر داخراوە لە مێشکی شەشدەر...
لاکین ئاخۆ چ شاعیرێکی‌تر، شیعرە پیشەی بە دائیمی، سەرومڕ؟
باوکتە، تۆی، منم، ئەمە یا ئەو هەوڵی نانە بە ڕۆژ و شیعرە بە شەو
چارەنووسی بەشی ئەزەلمان، داد، پیشەیەکە شیعر وتن: بەرباد!
«مع ما فیە» تەبیعەتی شاعیر، نە وەزیفە و زەرووڕەتی قاهیر،
نە بڕینی‌زمان و پەلبەستن بولبولی مەنع ئەکا لە مەیلی وتن!

---

١) وەڵامە بۆ هەڵبەستێک کە م. نووری بە ناوی جەنابی کوڕیەوە لە ڕۆژنامەی ژینا بەرامبەر بە دانەری شیعر بڵاوی کردبووەوە.
٢)لە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گوران خۆیدالمجیاتیی «دۆسیەو» نووسراوە«دۆسیە». ئێمە ئەومان بەلاوە هەڵەی چاپ بوو.م.ک.

## ـ ١ ـ

# گەشت لە هەورامان

### سەرەتا

ئەم گەشتنامەیە کە سەردەمی هەڵبەستنی ئەگەڕێتەوە بۆ بیست ساڵێک لەمەوپێش، لە هەڵەبجەوە دەست پێ ئەکا. مایەی ئینتیباعاتی تاقە گەشتێک نییە، بەڵکوو هەست و بینینی چەن گەشتێکی کات و وەرزی[١] جیاجیای پێشوو لە بیرەوەریما پەنگیان خواردەوە، هەتا بۆ جاری دوایی لەگەڵ چەن هاوڕێیەکی گیانی، بۆ چەن ڕۆژێک، بە پێکەنین و گۆرانی وتن بە ناو باخە زۆرەکان و یاڵە بەرزەکانی هەورامانا سووڕاینەوە. ئیتر ئەم هەڵبەستە لە خولاسەی هەموو ئینتیباعاتی گەشتەکانی کۆن و تازەم هاتە دی.

**«گۆران»**

•

### دیمەنی[٢] ڕێگا و بان

کۆمەڵە شاخێک سەخت و گەردنکەش، ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش؛
سەرپۆشی لووتکەی بەفری زۆر سپی، بە دارستان ڕەش ناو دۆڵی کپی
جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیساو: هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تەواو.
هاوار و هاژەی کەفچەڕێنی چەم بۆ تەنیایی شەو لایەلایەی خەم!
توولەڕێی باریک، تووناوتوون پشکن ڕێبوار ئەخاتە ئەندێشەی بێبن
ناو ڕێگا تەق تەق[٣]، لاڕێ بەردی زل کە هێشتا گەردوون پێی نەداوە تل!
گا سەرەوژوورە[٤]، گا سەرەوخوارە تاڵی و شیرینیی دنیای ڕێبوارە!

### ڕێگای ناوباخ

پێش ئەوەی بگەی بە ئاواتی دێ ئەکشێتە ناو باخ توولەماری ڕێ.
شنەی سێبەری داری گوێز و توو ئەسڕێ ئارەقی ڕێبواری مانوو.
تەسکینیی ڕێگای باخەوباخی وێڵ «مانوو نەبی»یە: لەم کێڵ[٥]، بۆ ئەو کێڵ!
سەلامونعەلەیک، مامەی بن دارگوێز، سەلامی مانوو لە پیری بێهێز!
ـ مەرحەبا سەر چاو، بەچکەی کاکۆڵ[٦] قیت سمۆرەی سەر دار، ڕۆڵەی زرنگ و زیت!
ئەڕۆی، هەر ئەڕۆی... تەلانە[٧] و تەلان، ئەمجا ئەگەیتە پێچی بەرماڵان

## دێ

کام بەربەرۆچکەی زۆر باسەفایە — چەشنی دڵی شاد دێیە، ئاوایە!
خانووی بەگزادە لە سای درەختا — ئارامیی بووکە لە کۆشی بەختا
خانووی ئەهالیش زۆریان دوونهۆم: — هەندێ قنج و قیت، هەندێ لار و کۆم
یەک لەسەر یەکتر، بەرەو لووتکەی کێو — بۆ ئاسمان ئەچن وەک پێپلکەی[8] دێو!
لە دێدا کام جێت گەورە بەرچاو کەوت: — ماڵی ئاغایە و خانەقا و مزگەوت!

## ژینی دیوەخان

کە گەیشتیتە بەر دەرگای گەورە — هەر خزمەتکارە و لێت ئەدا دەورە،
ڕێت پێشان ئەدەن تاکوو دیوەخان، — ئیتر دیوانە و مەرحەبای میوان
دەستەی خزمەتکار: فیشەکدان لە مل، — بە چەفتە و مشکی سەر و تەپلە[9] زل
دەست لەسەر خەنجەر چاوەڕێی فەرمان: — چ بۆ سەربڕین، چ بۆ سەر دانان!
هەچ کەسێک تازە بێتە دیوەخان، — کڕنووشێ[10] ئەکا بە سەر دانەوان،
گەرمە دیوانی شەوی بەگزادە، — تێکەڵ و پێکەڵ بابەت و مادە!

## مەلای دیوەخان

لە ژێر مێزەرا مەلای نووشتاوە، — ڕیشی بۆ سەر سنگ پرش و بڵاوە،
قیافەت پەڕپووت وەک کتێبی کۆن، — زمانی شیرین، سیمای نەختێ مۆن،
بازی رۆحی چەش بە شیعر و ئەدەب، — بەڵام شێوەی زووی عەجەم و عەرەب
بۆ میوان بێ مایەی تەسەلا — لە کۆڕی شەوا: مەلایە و مەلا!
تۆ و مەلا و شیعر و فەلسەفەی ئیسلام، — گوێڕاگرتنی تاوتاوی عەوام،
بە بێ زیاد و کەم دێنێتە پێش چاو: — سەرنجی کوێران لە نامەی نووسراو!
کە دیوان چۆڵ بوو، چوویتە ناو جێگا، — دەست ئەکەیتە مل خەوی پاش ڕێگا!

## بەیان

«ئەڵڵاهوئەکبەر!» مەلابانگانە، تاریک و لیڵی بەری بەیانە
مانگی بەجێ‌ماو لە سەفەری شەو زەردە لە ترسی قاسپەقاسپی کەو!
ئەستێرەی مەغریب وەک قەترەی ئەمەل کز کز ئەتکێتە ناو بەفری سەرکەل!
لە ڕێی ئەوبەری شاخ دەنگی زەنگ دێ، لە شوێنی ڕاوکەر تەقەی تفەنگ دێ!
وا بە تەواوی دنیا ڕووناکە، هەر سیحری ڕووتە سروشت ئێستاکە!
لە درەخت ئەدا شنەی بای سەحەر: جموجووڵیەتی چەشنی سەودای سەر!
لەسەر جۆگەی ئاش قاز و مراوی چاوەڕێی ڕۆژن هەڵبێنێ چاوی،
بەڵام تا خوڵقی نەکا چێشتەنگاو[11] نایەتە ناو دێ پرشنگی هەتاو!

## مزگەوت

بنچینەی مزگەوت نیشتۆتە ناو چەم، ڕوو بەرەو قیبلە، پشت لە جەهەنەم!
مزگەوتی کاتی چێشتەنگاوی چۆڵ: وەک مردوو کفنی بێدەنگی بە کۆڵ!
سوورەچناری لق و پۆپ درێژ سێبەر ئەکا بۆ خەوی بەردەنوێژ!
جار جار ئیمامی تەنیای گۆشەی حەوز: سەرسنگ ماچ ئەکا ڕیشی بە وەنەوز!
کەسێک بانگ ئەدا، ئەشڵەقێنێ گۆم، ئیمام هەڵدەستێ: دار بە دەست، پشت کۆم!
تا تەواو ئەبێ «ئەڵڵاهوئەکبەر» پەنگ ئەخواتەوە لافاوی نوێژکەر
نوێژ بەتاڵ ئەبێ، جەماعەت بڵاو، چەن پیرێک ئەبن بە خڵتەی لافاو:
سووچێک گەرم ئەکەن بە ڕازی جوانی، ئاخ بە با ئەدەن بۆ دنیای فانی!

## کانیی ژنان

سەرچاوەی ئاوێک: کەڵەکێک[12] لەسەر: ژنێک تێی ئەچێ، ژنێک دێتەدەر
ئەمەش لە دێدا کانیی ژنانە، قیبلەی دڵداریی هەرزەکارانە!
ئێواران پۆل پۆل لاوی کاکۆڵ لوول، سەرەڕێ ئەگرن، سەرگەرم و عەجوول،
هەرچەن هارەی دێ هەیاسەی جوانێک، لە هێلانەی دەم ئەفڕێ: ئامانێک!

## ژن

ژنی هەورامان: سەرتاپای خشڵ، سەرچاوەی بۆنی مێخەک و سمڵ،
تا بڵێی تەڕپۆش، ئاڵ و واڵا جل، بەژن و باڵا جوان، بەدەن نەرم و شل!
نیونیگای: خەندەی ئەستێرەی ئەمەل، نەغمەی گفتوگۆی وەک جریوەی مەل!
ژینی: بەهاری عەشق و جوانی! جیلوەگای حوسنی: ڕێی باخ و کانی!

## گۆرانی

عەشقی ئێوارەی سەرەڕێی کانی، بەرئەداتە چەم کڵپەی گۆرانی!
ڕۆژ ئاوا ئەبێ، چەم تاریک دایە، دەنگی «کنا لەیل[13]» هەر دوایی نایە
مانگ بە تریفەی ناودێ ئەکا کەیل، هێشتا هەر گەرمە ناڵەی «کنا لەیل ...!»
«سیاچەمانە[14] ... سیاچەمانە ...» بەهەشتی عەشقە ئەم هەورامانە!
ئەوەندەی داو و بەردی هەورامان، ڕەحمەت لە ژنی بەژن و باڵا جوان!
«سیاچەمانە ... سیاچەمانە ...» هەورامان جێگای سیاچەمانە!

---

١) وەرز: مەوسیم. ٢) دیمەن: مەنزەرە. ٣) تەق‌تەق: ڕێگای بەردەڵانی پلە پلە. ٤) سەرەوژوورە: هەوراز. سەرەوخوار: نشێو. ٥) کێڵ: خانووی هاوینەی ناو باغ. ٦) کاکوڵ: جۆرە سەر و گوودلەیەکە لە هەورلمان باوە.
٧) تەڵان: لە ناوەندی دوو ریز درەختا کوڵانێکی درێژە. ٨) پێیلکە: قاڵدرمە. ٩) تەپلە: کلاوێکی ڕەقە لە خوری، هەورامی لە سەری ئەکا. ١٠) کرنووش: سەلام بە خۆنوشتاندنەوە بۆ پێشەوە.
١١) مەبەست: لەبەر بەرزیی شاخەکانی ئەتراف تا کاتی چێشتەنگاو تیشکی ڕۆژ لە ناودێ نادا.
١٢) کەڵەک: دیواری وشکە بەرد. ١٣) کنا لەیل: کچێ، یار. ١٤) سیاچەمانە: چاوڕەشە، چاوڕەش!

## ـ ٢ ـ

# گەشت لە قەرەداغ

### سەرەتا

بە پێچەوانەی «گەشت لە هەورامان»، ئەم هەڵبەستە وەسفی هەست و بینینی تاقە گەشتێکە کە لەگەڵ کۆمەڵێک هاورێ پێک هاتووە. وەکوو یادگارنامە (مذکرة)، هەستکراو و بینراوەکانی هەنگاو بە هەنگاوی گەشتی بە وردی ـ ئەوەندەی هەڵبەست ماوە بدات ـ تیا تۆمار کراوە.

گەشتی ڕاستەقینە لە سلێمانییەوە دەستی پێ کرد، بەڵام وەکوو لەگەشتنامەکەدا پێشان دراوە لە دێی «سەیوسێنان» تەواو نەبوو. سەردان و بینینی ناو قۆپیی قەرەداغ ـ دارستانێکی چڕی بەناوبانگە ـ هیی کوێستانی بەرزی داریزەرد، هیی پەیکەری تەثریخیی دەربەندگەورەیشی لەسەر بوو، داخەکەم بۆم ڕێک نەکەوت ئەو دیمەنە جوانانەش بە چەن بەندێک بکەم بە مایەی ڕازاندنەوەی گەشتنامە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە چەن جارێک داوام لێ کرا و خۆیشم بەڕاستی ئارەزووم کرد.

**(١)**

عـــاسمانی شـــین و ئـــەستێرەکـــانی
گـــڵۆپەکـــانی ســـەرجـــادە و کـــۆڵان؛
دەڕژا لەســـــەردا کـــزەبای بـــەیان،
شـــاری پـــەنجەرە و دەرگـــا داخـــستوو:
ئـــا لەم کـــاتەدا کـــە خـــەو زۆر خـــۆشە،
کـــۆڵانە و کـــۆڵان بـــڕۆ بـــەرەوخوار

پـــێدەکـــەنین بـــۆ بـــەری بـــەیانی؛
زەرد هەڵگەڕابوون، کـز کـز ئـەسووتان.
ئـــەیلەرانـــەوە کـــولە و پـــەردەکـــان.
وەک یەک گیاندار و بێگیان تیا نوستوو
هـــەستە و بـــەرگی ڕێ خـــێرا بـــپۆشە؛
بگـــــەرە شـــوێنی کـــۆمەڵی ڕێـــبوار[1]!

**(٢)**

لە بەر دەرگای «بەگ» چارەوێ[2] وەستاو،
سەر و تـوورەکـە بـەرەو زەوی شـۆڕ،
کورکە و نیوحیلەی ئـالیک دواکـەوتوو
دووسێ لادێیی و یەک دوو خـزمەتکار،
هـــاتوچۆیانە بـــە گـــورج و گـــۆڵی
دوان لە هـــاورێکان هـــێشتا نـــەهاتوون،
ئاخ، هاورێی تەمەڵ، حەلوای ئاردی جۆ!

هەندێک زین پۆشتە، هـەندێک نـاتەواو!
بـــە کـــرمەکـــرمی ئـالیک گـەرمە کـۆڕ
خـەو ئـەتارێنێ لە هـاوسێی نـوستوو
فیشەکدان لە پشت، تـفەنگ جـانبێزار[3]،
بـــەڵام پـــێکنایە ئـــیش بـــۆ کـــلۆڵی:
ماڵی «بەگ» تـازە خـەریکی تـوێشوون!
چـــۆنتان خـــستینە گـــەرمای نـــیوەڕۆ؟

**(٣)**

سوار بووین، کەوتینە بناری سەیوان[4]،
شینایی دەشتی «تەکیە[5]»و بەرەوخوار
گوڵەبەڕۆژەی قژزەردی چاوکاڵ،
لەسەر قەبرەکان داری ئەرخەوان،
ڕوو لە عەرشی پاک ئەلەرایەوە،
سەیوان کەوتە پشت، بەرەو تانجەرۆ
لای «قەرەتۆغان[6]» سەرم هەڵبڕی،

ڕووی دنیا ڕووناک، بەیانی زۆر جوان!
پاراو بوو چەشنی ئەگریجەی نازدار!
ملکەچ وەستابوو: سەرگەرمی خەیاڵ!
وەک بووکی تارا سەوزی ئاودامان،
بۆ گیانی مردوو ئەپاڕایەوە!
بە ئەرمەغار و ڕەوتی خۆش بڕۆ!
ئاڵتوونی زەردەی لووتکەکانم دی!

**(٤)**

ڕێگای دێهاتی دەمی بەیانی،
پۆل پۆل ژن و پیاو لە دووی کەر و بار،
ئەم کۆمەڵانە تیایەتی جار جار،
سەرتاپا خشڵی زیوی وا پێوە،
لەعاستت سڵێک ئەکا بۆ لارێ،
ئەی جوانی لادێ بە سەرنج و سڵ،
ئیتر ... جڵەوە شلە و سەرە شۆڕ،

قەڵەباڵغە بۆ سلێمانی
سڵاوێک ئەکەن مل ئەنێن بۆ شار!
جوانێکی لاوی کۆڵەوانە لار،
ئەڕوا و هارەی دێ و ئەبریقێتەوە!
بە نیونیگای مەست تێیشت ئەنوارێ
لێت وورووژ اندم خەیاڵاتی دڵ،
ئاوات خواستنە و خەو بینینی زۆر!

**(٥)**

ڕۆژ ڕمێک بەرز بوو، داپەڕینە چەم[7]،
عەکسی سەوزایی ڕووی پڕ لەرەی ئاو،
ڕەنگ ڕەنگ پەپوولە ئەفڕی زەلاوزەل؛
هەوای پڕشنە چەمی ئەلەرزان،
لە ژوورمانەوە پردێکی ڕووخاو،
شارەمێرووڵەی ناو پەنگاوی قووڵ:
نامانە مل چەم سوار لە شوێن سوار،
ولاخ ڕووی ئاوی ئەکرد سمکاری،

ئاو شین، مەرەزە سەوز و گوڵ بە دەم
تیا ئەشکایەوە پڕشنگی هەتاو!
گا کناچەی پۆڕ، گا جریوەی مەل.
پێی ئەهاتە جۆش کوورەی شادیی گیان!
سێبەری کرکی ئەکرد بۆ پەنگاو[8]
پۆل پۆل ماسی بوو ئەیکرد جموجووڵ!
شڵپ و هووڕ کەوتە ناو تەنکاوی بوار؛
ئەپژا بارانی دوڕ و مرواری!

(٦)

لە چاخانەکەی «کانی سپیکە»[9] ژانەسەری چا و ئارەزووی تیکە،
ڕاگیری کردین سێ‌چارەک سەعات؛ تونشوو نیوە بوو، وردە[10] دوایی هات.
چای عادەتیمان بوو بە پێنج و شەش، کەمخۆر لە زۆرخۆر زیاتر ئەیویست بەش!
فڕان فڕانی حەڵوا و پەنیر بووا! زرمە و بناگوێی خورما و هەنجیر بوو.
بێزۆر دائەنیشت کز بە نابووتی، «تەق!» گوێزێک ئەیدا لە لووتکەی لووتی؛
بۆ قوازتنەوەی تا ئەکەوتە کار، «زۆردار» لێی ئەفڕان یەکەم پەلامار!
بە هەچ دەردێک بوو نان و چا خورا دیسان بۆ ڕێگا ناوی خوا برا.

(٧)

وا هەتاو گەرمە ڕووی زەوی داخە، ڕێگای ئێستامان بناری شاخە[11]؛
دیمانەت بە خێر یەکەم داربەڕووا! گابەردی لاڕێی لاڵ و پاڵ کەوتووا!
تاکوو ڕزگار بووین لە بناری شاخ، کردینی بە ناو ڕۆژی پرشنگداخ،
بەڵام سەرەوژوور ڕۆیشتین کەم کەم، بای فێنک کەوتە شنەی دەماودەم
بۆنی درەخت و دەوەنی ناو کێو تازەی کردەوە نیوگیانی سەر لێو،
قەمچیمان وەشان سەرەوژوور دیسان، شەق، ناڵ بوو ئەیدا لە ڕێی بەردەڵان!
وڵاخ بە پرمە و هەناسەبڕکێ، بەسەر پلەدا فڕێی ئەدا پێ.
بڕۆ! بەم ڕەنگە، پێچاوپێچ، دەی دەی، ئەمجا لەسەر شاخ تێر ئەڵێی ئۆخەی!

(٨)

تاوێک لامان دا، بۆ پشووی وڵاخ، دانیشتین: پشتەو دۆڵی قەرەداخ
بەردەممان دەشتی سەوزی شارەزوور، شاخ گرتوویە لێی دەوراندەوری دوور!
دەشتی تەخت و پان، دەریای سەوزایی، خاڵ خاڵ تیا دیارە شوێنی ئاوایی.
تاک و تووک دێی دوور دووکەڵی چین چین بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمانی شین!
بووکی تانجەڕۆی ناو دۆشەکی سەوز. ئەترووکێ چاوی شینی بە وەنەوز.
جۆگە وردەکان ئەکشێن سەرەوخوار، ئەبریقێنەوە، وەک توولەی ڕەشمار!
وەر گەڕاینەوە بۆ دۆڵی ئەودیو، شاخ بوو لەسەر شاخ، شیو بوو لەسەر شیو
تەپۆڵکەی، یاڵی، دۆڵی، نزاری: گا شاش بوو، گا چڕ دەوەن و داری!

(٩)

لە «دارمازمڵە»[12] بە پێ چووینە خوار،
کەوتینە سەر ڕێی ناو دەوەن و دار.
ئەمجا تێخوڕە، بڕۆ خوار و ژوور،
لێو وشکی گەرما، ژاکاوی ڕێی دوور!
یەکەم دێی ڕێگات، کە «قارەمان»ە،
هەشت نۆ ماڵێکی ناو دارستانە
هەر دوانمان وەستاین لە بەر چەپەرێ،[13]
پیاوێک دەرنەکەوت جڵەومان بگرێ،
یەک دوو بچکۆلە و دوو سێ پیرێژن،
بە کاسە دۆوە بەرەو پیر هاتن،
لە داپیرێکی سەرسپیی بێدان
تێگەیشتین هۆی چۆڵیی «قارەمان»:
تەمز خەڵقی دێ لەسەر فرمانن،
خەریکی کێشە و شەن و خەرمانن!

(١٠)

ماڵ ئاوابیمان کرد لە پیرێژن،
ڕۆیشتین تا دێ لە چاومان بوو ون؛
نەختێک بە بێ ڕێ نامان بۆ چەپ مل،
لامان دایە ژێر درەختێکی زل
بەردەممان چەم و تووترک و بی بوو،
دەورەمان وەرد و جاڕ و زەوی بوو.
لێی ڕاکشابووین گشت لە بەر سێبەر،
چاو بەستراوێکی فەرەنجی لەبەر،
کوتەکوت دەرکەوت بە گۆچانەوە،
لای دایە لامان بۆ حەسانەوە.
ـ عەلەیکسسەلام! کاکەی کوت و کوێر،
بەم قرچە قرچە ئۆغرتان بە خێر!
بەری دەستی برد بۆ سەر ناوچاوان،
بە دەم ئێشەوە سەری ڕاوەشان،
وتی: دوو مانگە گڵ لە چاومایە.
ڕێی دوور پێوانم بۆ نووشتەی بایە!
یا پیر، بە یەک گەز ڕیش کەی ڕەوایە:
بۆ چاو بێت، لە ڕێ کوێرایی دایە؟!

(١١)

ئێستا بڕیاری کۆمەڵ وەهایە:
بچینە «ولیان»[14] تا فێنک دایە.
سوار بووین، بڕیمان دۆڵاودۆڵی گەرم،
ڕەش داگیرسا ڕەنگ، کارژی دەردا چەرم!
تووڵەڕێ ئالا لە ڕیزە گردێ،
لە بەردەمیا بوو دارتووی زۆر و «دێ»!
ئیتر زەلام و سەگ بوو، ڕاکردن:
پەلاماردان و جڵەو لێ گرتن!
بردینیانە بن کۆمەڵێک دارتوو،
لێفە و بەڕەیان بۆ داخستین زوو!
وەک بەچکەی قولی گوێ ئاگری خۆش،
دەم کرا چوار پێنج مەسینەی حەوجۆش؛
دوو سێ قۆریەی ڕەش پشتێن تەنەکە،
ئەکوڵا و هەڵەچوو ئەتوت کەشکەکە.

چای خەست تێکدرا بەکەوچکی چێو[15]، دەرمانتۆش کرا پیاڵەی لێوان لێو!
ئەپاڕایەوە «مامە، تو خوا بەس!» نەرم نەئەبوو خانەخوێی ناکەس؛
هەر تێی ئەکرد بۆت یەک لەسەر یەکتر، بە پیاڵەی چڵکن چای خەستی وەک قوڕ!

## (١٢)

کە کۆمەڵ ڕێ کەوت بەرەو قەرەداغ، سێبەر کشابوو بۆ پێدەشتی شاخ.
ڕۆژی بەرەو کەل بە پرشنگی زەرد، وارنیشی ئەدا لە بەرڕۆژی هەرد
نەشئەی سێبەری لاپاڵی زۆر خۆش، دەنگخۆشەکانی هێنابنە سەر جۆش!
سۆزی شەپۆلی «ڕۆ... ڕۆ»ی پڕ بە دەنگ، ئەیلەرزان دۆڵی قووڵی سێبەر مەنگ!
بە بەستە و ئاهەنگ ڕێمان بردە سەر، نۆرەمان زۆر کرد بە زەردە و سێبەر،
تا گەیشتینە بەر «باسکە درێژ»[16] کشایە «زەردی ئاوا» ڕێگای لێژ
سێ چوار گەرەکی خانوو کەلاوە شینایی و باغچە چواردەوری داوە.
سەرای گەچکاریی لە چاڵی وەستاو وەک سەرپۆش بەسەر، جوان دێتە بەر چاو.

## (١٣)

چوونە بەر دەرگای مەکتەب دابەزین، ئەمجا «ئەفەندی»ی سەر کورسی و مێزین...
کۆڕی بەر باغچەی مەکتەب گەرم بوو، بەخێرهاتنکەر ئەهات و ئەچوو...
دەستی «سەر چاوان» بۆ سەرسنگ بردن «مۆرە» هەڵدان بوو «گێلە» هاوردن!
کۆڕی دانیشتن تا ئەهات ئەکشا، کورسی جێی چوار بوو دەی تێ ئەترشا!
سەر بوو بناگوێ و دەنگوباس پرسین «کێ مرد لە بەرلین؟ کێ کوژرا لە چین؟»
سوێن ئەخۆین بە بار کە هیچ نازانین، زیاتر سەر دێنێ بۆ زۆرتر پرسین!
ئیتر هەڵڕێژە درۆی ناچاری تا وێران ئەبێ ماڵی لاساری!

(۱۴)

شەو دانیشتبووین گشتمان لە سەریان،
بۆ سەر زەماوەن خولقی ئەکردین،
من لەبەرئەوەی بێ‌ولاغ مابووم،
پاش لێکدانەوەی زۆر و یەک و دوو
ئەمجا دەستم کرد بە کۆمەڵ هاندان،
لەوێوە بووک تا «سەیوسێنان» بردن،

پیاوێک پەیدا بوو خەڵقی دێی دووکان؛
کەوتینە ڕاوێژ: «بچین یا نەچین.»
لەعاستی «بچین!» ترشم‌ئەکرد ڕووم.
کە دیم ولاغم بۆ جێ‌بەجێ بوو،
بۆ ڕۆیشتنی سەر شاییی دووکان،
بینینی هەردوو پەردەی ژن بە ژن!

(۱۵)

بەیانی سەعات دەوری هەشت کۆمەڵ
هەموو جلگۆڕیو، سەر و ڕیش تاشیو،
فەقیانەی سپی و شان و سەڵتەی شین،
ئێستا و تاوێ تر حیلەی ئەسپی شێ،
وای خەریک‌کردم بە خەیاڵەوە
«دووکان» دیاریی دا لە بناری شاخ،
لە خواری دێوە هەندێ کەپری شاش،
کە لەناو کەپران جڵەویان گرتین،
دوو تەختی گەورەی کۆنی دۆشەک‌پۆش
لە بەردەممانا هاوڕێکانی تر،

ڕێ‌کەوت چەن سوارێک ئەمالیش لەگەڵ
لە ئەسپ درابوو ڕەخت و ڕەشوەی زیو.
خۆ لەخشاندنی ناو قەڵتاخی زین
غار و ڕمبازیی تەختاییی لاڕێ
کاتێکم زانی بە قەدپاڵەوە
ژووری ئاش و بی، خواری شیو و باخ
شایی و هەڵپەڕکێی تیادەرئەکەوت باش!
زەردەی لووتکەکان پاش وپێش ئەفڕین!
هەشت نۆ دەیەکی لێ گرتینە کۆش.
بە چۆکا هاتن وەک یەخی حوشترا!

(۱۶)

لەبەر کەپرێکا ڕۆشناییی ئاگر،
شمشاڵ بە ناڵەی لەرە و لەرزەدار
لە دەوری ئاگر حەڵقەی چۆپیی کوڕ
سەرچۆپیکێشی قۆزی چۆپیزان،
لە ژوور سەریەوە دەست و خەنجەری
شمشاڵژەن ئەینا بۆ هەچ لایەک ڕوو
هەر چۆک‌دادان بوو هەڵسانەوە و «هەی!»

دای بە تاریکیی شەوی ناودێ دڕ
دەماندی کوورەی دڵی هەرزەکار
ترپەی پێی ئەهات وەک لێزمەی خوڕ!
پاش هەڵسانەوە و نووکی پێ بادان،
چەشنی چەخماخەی ئاسمان ئەلەری
ئەو لایە کەللەی زۆرتر گەرم ئەبوو.
سۆزی هاواری ئاکا «وەی، وەی، وەی!»[17]

مەستی بێشەراب هەرزەکاران «عیوا»
خەفەت بابردوو دەردەداران «عیوا»

زاوای بەردەرگای ئاواتی دڵ «عیوا»
بووکی ڕازاوەی جوانتر لە گوڵ «عیوا»

حەڵقەی چۆپی «عیوا»، شمشاڵێدەر «عیوا»
ئاسمان، ئەستێرە، دێ، دەشت و دەر «عیوا»

* * *

کوڕگەل! هەمیشە گیان و دڵ شاد بن،
دەست لە ملانی بووکی مراد بن؛

نۆرەی خۆتان کرد، شیرین هەڵپەڕین،
ئاسمانتان لەرزان بە تەوژم و تین!

نۆرەی ئافرەتە ئەمجا هەڵپەڕێ،
سا هێز دەست بەردا، جوانی دەست بگرێ!

(١٧)

که هەڵمانهێنا چاو لە خەوی خۆش،
گزنگی هەتاو دابووی لە «کۆڵۆش»[١٨]؛

لەشکر ڕووی نابوو بۆ دەشتی لاڕێ،
هەر ڕێچکەی سوار بوو ئەملاو ئەولای دێ.

تا دەرچوو لە دێ تارای سووری بووک،
ڕمبازی سارد بوو، تەقە تاك‌و تووك!

بەڵام دیمانەی تارای باشەکێن،
بۆ کوورەی دەروون بوو بە باوەشێن.

لەشکر ورووژا، سوار فرێن فرێن،
کەوتە شوێنی سوار: ئاوزەنگی‌تەقێن!

قرچەی دەستڕێژی دەمانچە و تفەنگ،
ئەشریخایەوە پڕ بە دۆڵی تەنگ!

لە ڕێگوزەری بووکا بەرامبەر
دوو ڕیز: دوو دوو سوار لێی ئەهاتە دەر!

ڕەشسواری ئەبرد شێسوار بە گاڵە
گا بە نەرمەغار، گا بە چوارناڵە!

لیی ڕائەپەڕی لەوبەر کوتوپڕ،
ئەسپسوارێکی کلك و مل جوانگر.

شێسوارا بۆی دەرچۆ سا چنگ لەسەر شان،
چیت کرد باڵدارت لە خۆت خرۆشان؟

(١٨)

نەختێك ڕۆیشتن نەما جێگای غار،
چەشنی مێروولە کشا ڕێچکەی سوار

شنەی بای ناودۆڵ فێنك و عاستەم،
ڕێ لاپاڵی شاخ، لای خواروومان چەم.

سەرانسەری چەم داری ژاڵەیە،
ئەو داوێنەوزی سەرلق ئاڵەیە!

ڕۆژ: ڕۆژی شایی، کات: بەیانییە،
تەبیعەت مەستی بەزەی جوانییە!

بووکی ژێر تارای ڕەنگ‌ئەرخەوانی
شۆخ و شەنگە وەك گوڵی بەیانی!

ئێمەیش «لەشکرین» بۆ خوای دڵداری:
خاتوو زین بۆ مەم ئەبەین بە دیاری!

سا توخوا دەنگخۆش دەی قەتارەکەت،
«کوڵەنجە ڕێ ڕێ» و «هەوری لارە»کەت!

ئاخۆ (کیوویید)[١٩] دیاریی جوانیی
بۆ ژیان ئەوێ، یان بۆ قوربانی؟

(١٩)

لەکلکەی «کۆڵۆش» لەوبەر «دێوانە»،[٢٠]
لەشکـر و بـووکی ئـەولا پـەیدا بـوو،
وەک دوو ئەستێرە دوو بووک لێکیان‌دا:
ئیتر کۆمەڵ بوو بـە دوو دەسـتە، گشت،
ئێمە کـەوتینە دەسـتەی «سـەیوسێنان»،
لەوێ بـەو گـەرما و قـرچـەی نیوەڕۆ،
ئەمجا سوار بوون و بۆ ڕاست وەرگەڕاین،
لەوبەر وشکـەشیو گـەرەکـی گـەورە
لە دەشتی ئـەمبەر گـەرەکی بـچووک
شـاخی کـۆڵۆشی پشـتی «سـەیوسێنان»

بـــە چـەپڵەڕێزان، ئـامان لەرزانـە،
دیسان دوو لەشکر پێکا هـات و چـوو
دەم نـرایـە دەم، دەست لە مـل کـرا!
ئێمەو دوو بووک نا، وەرگەڕا بۆ پشت[٢١]،
تـا گـەیشتینە سـەر ئاوێکی جوان،
دانیشە: حەڵوا و پشیی[٢٢] بـووک بـخۆ!
لە پـێدەشتێکا دێ خـۆی پـێشان‌دایـن،
مـزگەوتێکە و مـاڵ لێـی‌داوە دەورە؛
تیایەتی مـاڵی کـوێخا و زاوا و بـووک!
کەوتۆتە مەعبێن ئـەم دێیە و دووکـان

(٢٠)

خـەوە، خـەیاڵە؟ عـەردە، بەهەشتە؟
پــەلکەڕەنگینەی[٢٣] ئـێوارەی بـەهار
ئـێستا سـەرگەمی ئـیلتیفاتی بـووک
«ئـامان لەرزانـە! هـاڕەی لەرزانـە!»
گـۆرانـیبێژ بـێ و بـچۆ و خـۆت بادە
وەک هەنگ بگـەڕێ و گـۆرانـی بڵێ،
گـوڵ بـە ئاهەنگی «ئامان لەرزۆ کـە»
بـە نـاز لار بگـرە سـەری بێ‌پووشین،
پێچکەی پشتەسەر لەسەر[٢٥] زوڵفی ڕەش
شانی بۆ شـل کـە و خـۆت هـەڵسێنەوە،
با پێچکەی نقێم[٢٦] گورج گورج بە تـاسە

هـەڵپەڕکێی ژنـە یـا هـی فـریشتە؟
لە عەززەت تارای سوور کەوتۆتە خوار،
جموجووڵەتی و هـەڵەپەڕێ سـووک!
بــەستەی هـەڵپەڕکێی بـاڵابەرزانـە.
کـێ ئـەوەندەی تـۆ دەروونـی شادە!
لادە جـارجـارێ بـۆ بـەرپێی گـوڵێ.
پـێیە دابـنێ و پـێیە بـەرزۆ کـە!
با بریقەی بێ کـلاوزەڕ[٢٤] چـین چـین!
بـا بـجریوێنێ وەک ئـەستێرەی گـەش!
سـوخمەی سـەر مـەمک بلەرێنەوە:
لیـو بـنێتە سـەر کـوڵمی هـەیاسە!

* * *

ئـەی گـوڵ وا هـەڵسا گـۆرانیبێژت،
چـاوەڕێم چـەرخـەی نـیگای تـیژتێپەڕ
بـەشکوو لە عـاستم زەبـری دڵـنەرمی
منیش بـەردەرگای حـەڵقەی هـەڵپەڕکێ

هـەڵبڕە چـاوی شـەرمی کـلرێژت!
لە چاوما بکات هەستی ئەشکی[٢٧] تـەڕ!
ئـیتر نـەبڕێ لێت سـەرنج بـە گـەرمی.
بگـرم بگـەڕێم: بـەرامبەر بـە کێ؟

بەرامبەر بە تۆو دوو چـاوی ڕەش ڕەش  که ناز ئەفرۆشن بـە کـەچ‌نیگای گـەش!

**(٢١)**

ڕێـبواری مـانووی چـۆپی‌و ڕەمبازی  تـا کـەی ئـاهەنگ‌و گـۆراتـیبازی؟
جوانی دێ نووستن، زاواو بووک نـووستن،  خەو لۆکەی خـستە نـاو گـوێچکەی بیستن.
دەشت و دەر بێدەنگ، ناودێ بێدەنگە،  بێدار[28] هەر دوانی وەک تۆی دڵـتەنگە
لێو لێک نـێ ئـیتر شـایی تـەواو بـوو،  هاوڕێت سەفەرین لەگـەڵ شـەبەق زوو!
ڕێـی گـەڕانـەوەی شـارت[29] لەبـەرە،  چ وادەی جـۆشی کـەڵکەڵەی سـەرە؟
سـبەینێ کـە ڕۆژ هـەڵهات لە ئـاسۆ؛  ئەدا لە پرچـی «خـاوەن چـاو» بـێ تـۆ؛
ئـیتر تـا مـاوی رابـوورد «سـەیوسێنان»  پێشانی تۆ بـات هـەڵپەڕکێی چـاوجوان!

---

١) شوێنی کۆمەڵ بەپێی بەڵێن و بڕیاری پێشوو.  ٢) چارەوێ: ئەسپ و ماین (بەرامبەر بە خەیلی عەرەبی).
٣) جانێزار: تفەنگی پێنجتیری عوسمانی.  ۴) سەیوان: گۆرستانی بەناوبانگی سلێمانی.  ۵) تەکیە: جێگایەکی دەشت و شینایییە لە ناوەندی گردی سەیوان و شاردا.  ۶) قەرەتۆغان: گوندێکە نزیکی سلێمانی.  ٧) مەبەست لە چەم، چەمی تانجەرۆیە.  ٨) پەنگاو: پێچەوانەی تەنکاو (تەنک ئاو) عاستی قووڵ و مەنگ لە ئاو.
٩) گوندێکە بە رامبەرسلێمانی لە بناری شاخی دارمازمڵە.  ١٠) وردە: وردەی پارە  ١١) شاخی دارمازمڵە.
١٢) دارمازمڵە: بەکەم شاخی ڕێگایە لە سلێمانییەوە بۆ قەرەداغ.  ١٣) چەپەر: دەرگایەکلەشوولک دروست‌ئەکرێ‌وەک‌تەیمان.
١۴) ولیان: دێیەکە بە تەرەتووی باش ناوی دەرکردوە.  ١۵) چێو: دار.  ١۶) بـاسکە درێـژ: نـاوی یـاڵێکە شۆڕ ئەبێتەوە بەسەر (زەردیاوا)ی مەرکەزی نالحیەی قەرەداغدا.  ١٧) ناکا: موختەسەری ناکاو، کتوپڕ.
١٨) کۆڵۆش: شاخێکە لە ناوەندی دووکان و سەیوسێناندا. ڕاستی ناوەکان (کەڵومش)و (سێوسێنان)ە. م.م.ک.
١٩) کیوویید: خوای دڵداری بەپێی ئەفسانەی یۆنانی کۆن.  ٢٠) کلکە: پێچی نیهایەتی شاخ. دێوانە: چەمی دێوانەی ناو دۆڵی قەرەداغ، ئەڕژێتە سیروان.  ٢١) دەستەی دووکان گەڕایەوە بۆ دووکان، دەستەی سـەیوسێنان گـەڕایـەوە بـۆ سـەیوسێنان م.م.ک.. ئێمە و دوو بووکەکە نەبێ، ڕاست ڕۆیشتین و نەگەڕاینەوە بۆ پشتەوە.
٢٢) پشی: کولیچەی بووک.  ٢٣) پەلکە ڕەنگینە: قەوس و قەزەح.  ٢۴) کڵاوزەر: کڵاو ئاڵتوون، هی لادێیی لە زیوە.
٢۵) پشتەسەر، پشتەسەرە: جۆرە خشڵێکە لە دەوری سەر ئەدرێ.  ٢۶) نـقێم: مـەبەست لە نـقێمی پـلپلەداری نیهایەتی مووررووی ملە (ملوێنکە).  ٢٧) ئەشک: فرمێسک.  ٢٨) بێدار: نەنوستوو، بەخەبەر.  ٢٩) مەبەست لە شار سلێمانییە.

## سروشت و دەروون، پێشکەشە

بۆ: خاوەندی ئەو دەروونە ڕوونانە کە دەرسی پێشکەوتن
لە سروشتی جوان وەرئەگرن.
بۆ: گیانـی ڕابـەرەکان و سەربازە نەبەزەکانی ڕاپەڕین!
چ مردوو، چ زیندوو، چ هێشتا نەزاو.
«گۆران»

# پاییز!

پاییز! پاییز!
بووکی پرچ زەرد،
من مات، تۆ زیز[1]:
هەردوو هاودەرد!

من فرمێسکم، تۆ بارانت؛
من هەناسەم، تۆ بای ساردت؛
من خەم، تۆ هەوری گریانت
دوایی نایە: دادم[2]، دادت،
هەرگیز، هەرگیز،
پاییز! پاییز!

پاییز! پاییز!
شان و مل ڕووت،
من مات، تۆ زیز،
هەردووکمان جووت
هەرچەند گوڵ سیس ئەبێ بگریین
ئاڵتوونی[3] دار ئەڕژێ بگریین،
پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگریین،
بگریین.. بگریین.. چاومان نەسڕین،
هە رگیز، هەر گیز،
پاییز! پاییز!

---

١) زیز: عاجز، مات. ٢) داد: عەدل،نا، هاوار. ٣) نیاز لە وەرینی گەڵای زەردی درەختانە.

# هەوری پاییز

لە دەرپاوە قەتاری هەوری بارشت کەوتە دووی پێشەنگ،
بەسەر سنگی چیادا چۆکی داداوە،کش و بێدەنگ
بە سەر پاییزی زەردا با بە خورپ بگری، بە کوڵ بگری،
لەسەر ئاخر گەڵا ، ئاخر چڵی تەنیایی گوڵ بگری!
بە خورپ بگری، بە کوڵ بگری: بەسەر دەشت و دەری وشکا،
بەسەر داری گەڵاڵەردا، بەسەر پووشا، بەسەر درکا،
بەسەر سەرچاوەیی کزرا، بەسەر زیخی چەمی دێما،
بەسەر هەر وشکییێکا وا لە هاوینی گەرم جێما..
بەڵێ بگری، بە کوڵ بگری، هەتا ئاخر دڵۆپ بگری،
بە گریەی هەوری پاییز با نوقوم بێ سینەیی کزری!
بەفر ئاسۆی[1] بڵند بگرێتە چوارچێوەی بلووری،
لە چەم هەڵسێ خورە و هاژەی شەپۆلی ئاوی خوێنینی[2]!
دڵۆپی سارد و فێنک با لەسەر دار و دەوەن بڕژێ،
پەپوولەی[3] زەردی ئاڵتوونی لەسەر لق هەڵوەرێ، بپژێ
بەڵێ! بگری هەور، باراتی پاییز، بێوچان بگری،
لەسەر باغچەی گوڵێ وا سیس ئەبێ ئاخر چڵی عومری!
بگرمێنێ، تەپ‌ونم دابکا، بیکاتە شەست، هەرگیز،
نەوەستێ قوڵپی گریانی[4]، نەوەستێ هەورەکەی پاییز؛
تەبیعەت زەرد و ژاکاوە، لە حاڵی گیانکەنشتایە،
نیشانەی ماتەمی پاییز لە فرمێسکی درشتایە!
١٩٣٣

---

١) ئاسۆ: ئوفوق، مەبەست بەزریی شاخەکانە لە ئاقاری ئاسۆ. ٢) مەبەست لە ئاوی خوێنین ئاوی لێڵە.
٣) پەپوولە.. تاد: مەبەست لە گەڵارێزانی پاییزە. ٤) قوڵپی گریان: واتا کوڵی گریان، وەکقوڵپەقوڵپیمەنجەڵ.

# سەوزەگیای پاییز

**بۆ گیانی بەرزی مەولەوی**

گیا وردەی پاییز، سەوزی نەرمونۆڵ، قەیفەپۆشی ڕووی تەختی خاک و خۆڵ!
دڵگیری، جوانی، بێ دڕک و داڵی، دوا یادگاری بەدیعی ساڵی!
هەچ ئێوارەیەک دیدەنیت ئەکەم، سەمای پاییزم تیا نامێنێ تەم!
مەستی بادەی حەز، پڕ نەشئە و خەیاڵ، ئەسووڕێمەوە لەم پاڵ بۆ ئەو پاڵ[1]؛
ئەنجا دێم، لەسەر سینەی نەرم و شل ڕائەکشێم تاوێک، نوقمی تەئەممول..
تاوێک نەغمەی مەل، تاوێک شنەی با تا ئەودیو شاخی[2] ئەندێشەم ئەبا:
خۆم بە خۆم ئەڵێم: یاران من چیم کرد؟ بۆچ عومری جوانیم وەک پیر بەسەر برد؟
منیش لە دایکی تەبیعەت زاڵم، بۆچ کردەوەی ئەو نابینێ چاوم؟
ها، وا بە سەر چوو خەزانی پیریش، کەچی ئەو زیاتر ئەکا ئارایش!
تازە سەوزەگیا سەرلەنوێ ئەڕوێ، مەل لە ماجەرای عەیش و نۆش ئەدوێ!
تازە سروەی بای قودسیی «عیسا فوو» گیان ئەکاتەوە بەر دنیای مردوو!

* * *

ئەی گیا سەوزەکەی دڵ فەرەحاوی، وەک تۆ سەرگەرمی سەودای هەتاوی،
منیش لەمەوپاش وایە بڕیارم تیژگی خۆر بێ لام نازخەندەی یارم؛
تا گەرمایی ژین ماوە شادی کەم، ئیتر واز بێنم لە ئاشنایی خەم!

---

١) پاڵ: پاسک، بەرزایی تەسک و درێژی شاخ. ٢) نیاز لە دیوی ڕووناک، باری چاکێنی تەفکیرە (تەفائول).

# دیمەنێکی بەهار

ئەملا یەک پەڵە، ئەولا یەک پەڵە: هەوری ڕەنگاوڕەنگ؛
لە ناوەڕاستا: بە دەم ئاسۆوە ڕۆژی شۆخ و شەنگ!
سەوزەگیا پاراو، گوڵ و گوڵاڵە مەستی ڕەنگ و بۆ،
درەخت تازە شین، سەر لق ڕازاوەی گوڵ، گەڵا، چرۆ
سەرتاپای چیمەن دەرئەدا چین چین مرواریی ئاونگ[1]،
چەشنی تارای سەوز ئەدرەوشێتەوە، لێی ئەتکێ پرشنگ
نەسیمی بۆنخۆش، کزەبای فێنک، وەک نەوای ئیلهام
سەمای[2] جوانیی پەریی تەبیعەت دێنێتە ئەنجام!
قاسپە قاسپی کەو، نەغمەی چۆلەکە و بولبولی دەنگخۆش
پیاڵەی نەشئە، حەتتا بە ڕۆحی بەردیش ئەکا نۆش!
وەک بگری بە کۆڵ دنیای سەرمەستی قاقای پێکەنین،
لە هەموو عاستێ فرمێسکی کانیی گەرمی هەڵقوڵین!

* * *

مەلی سەرینچک، پەلوپۆ ڕەنگین! خۆ من هەڵۆ نیم،
لێم مەفڕن جووت جووت، مەترسن ئاخر، پێتان بڵێم چیم:
منیش وەک ئێوە لە دنیای گەورە گەردێکم[3] بچووک،
حەتتا ناشتوانم بفڕم، بخوێنم، بە باڵ، بە دەنووک!
بەڵام وەک ئێوە لە دڵما ئەگرێ مەیلی سەربەستی؛
ئەمەش ئایینم وەک ئایینتانە: هەردەپەرستی![4]

---

١) ئاونگ: شەونم.　　٢) سەما: دانس.　　٣) لێرەدا گەردم لە باتیی «زەڕڕە» بەکارهێناوە.
٤) ئایین: من لە هەموو کاتێکا ئایین لە باتیی دین بەکارئەهێنم.

# شەوێکی بەهار

تاریکە شەوێ: نوقمی ڕەشی چیهرەیی دنیا،
دیلی تەمی ئەسرار بوو دەر و دەشتی حەقایق،
چوویوونە پەنا پەردەیی خەو کەون و خەلایق
موستەغریقی ئەندێشە ئەبوو ساهیری تەنیا!
تاریکی، تەمی دەشتی دڵ و تانەیی سەر چاو،
شاباڵی پەخش کردبوو تاکوو ئەبەدییەت
بێدەنگی لە چوار لاوە موهاجیم وە خرۆشاو،
وەک زوڵمەتی شەو نەیبوو ئەویش نووک و نیهایەت

جار جار لە ئوفوق ڕائەوەشا شیری برووسکە،
گرمەی غەزەبی گوێی کەڕ ئەکرد هەورەتریشقە؛
باران سەرەتای ریققەتی بوو: نم نم ئەگریا،
وەستابوو زەوی تینوو زەلیلانە لە بەریا!
ئەمجا بە خوڕەم باری، لەپاش یەک دوو دەقیقە،
ئافاقی ئەمەل ڕەش بوو، نەما پێوە trووسکە!

تاوتاو لێی ئەدا تەپڵی هومووم تەرزە بە ئاهەنگ؛
وەختێ کە ئەهات حەملەیی با تونگ و خرۆشان،
ئەیرشتە دڵی پیاوی سەبوور کەڵکەڵەیی جەنگ،
هەروەک دڵی خەووافی ئەترسان و ئەلەرزان!

لەمحاڵەتەدا ڕۆحم وەکوو چاوی گلاوی،
ئانێکی بە قەد ساڵێ پڕی زەهری ئەلەم بوو؛
ناگا: هەمیسان نیشتەوە لافاوی تەبیعەت،
ئاهیستە[1]... نەما زەلزەلە و نەعرەیی حیددەت!
کەوتە تەنکی هەوری ڕەش و چڵکنی پێشوو،
ئەلوانی قەزەح تێکەڵی بوو، کون بووە ناوی؛

ئەستێرەیەکی جوانی گەشی پڕ لە تەبەسسوم
دەرکەوت و گەیشت لێوە بە دڵ زەوقی تەماشا
بەحری هەوەس و شەوقم وەها هاتە تەلاتوم[2]:
بۆسەیری جەمال کردنی دنیایی بەیانی،
هێشتا شەوی زۆر مابوو کە من کەوتمە سەحرا،
وەک شێت... بەڵام شێتی شیعر، شێتی جوانی!

---

١) ئاهیستە: بەئەسپایی، لەسەرخۆ. ٢) تەلاتوم: شڵەقان و شەپۆلدان.

# ئەی گەلاوێژ!

بەشەوگەشت وگوزاری خاتیرات[1] هەروەک شنەی شەوبا،
لە ڕۆحی پڕتەئەسسورما ئەکا سەمەرەی خەفەت بەرپا؛
ئەڵێی بەحرێکی قووڵ و مەنگە دنیای پڕلە بێدەنگی،
بەسەریا هاژەهاژ ئەڕژێ ئەنینم[2] سۆزی ئاهەنگی!
هەتا سەر ڕووی زەوی چین‌چین نەوبوە پەردەیی تاری،[3]
لە خۆیشم دیار نییە وێنەی دڵۆپی ئەشکی[4] بێداری!
دڵم وا گێژ ئەدا گەرداوی یەئس و نائومێدیی ڕەش،
مەگەر تۆ بێیتە ئیمدادم، گەلاوێژ، ئەی ستارەی گەش!
مەگەر تۆ، ئەی گەلاوێژ، ئەی بزەی لێوی سەحەرگاهان،
مەگەر تۆ بسرەوێنی قووڵپی ئێشی قەلبی بێ‌سامان!
لە چاوی تۆوە پرشنگێ ئەگاتە ڕۆحی بەدبەختم،
ئەکا مەستی تەسەللی تا شەوی دوایی سەری سەختم!
دەسا ئەی شا ستارە، ئەی گەلاوێژی گەش و تابان[5]،
کە هەڵهاتی بە ئەگریجەت بشۆ چاوی شەوی گریان!

---

١) خاتیرات: زیکرەیات، یاد. ٢) ئەنین: ئاخ و ناڵە. ٣) تاری: تاریکی. ٤) ئەشک: فرمێسک.
٥) تابان: شەوقهاوێژ، ڕووناک.

# بەسەرهاتی ئەستێرەیەک

بانگی شێوان: لە ئاسمانی خۆرنشین،
دەور و پشتی دەریای شینە[1] و بەتەنیا
لە پرشنگیا هەیە شێوەی چاوی کاڵ،
وەک ئەو گوڵەی ئەیدا لەسەر نازدارێ،
منیش یەکێ لەو تەماشاکەرانەم،
لەسەر گردێ بەرامبەری ئەوەستم،
تاریک دایە.. ئەستێرەی تر بەر و دوا
بەڵام ئێستا ئەو ئەسپایی، بەرەوخوار
لێوی تینووی کەل وەک دڵۆپ ئەیمژێ،
ئەم ئەستێرە، بەسەرهاتی دڵگیری

ئەستێرەیەک ئەجریوێنێ: گەش، شیرین!
سرنج ئەدا لە ئێوارەی ڕووی دنیا!
لە لەرزینیا زەردەخەنەی لێوی ئاڵ!
تیر نابێ لێی هەر چاوێ بۆی ئەنوارێ!
دڵ گیرۆدەی ئەم جوانیی ئێوارانەم؛
کەیلی بزەی[2] ئەبێ سرنجی مەستم!
فرێ ئەدەن چارشێو[3] لە عاستی دنیا
هەڵئەخلیسکێ، کز کز، ئەگاتە لێوار؛
ئەی داخەکەم، مەرگی نیشتن ئەیکوژێ!
لە کام ڕۆحا نابزوێنێ سا زویری؟![4]

---

١) مەبەست لە دەریای شین دەریای ئاسمانە.　２) بزە: زەردەخەنە.　３) چارشێو: پەچە.
٤) زویر: وەکوو زیز، واتە عاجز و مات.

# دارچوالەی پشکووتوو

## لە گەڕانەوەدا بە چەمی قلیاسانا

لەپـاش بـڕینی مـاوەیەکـی دوور، گـیانی وەڕسـی ڕێگـای سەرەوژوور
دی: «پـاس» کشایە نـاو پێچێکی لێژ؛ لای چـەپ: چـناری بـاریک و درێژ
ڕەپ ڕ اوەسـتابوون لە کـەناری ڕێ، سەربازی پاس بوون بۆ پشت سەری کێ؟:
ڕ یـزێک نـەمامی دارچـوالەی نـازدار کە ڕێک وەستابوون لەسەر گیای بەهار
وەک بووک ئەندامیان لە سووراو نـابوو، لەنجەی تـاو تـاویان بـۆ چەپەی بـا بـوو
پەڕەی هەڵاڵەی چـوالەی سـووراوڕەنگ جار جار ئەوەری بە خشەی پێی هـەنگ،
هـەروەک پـەپوولەی بـاڵ فـڕەفڕکەر ئەنیشتە سەر یەک لەسـەر گیای سێبەر!
لەگـەڵ لێشـاوی پـەڕەی گـوڵ بـارین: با بوو شەپۆلی «بۆنخۆشی»ی چین چین

* * *

چـەمی تـانجەرۆی سـەردەمی نیسان پڕە لە وێنەی سروشتیی جـوان جـوان؛
بـەڵام مـن چـاوم گێڕا خـوار و ژوور، لە ڕیـزە داری چـوالەی تـارا سـوور
جوانـترم نـەدی وەک بـووک وەستابێ، سـەیرانگـای چەمی وا پێ ئـاوا بێ!

# بەهاری پاش باران

وشکەچەم وەک جەوری سەردەم هەڵساوە؛
بەرگی سەوز و نەرمی بەهار ژاکاوە.

هەر هێڵی گیاسنی وەردی کێڵراوە
هەتا چاو بڕ ئەکا جۆگەلەی ئاوە.

جووتیاری نەقیزەی درێژ سەرشانەر
بەرەو ماڵ لەقەلەق گای داوەتە بەرا!

تا ئەژنۆ لە قوڕدا و کەپەنەک بەسەر،
بۆ ڕانی تەریوی هەڵپە و خەم‌لەبەر،

مامەی شوان، وەکوو خۆی، بەرخی باوەشی
تەڕتەڕە و هەڵدەستێ هەڵم لە لەشی!

کچانی کۆڵە گیای کولاندن بە کۆڵ
ڕووەو دێ ڕەویون وەک مامزی چۆڵ.

لە ناو هەڵکشاوە پەل و پۆی باڵدار،
ڕەنج ئەدا فڕەفڕ تاگاتە سەر دار.

تەلانی ناو باخی پڕ فەرشی گیای سەوز
لێلاوی بارانا و کردوویە بە حەوز؛

لە لیواری حەوزا گوڵاڵە و بەیبوون
ساوان و ئەلەرزن لە تاو نوقوم بوون!

درەختی هەڵووژەی بەفر داپۆشیو،
دارستێوی ڕازاوە بە پۆیلانەی زیو،

هەلاڵەی وەرانهوون تەوژمی باران،
وەک بووکی ڕووتکراو کەوتوونە گریان!

لە بەرێی نەمامی چواڵەدا سەوزاو
لە ڕوومەت تکاوە ڕژاوەتە ئاو.

گوڵباخی گەشاوەی گەلا تێکشکاو
بە کوڵمیا دێتە خوار ئارەق لە گوڵاو،

وەک یاری شەرمنی دەس لە مل ئالاو
بە گوپچڕ دەربازبووی شانە و قژ شێواو!

* * *

ئەمەیە دیمەنی پاش وەشتی نیسان:
پێشێلی ستەمەگشت شتێکی جوان،

تا هەوری ڕووی ئاسمان دڕ ئەدا و هەتاو
ئارامی شیرینتر ئەخاتەوە ناو!

# تازە؟

کە شەو هاتو پەردەی ڕەشی کەوتە سەر
جوانیی تەبیعەت، کەژو دەشتو دەر
هەموو نووست، هەموو مرد، کش و بێ ئەسەر:
سەما، تازە جیلوەی ستارەی نەزەر؟

کە گوڵباخ، نێرگس، زەمەق، یاسەمەن
هەموو نوقمی بەحری تەمی ئەم شەوەن؟
هیلاکی گروشمەن[1]، وەنەوزێك ئەدەن:
سەما، تازە جیلوەی ستارەی نەزەر؟
کە کپ بوو قەراغی چەمی پڕ لە قاز،
لەسەر ڕووی نەما زینەتی ئیهتیزاز؛
لەسەر لێوی لاچوو بزەی نووری ناز:
سەما، تازە جیلوەی ستارەی نەزەر؟

کە دڵ کەوتە ناو دۆزەخی دەردەوە،
کە عیشق و شەبابی خوا بردەوە،
گڕی شاعیرییەت کە دامردەوە:
سەما، تازە جیلوەی ستارەی نەزەر؟

---

١) گروشمە: کریشمە، ناز و عیشوە.

# بێدارییەک ...

ژوورم تەنیا و دنیای بەر پەنجەرەی ژوور،
دارستانی سەروە و سنەوبەری سەوز
ئەی بولبولی شەبەقی شەو! بخوێنە،
با بە زەبری مەستیم بە ئاوازەی نوێت!
ئەگەر عەشقی هونەر، وەک تۆ، ئەی بولبول،
منیش وەک تۆ، خەوم ئەخەمە ژێر پێم،
بە لای لەشی سپیی پەیکەرەکانا
ئەشێلم گیای بن داری نوقمی ئاونگ،
بە شەپۆلی گەڵای سەوزاکە ڕوانیم،
وەک شووشەی عەتر وشەکانی هەڵبەستم
ئەوسا مەگەر، زاتێک بنێمە بەر خۆ،

بە چواردەوری باخچەی کۆشکا، هەتا دوور،
شەو ڕووناکە و چاوم یاخی لە وەنەوز
هەستی «جوانی پەرستی»م بورووژێنە
وێڵی دارستان بم کاتێک: خەڵک ئەنوێت!
لەناو ڕەگما لەگەڵ خوێنا بدا پل،
دێم بە چڕی دارستانا ئەگەڕێم.
تێپەڕم، دەستی چەپ لە گیرفانا،
بای دارستانلەرزێن ئەمژم پڕ بە سنگ
سۆزی لەرەی نوێ ئەچێتە گۆرانیم؛
ئەگرن بۆنی گوڵی لەیلاخی دەستم
دەم لە جوانیی تۆ بەم هەواری مۆسکۆ!

هەواری بەرڤیخە
١٩٦٢/٦/٦

# ئاخ، هەزار ئاخ ...

ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ! تا قیامەت ئاخ و داخ!
من کە سنگم بەردە، تەبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ؛

من کە خوێنم ئاگرە،
چوونە جۆشم حازرە،

من کە مایەی فەخری تەئریخی بەرووم،
تاقە ڕەنگی ئابڕووم

مەردی، بێباکی، دلێری بوو هەموو...
کوا؟ مەگەر ئەسڵی نەبوو؟

بۆ سەرم نەرمە لە عاستی بەندی دیلی، داخەکەم؟
بۆ لە نزمی و پەستییا وەک گۆمی لووتە[1] شاخەکەم؟

ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ!
نەگبەتیی کوردی هەژار، ئاخ!

بۆچی ئەو سنگەی سپەر[2] بوو بۆ بۆ پەلاماری عەدوو
بوو بە پەردەی سەر قەفەز بۆ دەربڕینی ئارەزوو؟

بۆ زوبانی بێگرێم
نایەڵێ سەربەست بڵێم:

ڕێبوارم، سەربەخۆیی کەعبەمە؛
دەشتی خوێن گەر ڕێگەمە،
بێخوتوورەم، بەردەبازم کەللەیە،
تا ئەگەم بەو قیبلەیە!

بۆ نەهاتە سەردەمم ئەم چەشنە گوفتارانە قەت؟
بۆ نەبوومە پاڵەوانی کردەوەی ئازانە قەت؟

ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ!
غیرەتی کوردی هەژار، ئاخ!

ئەی، ئەوەی قەومانی بەش بەش کرد بەپێی خاک و زمان،
دای بە هەر قەومێ نگین[3] و تاج و تەختی حورِ ژیان!

کوا نگینی بەختی من؟
کوانێ تاج و تەختی من؟

بۆ لە خاکی پاک و زاری بێگرێم،
غەدر ئەکەی؟ نابەخشی پێم؟

یا ئیلاهی حەققی خۆم داوا ئەکەم:
کوا نگین و تەختەکەم؛

بۆ لە عەرشی دادپەروەر، بۆ دڵی کوردی هەژار!،
تاقە تیرێکی ستەم عەکسی بکات و بێتە خوار؟

* ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ!
خالیقی کوردی هەژار، ئاخ!

---

١) گۆمی لووت: بەحری مەیت لە فەلەستین کە لە رووی دەریا زۆر نزمتر کەوتووە. ٢) سپەر: قەڵغان.
٣) نگین: ئەموستیلە، مۆر.

# ئیلهامی «هاوار»

## بۆ مەفکوورەی بەدرخانییەکان

دەروێشـێکم دی لەسـەر دەخـمەی شـا — ـ شای سەلاحەددین ـ بەکوڵ ئەگریا؛
هـاواری ئـەکـرد، ئـەیلاوانـەوە! — دڵـی ئـبنانی ئـەتاوانـەوە!

* * *

دەروێش میرێک بوو خێوی تەخت و تاج — چەرخ لێی وەرگەڕا کەوتە بەر تاراج
ئەی چەرخی غەددار، ئەفسەربازیچە، — بـە حـەسیرگیری فـەرش و قـاڵیچە،
سـەری ڕاهـاتووی تـاجی سەربەستی — کـەی ئـەنەوێ بـۆ زیـندانپەرستی؟
سـنگێ کـە تـەختە جـێگای ئارامی — کەی قنیات ئەکا بە بای ناکامی؟
وەک شێر نرکانی، وەک ئاگر هەڵچوو — زنجیری پچڕان، لە زیندان دەرچوو!
گەلێ هەڵمەتی برد بۆ پێچکەی تەخت — بـەڵام نـەخوسا بەردی دڵی بەخت،
گەلێ کێشای دەست بۆ جقەی ئەفسەر — بـەڵام نـاوچاوی نەینووسی زەفەر!
سەری خۆی هەڵگرت، ڕووی کردە شاران — توێشووی ڕێی تەنیا عەشقی کوردستان!

* * *

ئـێستا لە دەشـتی شـام لەسـەر قـەبری — بـاپیری گـەورەی، بـۆ وڵات ئـەگری،
بـۆ وڵات ئـەکـا شـیوەن و هـاوار... — کوردە غیرەتێک زینهار! سەد زینهار!
بـەکـۆمەڵ بگـرن گـوێ لە هـاواری: — کـۆمەڵ جـەلب ئەکا ڕیققەتی باری!

گۆڤاری «هاوار»
ژمارە ۱۰، لاپەڕە ۵
۱۹۳۲/۱۰/۲۳

# کوردستان

کوردستان: جێگامی، جێی هەزارساڵەم؛
پەروەردەی ئەم دۆڵ و سەرلووتکە و یاڵەم!
هەناسەم تێربوونی بای کوێستانتە،
دوو لێوەم پاراوی بەفراوانتە،
سرنجم ڕاهاتووی زیوی زەرکەفتە،
بە زەردەی سەر بەفری ئێوارەوەختە؛
گوێم فێرە بیستنی خوڕەی قەڵبەزە،
لەو عاستەی ژوور بەفرە، داوێن گیای سەوزە؛
زمانم پشکووتووی قسەی جوانتە،
قسەی ناو گۆرانیی شاخەکانتە،
هێی ناو چیرۆکی گوێ ئاگردانتە،
هێی ناو لایەلایەی مناڵانتە!
قوڵپێ بسا خوێنی ناو دەمارەکانم،
بە زەبری عەشقی تۆ ئەیدا، ئەزانم!
عەشقی تۆ، ئەی دایکی خۆم و هاوخوێنم،
هەر لە پشتی باوکا چووە هەوێنم،
ئەشچێتە هەوێنی کوڕ و کوڕەزا،
تا تاقێ کورد مابێ لە چیای بەرزا!

* * *

کوردستان: ئەگەرچی دوورە دنیای تۆ،
دۆڵ و دارستانی چۆڵ و تەنیای تۆ؛
دووری لە شارستان، لە ژینی تازە،
لە شەوی ڕووناک و پڕ لە ئاوازە،
پڕ لە پێکەنین و پڕ لە نەنوستن،
پڕ لە سووڕانەوە و پڕ لە کۆڕبەستن...
ئەگەرچی تۆ دووری لە ڕۆژی شاران،
ڕۆژی پڕ لە گەردش، هاتوچۆ و جووڵان،
ڕۆژی پڕ لە زانست، پڕ لە فەننی جوان،
کتێب و ڕۆژنامە، هەیکەل و مەیدان!
ڕۆژی پڕ لە خۆراک بۆ گیان و بۆ لەش،
ڕۆژی پڕ لە ئافرەت، پڕ لە باغچەی گەش...
ئەگەرچی تۆ دووری لەم گشت جوانییە،
جوانییەکی تر هەیە کوردستانییە:
جوانییەک کە دەستی هونەری یەزدان
نەخشی کێشاوە، نەک سەلیقەی فەنان!
جوانییەک: کۆن نابێ هەرگیزاوهەرگیز،
زستان و بەهار و هاوین و پاییز:
جوانیی شاخی سەخت و دۆڵی قووڵ و مەنگ،
ملەی[1] بەرز، پلەی خز، دەربەندانی تەنگ،
مێرگی سەوز، چەمی خوڕ، دارستانی چڕ،
دێی بناری دەشتی پەناگردی خڕ،
دەعبای ناو ئەشکەوت و ماسیی گۆمی شین،
باڵداری ڕەنگاوڕەنگ، پەپوولەی نەخشین!

* * *

بەڵێ! ئەگەر بێت و ڕۆژێ لە ڕۆژان،
لە کۆشتا لێکبدەن جوانیی هەردووکیان،
ئەو حەلە سەرانسەر ئەبێتە بەهەشت،
لە لووتکەی شاختەوە تا پانتایی[2] دەشت!
کوردستان، کوردستان، کوردستانی جوان!
درەنگیش بێتە دی ئاواتی گۆران

دەربەست نیم، سێبەری پیرەدار بەڕووم،
ئەو تاوەی ئەشکێنێ تاسە و ئارەزووم:

کە ماویە ڕۆژی زەرد بگاتە دەم کەل،
لای ژووررووی سەرتەوە ئەجریوێنێ مەل؛

پۆلی ژن، زەرد و سوور، ئەکشێ بۆ ناو ڕان،
شوان ئەڵێ بە شمشاڵ: «هەوری لار، ئامان!»

بەڵام ئەگەر بێت و بە دوو چاوی خۆم
بتوانم ببینم بەری هیوای تۆم،

ئەو حەلە: کوردستان، کوردستانی جوان،
هەڵپەڕین لە من و بەستە لە ژیان!

---

١) ملە: لووتکە، جێگای بەرز لە شاخ.   ٢) پانایی: تەختایی، ناوەڕاستی پانایی.

# جەژنی نەورۆز

بــە ســوورِێکی تر ئـەستێرەی ئینسانگر[1]،
کام قەومی کۆن، کام جەژنی بەرز و پیرۆز؟
ئــەو نــەورۆزەی کــە هــەزاران بـەهارە،
بــاوباپیرمان، هــەتا ئـەڕۆن پشتاوپشت،
لە چواردەوری ئەم ئاگرە: ڕەنگـاوڕەنگ
بــانگی شـێوان هــەتاکــوو بـەربەیانی،
لەوســایەوە، تــا ئـێـستاکــە بـەمچەشنە:
میوانی کۆن بـە ڕێ ئـەکـەین و تـازە،
خـۆشیت هـێنا و فـەڕت هـێنا و شـیرینی..
بە هاتنت بای بـەستەڵەک، بـەفری دەشت،
لە تــاریکی، لە چــواردیــواری زسـتان،
ئێستا ــ ئۆخەی! ــ ئاسمانێکە و هـەتاوێ،
چی خۆشترە لەوەی تـەبیعەت جـوان بـێ،
گیانی سەرمەست، باڵداری ڕێی هـیوا بـڕ،
بــفڕێ، بــڕوا بــۆ کــوردستانی ئـاوات،
هەتا ئەگاتە لووتکەی شـاخی سـەربەست،
قــەومی کـۆنی خــتەوە جـەژنی ئـاگـر،
قـەومی مـادی! جـەژنی بـڵندی نـەورۆز!
لە دێــی کــوردا گــڕی ئـاگـری دیـارە،
لەم ئاگرەیان دەورە داوە، چین چین، گشت!
کــۆڕ گــیراوە، بـە پـێکەنین و ئـاهەنگ؛
چۆپی بووە و بەزم و نـۆش و گـۆرانـی!
هــەموو ســەری سـاڵی تـازەمان جـەژنە؛
بــە پـێکەنین ئــەگــاتە بــەر دەروازە!
تــۆ بــۆ ئـێمە بــەهەشتی خــەوبینینی!
گیانی سپارد؛ گـوڵی ڕوا جێگای گـەشت
سەرفەراز بیت، سەرفەراز بوو مـەلی گـیان!
گیایە وگوڵە و مـەلە و خـوڕەی چـەماوێ
ماوەی سرنج پـانایی گشت ئـاسمان بـێ؟!
بــەرز بــێتەوە بـە پـەڵەی هـەور بـدا دڕ؛
ماندوو نەبێ، هەر بڕوات و هـەر بڕوات
بێزنجیری گـەل ئـەبینێ و ئـەبێ مـەست![2]

---

١) مەبەست لە کەوکەبی ئەرزە کە ئینسانی تیا ئەژی.

٢) مامۆستا گۆران، ئەم پارچە هەڵبەستەی لە ١٩٥٣ دا بەمجۆرە لە «ژین»دا بڵاوکردۆتەوە، بەڵام پێشان دواشیعری بەجۆرێکی تر و چەند شیعرێکی تریشی لەگەڵ بووە. وا لێرەدا جۆری پێشووی دواشیعر و شیعرەکانی پاشەوەی ــ بۆ خاتری مێژووی بیرو ئەدەبی مامۆستا گۆران ــ ئەنووسینەوە:

هــەتا ئــەگــاتە لووتکــەی شـاخی سـەربەست، تـاج ئەبینێ و تێر ماچ ئەکا پێچکەی تەخت!

* * *

ئـەی جێی هیوام، ئەی جێی خەوی بێداریم، ئــەی ڕۆشــنیم، ئــەی جــەژنی یـادگاریم!
هــەزار ســوپاس، هـەزار دروودی بـێدەنگ، بــەڵام بـەکـوڵ، بگـا بـە گـیانی هـۆشەنگ،
«هــۆشەنگی بــاپیری ئــێمە و ئــێرانــی، داهــێنەری بــنچینەی ئــاوەدانــی!»
کــە مـاری کـوشت و بـەردی دا لە یـەکـتر، پــزیسکی دی و ئــیتر تــەلیسمی ئــاگــر،
بــە کــەڵکی خــۆیەوە بـە تـۆوە «نـەورۆز»، بــوو بــە فــەڕ و ڕژایــە ژیــنی پــیرۆز!

شایانی وتنە مامۆستا گۆران ئەم پارچە شیعرەی بۆ «ڕەشید نەجیب» نووسیوە. م.م.ک.

# دیاریی خوای شەڕ

دیاریی خوای شەڕ: خەشمە و قینە، دوشمنیە و رقە و کینە،
بەدخواهیە و نیهادی پیس: باری لێکدانەوەی ئیبلیس!
دیاریی خوای شەڕ: پڕ بە دڵ ترس یەک زمان و سەد هەزار پرس؛
گومان لە ڕاست، بەڵام باوەڕ بە درۆ: «ئاخ، دیاریی خوای شەڕ!»
دیاریی خوای شەڕ ڕەنجە و ئازار، مەرگی لەشکر، وێرانیی شار؛
بۆ دایک: تاقانە کوشتن، بۆ کۆرپەی ناز: هەتیو خستن!
خوای شەڕ ئینسان لە هاوجینسی ئەکا بە گورگێکی برسی؛
ئاگر، قورقوشم، غازی خنکێن[٣] ئەداتە دەستی و پڕ لە جوێن
ئەکا دەمی و پێی ئەڵێ: عەرش! بۆ بن دەریای تاریکو ڕەش،
بۆ ناو هەور و برووسکەی بەرز، بۆ جێی دوور دوور لەسەر ڕووی ئەرز...
عەرش! وەک دڕندە، وەک هار عەرش! دنیا ڕەنگ کە بە خوێنی گەش!
پەلامار دە، دەستوبرد کە، بگرە، ببڕە، بدڕە، ورد کە:
قەڵا، تەلبەن، شوورا، سەنگەر؛ حەیوان، ئینسان، شاری، عەسکەر،
ژن، پیاو، پیر، جوان، دەست، قاچ، سنگ، سەر... پێشێل کە هەرچیت دێتە بەر!
بێسووچ بکوژە، سەربەست دیل کە، دەرگای مێشک و دەم کلیل کە،
کۆمەڵ برسی، وڵات لات کە، نەخۆشی زۆر، دەرمان قات کە،
قوتابخانە، بیمارستان، کۆگای فەنکردی کۆن و جوان،
شوێنی بەکەڵک گشت خاپوور کە، بنچینە و بان خوار و ژوور کە!
دەزگای شارستانی تێکدە: ئەمرۆ ڕۆژی مەحشەر لێکدە!

---

١) غازی خنکێن: خنکێنەر، غازی موخنیق.

# ڕۆڵەی بێ دایک

نە ئاخ لە سینەدا ئەخواتەوە پەنگ،     نە فرمێسک ئەتوانێ بڕژێ بە بێ دەنگ
نە زمان ئەوەستێ لەمە زیاتر،     نە قەڵەم وەک لاشەی مردووی سارد و سڕ
نە فام لە جێگای خۆی ئەمێنێ، نە هۆش؛     دیمەنێ من بینیم بەرد دێنێتە جۆش
کێ دایکێ ئەتوانێ بێنێتە بەرچاو،     بە مەرگی تاقانەی جەرگی هەڵقرچاو،
دامایێ لە دەشتێ؛ هاواری بە کەس ـــ     نەگا هیچ، هەر خۆی بێ و مەیتی کوڕی و بەس!
ئا، سەیری دیمەنی وەها کاریگەر     کام ویجدان ناداتە بەر نووکی نەشتەر؟!
بەڵام ئاخ، ئەوەی من دیم بەم دوو چاوە     مەینەتێکی سووکە ئەمەی بەلاوە:
نەک دایکی کوڕمردوو، دیم کۆرپەی ساوا     لای مەیتی دایکیا، فرمێسک لە چاوا،
کەوتبوو بە بێ شیر، بێ لاوانەوە،     ناو جەرگی ئینسانی ئەچووزانەوە!

•

# ناڵەی بێکار

تـــا هـــێزی بـزووتن لە لەشـما بـە گـوڕ بـوو،
مـن کـوڕ بـووم بـۆ ئـاغا و ئـاغا بـاوکی کـوڕ بـوو؛
لە «مـــاندوو نـــەبوون»ی سـەرایشـم واقوڕ بـوو،
عـــــەماری لە بــەری تـــەقەلام پـــڕپڕ بـــوو
«نـــامەخوا!» و «ئـــافەرین!» ســەری لێ شـێوانـم،
دڵســـــۆزی بــــۆ ئـــاغا ئـــەوەندەی ڕەتــــانم:
تـــا ڕادەی ئـــەوپەڕی شـــەکـــەتیی گـــەیانم!
پـــەکـم کـەوت.. نـەخۆشی لەشــی تـێکشکانم!
نـەخۆشی نـاوجێ بـووم: بـێ شـۆربا، بـێ دەرمـان،
بـۆ زمـان تـەڕکـردن «نـەختێک ئـاو!» ئەمناڵان،
بەر گوێم کەوت باوکی کوڕ «نەک ئێستا، هـیی جاران!»
قـــیڕانـــدی: بــــۆ نـایەن فـڕێی‌دەن لە کـۆڵان!
ئـــەو دەســـــتەی لە کـــۆڵان گـەیشتە فـریای مـن
دەســـتێ بـوو بـە تـۆز و عـارەقی ئـیش چـڵکن؛
زۆر دوور بـوو لەو دەسـتە خـاوێنەی وەک هـیی ژن،
پـارووی چـەور ئـەگـلێنێ بـێ‌ڕەنجی ئـیشکردن!
ئـــەو دەســـــتە چـڵکنەی دوولێـوەی تـەڕکـردم،
دڵـــۆپی فـــرمێسکی کـــەوتە سـەر ڕووی زەردم،
بـــە قـــووتی دەمــــی خـۆی ڕایگـرتم نـەمردم:
ڕەنـجبەر بـوو، نـۆکـەر بـوو، هـاوپیشەم، هـاودەردم!
تـــا ڕۆژی کـــەوتنم گـــەیشتە شـەش و حـەوت،
ژوورســــەری بـــەرنەدام هـاودەردی بـێ‌سرەوت؛
بـــە زەبـری دڵســۆزی ئـەوەندەم نـزیک کـەوت:
پـەتاکـەم[1] تـووشی بـوو لەلامـا ئـەویش خـەوت!
وا ئـــێستا ئـــەوکـەوتوو، مـن لە جـێ هـەڵساوم،
کـــوناوکون ئــــەگـــێڕم لەشــی تـــێکشکاوم؛

لە فرمان ئەپرسێ: زمانم، گوێم، چاوم
بۆ قووتی ڕۆژی خۆم، هیی هاوڕێی داماوم!
فرمانێک، قەی ناکا قورسیش بێ بە شانم،
لەژێریا لێک دەرچێ گشت جومگەی ئێقانم،
هەر تیا بێ چەن فلێک، هیچ نەبێ بتوانم:
نان بکرم بۆ خۆم و بۆ هاوڕێی نیوگیانم!
فرمانێ، ئەی کۆمەڵ! فرمانێ، فرمانێ
بۆ دەردی بێکاری چارەیەک، دەرمانێ،
زۆر شەرمە لە چەرخی بیستەما ئینسانێ
بێئیش بێ و سکی خۆی هەڵوشێ[2] بۆ نانێ!

---

١) پەتا: وەبا، نەخۆشیی ساری. ٢) هەڵوشێ: هەڵگوشێ.

# بۆ هیوای کوڕم

هیوا، مەگری، هەنسکی نیوەشەو بەس هەڵدە، بەس بگری!
لە چاوی بێقەرارم بۆچی دەرمانی وەنەوز ئەبڕی؟
کوڕی خۆم! کۆرپەڵەم! میوانی دنیای تازە خوڵقاوم!
ئەداگریەت بە زەربەی چز، لە ڕۆحی پڕگلاراوم!
چییە ئەم گریە بێغایە، کڕووزەی نیوەشەو خوڕپێن؟
چییە ئەم قەترە وردانەی لە چاوت بێمەئال ئەڕژێن؟
لەگەڵ ئەو غونچە ساوایەی لەسەر خەڵفی بەهار ئەڕوێ
چییە فەرقت؟ لەبەرچی ئەو هەتاکوو سیس ئەبێ ئەنوێ؟
وەکوو ئەو بەرخە بچکۆلەی کە هەر ئێستا لە دایک بوو،
لەبەر چی نەشئەیی یاری هەڵتناداتە سەر پاشوو؟
ئەڵێی ئەو زەڕنەقووتەی[1] پەپکەمارە فەرشی هێلانەی:
چ ئیشێکە، کوڕم، بۆچی لەسەر ئەم هەڵکڕووزانەی؟
چییە توخوا؟ چ سیڕڕێکە وەها مەحکوومی گریانی،
کە تۆ هێشتا لە خەم ناگەی؟ لە مەعنای گریە نازانی؟
ئەگەر وەک باوکە حەسرەتدیدەکەت زەهرت بچێژایە،
زەمان گەردی ئەمەلتی گشت بە دەم باوە بپێژایە؛
لە ناو کلپە[2] و بڵێسەی نائومێدی و حەسرەتا یەکسەر،
بسووتایە بەهاری عومری جوانیت: هەم گوڵ و هەم بەر!
بەڵێ، ڕۆڵەم، ئەگەر وەک من کەمێک بەدبەختیی ئێدراکیش،
لە تۆیشی ڕەش بکردایە، نەوەک شەو، ڕۆژی رووناکیش،
حەقت بوو عەرش بلەرزێنی بە ناڵەی ڕۆحی پڕئێشت،
لە ئەستێرەی سەما بپژێنی فرمێسکی دڵی ڕێشت!
حەقت بوو ئەم هەموو گریانی نامەفهووم و بێمەعنا:
زمانی بەست و تەقریری شکاتت بێ لە دەست دنیا!
حەقت بوو بێوچان بگری بەسەر تاوانی باوکیما،
بەحر پڕکەی لە تف، بیدەی بە ناوچاوانی باوکیما!

بەڵام، ڕۆڵەم، کە تۆ ئێستا لە فەجری زیندەگانیتای،
لە بەر دەرگای تەلیسمی بەختی مەجهوول و نیهانیتای،
بە چی مەعلووم بە شوێنی هیی منا ئەڕژێ چەمی عومرت؟
سەراسەر پێکەنین و خورڕەمی نابێ خەمی عومرت؟
بەڵێ، بەرخم! ئەگەرچی هەر وەکوو یەک ژینی گشت لایە
لە بەینی بێشکە و قەبرا، بڕینی عەینی ڕێگایە!
هەموو هەر قافڵەی بێ ئیختیاری سەرزەمینێکین
هەموو دێین و دەڕۆین، تاکوو ئەگەین، یەعنی ئیتر ئەمرین،
وەلێ[3] کۆچی ژیان کۆچێکی پڕسیحر و پڕ ئەفسوونە:
لە یەک سەرچاوە دوو قەترە: یەکێ لێڵە، یەکێ ڕوونە!
هەیە وەک من بە سەر دڕکا ئەنێ هەنگاوی ئاوارە،
هەیە هی وایش کە فەرشی ژێری پێی ئاوریشمی گوڵزارە!
ئەوەندەی ڕۆحی مەئیووس و مەلوول تاریک ئەکا دنیا،
ئەوەندەش نوور لە ڕۆحی شادەوە ئەڕژێ بەسەر سەریا!
کوڕم! هەر وەک لە ئوعجووبەی ژیانا بەختی بەد ئەگری،
شتێکیش ــ بەختیاری ــ پێکەنین گرتوویە چواردەوری!
بە خۆڕایی مەترسە، خەم مەخۆ، مەگری لەئێستاوە!
بە چی مەعلووم کە چی لەو تەختی ناوچاوانە نووسراوە؟

---

١) زەرنەقووتە: بێچووی تازە هەڵهاتوو لە هێلکە. ٢) لە سلێمانی ئەڵێن «کرپە»، گڕی ئاگر. ٣) وەلێ: بەڵام.

## یار

یار، یار!
شیرین لەنجە و لار!
چاوم ڕوا،
سەبرم سوا،
هێزم لێ بڕا،
هەر نەهاتی، دەرنەکەوتی،
بۆچی توخوا؟
یار، یار، شیرین لەنجە و لار!

* * *

ژماردم گشت ئەستێرەی شەو،
تاقتاقکەرەم کردە خەو؛
لەبەر کزەی بای سارد تەزیم،
لەگەڵ گەڵای درەخت لەرزیم،
ئاونگ وەك گیا تەڕی کردم،
هەر نەهاتی، ئەوا مردم...
چارەڕوانم،
پەرێشانم،
پەرۆشە گیانم...
سا بمگەرێ هێزی ژیانم...
یار، یار، شیرین لەنجە و لار!

* * *

نیگام تینووی تەماشاتە،
دادووراوی سەر ڕێگاتە،
گوێم عەزرەتی ترپەی پێتە،
هەمیشە ئاراستەی ڕێتە،
دڵم پڕ تاسە و پەرۆشە،
دۆزەخێکە و گەرمی جۆشە،
یار، یار،
دەرمانی ئازار!

# دوا سرنج ...

بۆ قژزەردی بەردەرگا، لە سەرەڕێی
بەندیخانەما لە مووسڵەوە بۆ هەولێر

ئەی قژ زەردا! ئەی بەژن و باڵا کەڵەگەت!
بۆ کز ڕاوەستاوی بەرامبەری من؟
بۆ دەستت ناوەتە ژێر چەنەی خەفەت،
لە عاستی دیمەنی دەربەدەریی من؟

ئەو چاوە کاڵانەت نیگای دەربەستبوون
لەبەرچی ئەگرنە گرفتاریی من؟
سرنجت ڕووی دەمی پرسکردنی روون
ئەکاتە کەلەپچەی دەستی دیاریی من؟
ئەبینم: پەپوولەی نیازی گفتوگۆ،
دوودڵ ڕاوەستاوە لەسەر گوڵی لێو:
ئاخ، خۆزگە هەڵئەفڕی، ئەمزانی ئاخۆ
ڕاسپێریی چی پێیە بۆ گیانی پەشێو؟

ئەی قژ زەردا! بە بەژنی ناودەرگا گرتووت،
هەروەکوو پەیکەری شۆخی خەمخواری!
مەلێ بووم لە باخچەی هونەرا بێ جووت،
بۆ جوانیم ڕێک ئەخست شیعری دڵداری!

بەڵام ئەهرەمەنی گەڵای باخ سیسکەر
بێزارە لە جووکەی دەنووکی کوردی؛
ڕاوکەری دارستان لە باڵدار پیسکەر
جێی چینەی لێ تەنیم بە داوی وردی...

وا ئێستا ئەبینی گیرۆدەی داوم؛
لە بەردەم جوانێکی وەک تۆی دڵنەرما،

لەگەڵ «گارد» لە «پاس»دا ڕاوەستێنراوم،
تا داخی گرانتر خول با لە سەرما!

ئەی قژ زەرد، ئەی گەردن بە ناز لارگرتوو،
دیوێکم لە پاسا تۆی، دیوێک باخە؛
ئەکەمە هەچ دیوێک نیگای ئارەزوو:
بۆ گیانی «قەفەسی»م سەرچاوەی ئاخە!

بۆ لای باخ ئەڕوانم: بەهار وەک پەری
فستانی گیا و گەڵای سەوزی پۆشیوە؛
زەرد و سوور گوڵباخی داوە لە سەری؛
ئارەقی سەر کوڵمی دڵۆپی زیوە!

بۆ لای تۆ ئەڕوانم، قژ زەردی نازدار،
ئەبینم دوو چاوی ناو ڕیزی برژانگ
پرشنگێک ئەگرنە نیگای گرفتار،
نەمدیوە لە گۆمی بەر تریفەی مانگ!
پرشنگی نیگایەک کە لە ڕووی ڕووناک
هەڵئەستێ و تیژ ئەکشێ تا ناخی دەروون،
کڵپەی نوێ ئەخاتە کوورەی عەشقی پاک
دەفری گیان لیپ ئەکا لە خۆزگەی بەربوون!

بەڵام ئاخ، دوو گاردی چاو لێم داپچڕاو
چەپ و ڕاست وەستاون بۆم دوشمنانە،
کەلەپچەی لە دەسما تون کلیلدراو
نیشانەی ڕێگامە کە بۆ زیندانە!

هەر ئەوەم لە دەست دێ، هەتا ئەتوانم،
ئا لەم هەڵوێستەدا، هەل بەکار بێنم؛
وەک تینووی چاو لە ئاو بە کوڵ بڕوانم؛
ئەو چاوەی تێمبڕییت نەیترووکێنم،

بۆ ئەوەی بتوانم لە پەردەی بیرم
نیگارێ هەڵکەنم شێوەی لێت بچێ؛
تا هەرچەن گازی گرت لە لەش زنجیرم
ئازارم سووکتر کا خەیاڵی کچێ:
کە شۆخەو قژ زەردە و باڵا ڕێک و بەرز،
خەمخواری نەناسە وەک فریشتەی عەرز!

# بەردەنووسێک

لەسەر کێلی گڵکۆی گەورە کچێک هەڵکەنراوە

لە خاکی گڵکۆما ئەی گۆڕستانگەڕ
ئاخێک بنێژە؛
بە کێلی مەڕمەڕما فرمێسکێکی تەڕ
لە چاو بڕێژە!
لە دنیای ڕووناکتا منیش گیانێ بووم
لە لەشی جوانا؛
وێنەی پەپوولەیەک ئەهاتم ئەچووم
بەناو گوڵانا!

کۆشی گەرمی دایک جێگای نازم بوو،
گیان بووم لای باوک؛
ناوبانگی چاوڕەشی ڕشتەی ڕازم بوو،
بووبوو بە لاوک؛

بەڵام ئاخ کەناڵەی لاوکی لاوان
زوو مەستی کردم،
بە ڕێی عەشقی پاکا نام مل و تاوان
بۆ لاڕێی بردم!

لاوێکی نامەردم تووش هات لە ڕێما،
بە سوێن و پەیمان،
وەک ڕەشمار پەپکەی خوارد، نوست لەناو جێما؛
ئابڕوومی تکان!...

پاش ئەوەی ماری پیس زەهری خۆی ڕژان،
کشایەوە کون؛
هۆی شەرمی لە باوکم کرد بە مایەی ژان
کەتنکەری ون...

ڕووی نیازی زەردی دایک و باوک و خۆم
بێسوود کەوتە گەڕ،
خۆیشی چەشنی باوکی تفی هەڵدا بۆم،
گوێی لێ کردین کەڕ!

ئەو کوڕ بوو، سەرەڕای ئەوەش دەستدار بوو،
بە دەستووری گەل
ناپاکیی کردەوەی دوور لە پرسیار بوو،
بەڵام، ئاخ ئەجەل!
منی «کچ» مامزی بەندیخانەی ژین:
سزای تاوانم،
بە دەستی باوکی خۆم چووم بە سەربڕین!
پرچی پەخشانم،

تلا لە خوێنەوە و کەوتە سەر چاوم،
ئیتر نەمبینی:
لە جەرگی باوکما سەری بڕاوم
چۆن بوو برینی؟

یان دایکی دڵسۆزم وێرای بە بێ شەرم
بۆ جوانەمەرگی
وەک دایکان شیوەنێک بگێڕێ بە گەرم؛
ڕەش کا بۆی بەرگی؟

# قاله مرد

عاسمانی شینی ئەیلوولی قژزەردا!
نازانی کزەی هەناسەی بێ‌تین،
بە ڕەنگی فرمێسک لێیان نووسرابوو،
شاغونچەی خەڵفی تافی جوانی،
عاسمان سا بگری بە بێ‌هیوایی،
فرمێسکی تکـ تکـ، لێکدانەوەی مەنگ،
قاله مرد، قالەی ئایشەخان و کورد،
قالەی خوشکان و قالەی خزمانی
کزەی بای مەرگی پێش‌وادە دای لێی،
تاقە تروسکەی وەجاغی بوو، ئاخ!
لە ناوەڕاستی شەقامی عومرا،
قاله تیری مەرگ پێش وادە پێکای،
نا، نەمرد قاله، تەنیا قالەی لەش،
بەڵام قالەی گیان، قالەی دروستی،
یادی گەورەیی و شیرینی و چاکی:

نازانی تینووی فرمێسکە ڕووی هەرد؟
چەند گەڵایەکی زەردی بۆ هانین:
قاله مرد، هەی داخ، باخ بەرەڵلا بوو؟
بوو بە داخی دڵ گەڵاڕێزانی!...
فرمێسک بڕێژە: تکـ تکـ، ئەسپایی!
نیشانەی جۆشە بۆ دڵی زۆر تەنگ!!
قاله نا، دایکی قاله مرد، کورد مرد؟
ڕووناکیی چاوی گشت سلێمانی
ئیتر ئێجگاری تاریک داهات جێی،
تاقە نەمامی ناوباغی بوو، ئاخ!
ئایشەخان، سا مەرگ! قاله ون کرا...
ڕۆڵەی گەورەت مرد، ئای ئایشەخان ئای!
کەوتە ئەودیوی پەردەی ئەودیوڕەش؛
هەرگیز ون نابێ لە باغچەی هەستی!
بەڵگەی مانە بۆ ژیانی پاکی!

# له به‌ندیخانه[1]...

تــاوانــم[2] کــرد، گـه‌ل پـێوه‌ی نـام مۆری نـاپاکـی،
بـۆ زیـندانـه کـۆچی ژیـنم، دنـیای ڕوونـاکـی!
وتــم: گــه‌ل، نـه ء! گـه‌لفرۆشی ده‌زگـا و دووکـانگێڕ
عاری تێرپۆش، خه‌وشی[3] بـرسی مـوو بـه مـوو ژمێر!
دزی تــێر و بــێ‌پێویستی نـارده سـه‌ر بـرسی،
وتــیان دزه و پـــرسیارێکی زۆریـان لێ پـرسی
کـابرای بـرسیی بـێتاوانـیش مـلکه‌چ و سـه‌رشۆڕ
چـۆنیان لێ ویست بـۆی هـه‌ڵڕشتن وه‌ڵامێکی[4] زۆر!
کـار تـه‌واو بـوو، قـۆچی دزی، بـوو بـه سـندووقبڕ؛
مـێشک مـاندوو، دڵ بـریندار، گـوێ له تـوانج پڕ
لوولـه‌ی تـــفه‌نگ له بـــڕبڕه‌ی پشــتی قـایم بـوو،
ته‌قه‌ی پۆستاڵ بـه شـوێنه‌وه: هـه‌ر هـات و هـه‌ر چـوو
ئــه‌وا ئـێستا بـاغچه‌ی ژیــن و شـیعر و خـه‌یاڵی
بـــوو بـه ژووری بـه‌ندیخانه‌ی تـاریک و خـاڵی!
سا خوات له‌گه‌ڵ دنـیای جـوانـی! دنـیای ڕوونـاکـی!
تـاوانـم کـرد، گـه‌ل پـێوه‌ی نـام، مۆری نـاپاکـی!
ئـــیتر مـــن هــیچ نــه ئـاده‌میم، نــه نـیشتمانی،
نـــه ئــه‌ندامــی ئــه‌م کـۆمه‌ڵه‌م، نــه کــوردستانی
نـا، بـۆ کـوردێک کـفره ئـێستا کـوردستان وتـن،
چــه‌رچـیه کـانی ئـیستعمارم لێ ئـه‌بنه دوشـمن!
له عـــێراقـــا و بـــه‌قانوون و پـێڕۆی عـیراقـی:
کــوردێک گـیرا و بــه‌ند و زنــجیر کـرایه لاقـی،
حه‌قی وه‌ک کورد هه‌ر نه‌بووه و هی وه‌ک عـیراقـیش
بــزر[5] ئــه کــا، له بــه‌ندیشا و له‌پـاشی بـه‌ندیش!

* * *

ئـێستا مـن و خـەڵقی ئـەودیو ئـەم چـواردیـوارە
لە بـابەتی جـوێ شـێلراوە، هـەستیمان[٦]، دیـارە!
ئـەوان چـەشنی فـریشتەن و بـێگەرد و پـاکـن،
دنـیا هـەر بـۆ ئـەوان خـوڵقا ئـەوەندە چـاکـن!
بـۆیان هـەیە بـەپێی دڵـخواز بـخۆن، بـنۆشن،
سـەربەست بـژین، بـەختیاری پـێک پـێک بـنۆشن،
گـوێ بگـرن تـێرلە ئـاوازەی مـۆسیقای شـیرین،
کـۆڕی بـەزم و ئـاهەنگ بکـەن پـڕ لە پـێکەنین،
بـەناو جـوانـیی تـەبیعەتا بـێن و بـچن مـەست،
بـۆکـام مـیوەی زۆر سـەرچڵە درێـژ بکـەن دەست
بـەڵام مـن و وەک مـنەکـانی بـەندیخانە،
دروست بـوونمان لە قـوڕێکە ئـەهرەمەنانە!
بـۆ تـاریکی، بۆ شـەرم و عـار، بـۆ خـەم خـوڵقاوین،
لە بـەهەشتی ئـەودیو دیـوار بـێبەش کـراوین!
مانگ و ڕۆژ و ئەستێرەی خـواش لەگـەڵ دەشت و دەر،
قـانوون ئـەڵێ: قـەدەغەیە دەرحـەق تـاوانکـەر!

* * *

ئەی مانگ و ڕۆژ، ئەستێرەی شـەو، هـەڵمەیەن ئـیتر
بـۆئەودیوی بـە نـهێنی لە تـاوانکـەر پـڕ!
بـۆ ئـەودیوی بـەئاشکرا فـەزیلەتفرۆش،
لە پـەناوە پـاسکەری دز، واعـیزی سـەرخـۆش!
بۆ ئەودیوی شێخ و مەلا بەشی زۆر جاسووس،
زوربەی ئاغا بە پێست مەرد و بە ئێـک بێناموس
بـۆ زۆرداری نـاوخۆ دڕ و لەلای بـێگانە
دەست لەسـەر سـنگ لەبـەرئەکـەن جلی ژنـانە!
بـۆ ئەودیوی کـە زۆر پیاوی گـەورە و ناوداری[٧]
گـیانی چـەور و چـڵکنە وەک لەشـی هـەژاری!

بـــۆ ئـــەودیوی پــڕ لە درۆ و پــڕ لە دەســیــە،
بــۆ ئـەودیوی کـە هـیچ نـەبێ وەک ئـەمدیو پیسە!
ئـەی تـیژگی ڕۆژ! ئـەو وڵاتـەی کۆمەڵی پـاکـە،
ئـــەندامــێکی وەک مـــنی تـیا ئـازاد و چـاکـە؛
ئـەندامــێکی وەک مـنی بـۆ شـیعر و ئـەدەب زاو،
تـــیا نـــایێتە پـــارەدزی بـــرسی و نـاتەواو!
دزی بـــرسی یـــان تـــەمەعکار! دەوری فـــرمانی
نـاگـرن، هـەتا بـە قـوڕ بگـرن مـاڵی ویـرانـی!
ئــەو کۆمەڵەی خـواپێداوە، خـاوەن بـەهرەی فـەن
بۆپیانازین بـەخێو ئـەکـا، نـەک ڕیسـوایـی و پـەن!
بـــولبولێ بـــووم ئـامادە بـووم هـەتا بـمێنم
بـە نـانی وشک، بـەرگی پـەڵاس، بـۆ گـەل بـخوێنم
بـــەڵام گـــەلی بـــە شـــرینقە خـــەو لێ خـــراوم
گـــوێی نـــەدامێ هـەتاکـەوتم، چڵکن بـوو نـاوم!

* * *

ئـەی تـریفەی مـانگی سپیی دەرکـی دەلاقـە[8]،
با پیس نـەبی، خـۆت مـەدە لەم کـوردی عـیراقـە!
وڵاتـــەکـــە داگـــیرکراو، نـــەتەوە[9] دیـــلە،
بـاو لای دوشـمن نـامەردێتی، مـەردی زەلیـلە!
کـای لەبـەر سـەگ دانـراوە، ئێسقان بـۆ ئـەسپە!
سەر لە جێی کلک بەند کراوە، کلک لە سەر چەسپە!
شـێوێنراوە بـە دەسـتی قـەست شیرازەی کـاری،
تا ئـاسان بـێ بـۆ سـوورفلی چـرچ، ئـیستیعماری؛
وەک بـــزنمژ دەم بـنێتە جـوانـاوی نـەوتی،
لێـی دەرهـێنێ دوا دەنک و فـلسی دەستکەوتی!
ئەی مانگی بەرز، سا هانا بێ، مـل بـنێ بـۆ دوور،
بۆ وڵاتێک جێی نیزام بێ و سەربەست و ڕووسوور،

بــۆ وڵاتــێك هــاونیشتمان تــیایا ئــازاد بــێ،
ژێـری دڵـسۆز بـاوك بێت و گـەلیش ئـەولاد بێ!
هــەر ئــەندامــە بــەپێی بـەهرە و لێهاتنی خۆی،
مــاوە و جێگای فـرمانکردن ڕێکخـرابێ بـۆی.
ئیش بکات و نان بخوات و بـەرگی خـۆی بـدڕێ،
بــە بــێئەوەی نــاچار بــبێ ڕێــی تـاوان بگـرێ!
ئــا لەو خــاکــە پـرشنگڕێژیی پـرچـی زێـڕینت،
ئەی مانگی جوان سـەنگین ئـەکـا نـرخـی بـینینت!

* * *

ئەی ئەستێرە! ئەستێرەکـان! بـەرز و گـەش و دوور،
ئــەگــەرچــی مـن نـاتانبینم لەبـەر سـەقفی ژوور،
بەڵام دیارە، ئێستا جـوان جـوان چـاو ئـەتروکێنن،
ڕووی ئــاسمانی شــینی ژوور سـەر پـێئەکـەنێنن!
ئــاخ، نــازانـن خـاوەنچێژان[١٠]، فـرمێسکی چـاویان
ڕێگــــا نــــادا بــــڕوانــــنە زیـنـەتی ئــاسمان،
لەم وڵاتەی کە ڕووی خـاکـی گـوڵگـوڵیی داغـە،
بــــرینی جــەرگ لە بــاغچەیا لە جــێی گــوڵباغە!
خــواتــان لەگـەڵ، ئێوەش بـڕۆن، لێـرە ئـاوا بـن،
با نـەکـەون وەك مـن کـەوتم، ئـەستێرەی چـا بـن!

* * *

ئەی دنیای جوان، دنیای بەهار، دنـیای ڕوونـاکـی،
تـاوانـم کـرد، گـەل پـێوەی نـام مـۆری نـاپاکـی،
فــڕێی دامــە پشــتی دەرگــای ئــاسن و پــۆڵا،
لە ژوورێکـــــی تــــەنگەڵانی تــاریك و چــۆڵا،
لەگــەڵ ئــەوەی گیانم تـیایە بـە هـەناسە و نـەبز،
ئـەڵێی مـردووم خـزاومـەتە ژێـر ئـەلحەدی قـەبز؛
بــە قــەدکــونی دەلاقــەکــەم ئــاسمان دیـارە،
ئــــەمە هــــەموو نــــاونیشانی ڕۆژی بــــەهارە:

بـۆ بـەندیەک کـە زیـندانـی دڵـی خـەمباری
دوا دەلاقـــەی گـــیراوە لە ڕۆژی بـــەهاری،
بـۆ بـەندیەک کـە پـەیوەندی لەگـەڵ دنـیای دەر
بـەدەستی «داد[11]» پـچڕێنراوە؛ هـاوڕێ و بـرادەر
لەکـــردەوەی نـــاشیرینی لێـــویان گـەزیوە،
لە هـــاوڕێیی‌و بـــرادەریـــی دەســـتیان سـڕیوە
بـۆ بـەندیەک، کـە هـیچ نـەبێ تـا بـەرەڵڵا بـێ،
بـــەپێی قـــانوون کـۆشی مـنداڵ، مـنداڵی نـابێ
کوڕی خەرجـیی لێ وەرنـاگـرێ، کـۆشی نـابینێ،
کـچی سـاوا ــ کـێ چـوزانـێ ــ هـەتا بـمێنێ!؟

---

١) مامۆستا گۆران ئەم پارچە شیعرەی پاش گرتنی یەکەمجاری لە زیندانا وتووە و هەر لەوێوە ناردوویەتە دەرەوە و لە ژمارە ١١٠٢ی ڕۆژنامەی «ژین»ی ڕۆژی ١٩٥٢/٦/٥دا بڵاوکراوەتەوە م.م.ک.
٢) تاوان: جورم، جەریمە. ٣) خەوش: عەیب، ناتەواوی. ٤) وەڵام: جواب. ٥) بزرکردن: ونکردن.
٦) هەستی: وجوود، پێچەوانەی عەدەم. ٧) ناودار: بەناوبانگ. ٨) دەلاقە: کون، پەنجەرەی بچووک.
٩) نەتەوە: قەوم. ١٠) چێژ: زەوق. خاوەنچێژ: واتە خاوەنزەوق. ١١) داد: عەدالەت.

## وەڵامی پرس

پێشکەشە بۆ: ئی. ئی. ڤاسیلیێڤا، لە پزیشکەکانی
نەخۆشخانەی کرەملین، لە مۆسکۆ

ڕاکشابووم لەسەر پشتم،
دوکتۆرەکەم
ماری شێرپەنجەی ئەکوشتم...

ناڵێم: وەک دایکێکی دڵسۆز
فرمێسکی بۆ هەڵئەڕشتم،
بەڵام، تەواو وەک کچی خۆم،
دەستی ئەخستە ناو مشتم،
بە چاوی پڕ لە هەستی جوان
ئەیکرد تەماشای سروشتم،
ئەیپرسی لێم: «بۆچ وا ماتی؟
بۆچ هەمیشە خەمبار دیاری؟»
بۆ من ئەم پرسە وەک هەنگوین
ئەتکایە سەر لێو لە زاری
بەڵام بۆ خوشکانی بەردەست
سیسکردنی گوڵ بووکاری...
دوو سێ کچ بوون وەک دوکتۆر خۆی،
خەمخواریان لێ ئەباری،
نەک هەر بۆ تیماری دەردم،
بۆ چارەش، بۆ باغچەی زەردم!

* * *

بەڵێ، دوکتۆر! خوشکان! ماتم،
هەر من نیم ماتی وڵاتم،
لەناو هەزارانا، تاک تاک
لێومان هەیە پێ بکەنێ
لای ئێمە بۆ دنیای شادی
وا تازە خەڵک هەنگاو ئەنێ!

١٩٦٢/٥/٢٥

# بۆ گوڵی لاولاو[1]

بەکوڵ گریان لە چاوم دێ، گوڵی لاولاوی ڕەنگاوڕەنگ!
لەبەرچی سیس ئەبی وا زوو؟ چییە ئەسبابی ژاکانت؟
هەموو تاوێکە ڕۆژ هەڵهاتووە، بۆچی وەها بێدەنگ
ئەژاکێی؟ تۆخوا، ئەی گوڵ، سەبر، دەستم بە دامانت!

سەبر تۆ بی‌خوا! تاوێکی‌تر ڕاوەستە، تا عومرم
وەکوو ڕۆژی چلەی زستان لە هەوری مەینەت ئاوا بێ؛
منیش هاوڕێی سەفەرتم، ئەی گوڵی لاولاو منیش ئەمرم!
منیش خلیقەت وەکوو تۆ، وا نەبێ زۆرم لەگەڵ چا بێ!
منیش، وەک تۆ بەقام کورتە و بەهارم تیژ و کەمفرسەت،
گەشەم مەیلە و زەواڵە چەشنی تۆ، چەشنی هەموو دنیا؛
وەکوو بارانی هاوین زوو فەنایە عومری بێ‌مروەت؛
تەبەخخور مایەیە، هەیهات، بە چەشنی شەونمی سەرگیا!

---

١) بنەڕەتی بیری ئەم هەڵبەستە لە شیعری ئینگلیزی وەرگیراوە.

# ئەی نەی

ئەی نەی چییە وا بە سۆز و سازی؟
بۆچ تۆش وەکوو ئێمە عیشقبازی؟
یا مەحرەمی ڕازی عاشقانی؟
بۆ ئاهی دەروونی تەرجومانی؟

لەبڕێزە دڵی زەعیف و زارم،
لەو عیشقە مەئالی ئێزتیرابە،
لەو تایە کە پێوە بێقەرارم،
لەو سەممە کە موهلیکی شەبابە!
ئامالی عەزیزی نەوجەوانیم
پامالی مەزالیمی زەمانە؛
هەر سانییەیەک لە زیندەگانیم
عەسرێکی هەموو خەمی جیهانە!

ئەی نەی دە بە نەغمەیی خرۆشان
ئەم ناوە بە جارێ پڕ سەدا کە؛
بۆ ڕۆحی شکستەباڵی ناڵان
لاوانەوەیەک بە کوڵ ئەدا کە!

# ئاوێنەی هەستیم

هەر زەڕڕەیەک لە خوێنی دەماری پڕئاگرم،
هەرچی حوجەیرەکانی[1] هەیەکوورەیی دڵم
مەشبووعی عیشق و جەزبەیە، بۆجوانی باقڵم[2]
قابیل نییە فەراغەتم، حەتتا کە بیشمرم!

نەمدی دەمێ لە وەختی تەفەککور وە مەشغەڵەم
لێی تێک نەدا خەیاڵی حوسنی ڕابیتە و قەرار؛
بیرم نەچوو لەگەرمەخەوا زیکر و فیکری یار،
هەر عیشقی بێبڕانەوە بوو عومری کورت وکەم!
هەرچەن بتی جوانی بە عەکسی پەرستشم،
هەر دوورە لێم، لە هەیکەلی حوزن و قەلەندەریم
هەرسڵ ئەکات و بێبەشی ناز و نەوازشم
لاکین چباک؟ ڕاستییەکەی: چ دەستەڵات؟
مایەو مەداری تەسلیەتی عەشقی مەعنەویم:
بووکی خەیاڵی شۆخمە سەرگەرمی ئیلتیفات!

---

۱) حوجەیرەکان: خەلایا. ۲) باقڵم: بەعەقڵم، وائەزانم.

# زەنگی پەستی[1]

ئــــەوا دیســـــان لە گـــۆشەی نـــادیاری
دڵــــم، هـــەڵسا زرەی زەنگـــی فگـــاری[2]؛
بــە ئــەسپایی، بــە بــێ‌هێزی، بــە عــاستەم،
هـــەوای ڕۆحـــم ئـەخاتە سـەر لەرەی خـەم!
بــە ئــەسپایی، بــە لەرزۆکـــی، هـــەژاری،
ئــــــەناڵێنێ لە شـــــوێنی نـــادیاری!
زمـــانێک دێــتە گــۆ هـەرچەن زرەی دێ،
کــە تــێر نـابم لە گـوێگرتن بـە دووگـوێ!
زمانێک، بەستەیەک، دەنگێک، نـەوایـەک،
سکـــاڵایەک، هــەناسە و ئــاخ و ئــایەک
کــە تــێی‌ناگــەم، کـە نـازانم ئـەڵێ چـی،
بـــەڵام خـورخورِ لە گـەڵیا ڕۆحـم ئـەگری!
چـــیە ئــەی ڕۆحــی بــێلێوار و بـــێپەی
لە تــۆ نــاشارەزایـــی مــن هـــەتا کــەی؟
چـــیە ئــەم دەنگــە؟ ئەم ئـاوازە دوورە؟
کـــە پـــێ‌هەڵهێنەری چــاوی شـــوعوورە؟
کـــە دێ پـــەستم، کـــە نـایە ئـارەزووی دڵ
بـــە دوویــا ویـــڵ ئـەبێ: مـەنزڵ بـە مـەنزڵ!
چـــیە ئــەم زەنگـــە زرنگـەی دێ بـە مـاتی
کــە ژێــر تــەم کـەوتووە شـوێنی وڵاتـی؟

١٩٤٠

١) هەندێ‌جار، لە قووڵایی دڵما، هەستی پەستیەک ئەکەم، لە چەشنە مەستیەک ئەچێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەم بیر و خەیاڵ و لێکدانەوە لێ ئەورووژێنێ، شەکەتم ئەکات، کەچی ئەگەر سەردەمێکی نەختێ درێژ خۆیم لێ بشارێتەوە، گیانم وەکوو مناڵ، ئەکەوێتە بەیایی‌یەکی بەکوڵ بۆی... ویستم ئەم بیرانەم لەقاڵبی شیعردا داڕێژم، هەرچەن تێکۆشام، هەر توانیم ئەمە بێنمە دی.
٢) فگاری: پەستی و عاجزی.

# گیان

نازانم تۆ چیت ئەی گیان؟     یاری نازداری ژیان،
هێزی لەش جوولاندنم،     هۆی گەرم و سارد چەشتنم،
تینی دڵەی پڕجۆشم،     بزوێنی[۲] بیر و هۆشم،
هاوڕێی هەمیشەی عومرم:     لەوساوە بووم تا ئەمرم!
نازانم تۆ چیت؟ من چیم؟     تۆ من نیت؟ یا من تۆ نیم؟
تۆ دنیامی؟ یا دنیام:     تۆی تیا هاتوویتە ئەنجام؟
تۆ و ژیان کامتان کامن؟     کامتان نەوتی چرامن؟
یاخۆ پرشنگ کامتانن؟     یا هەردوو: هەردووکتانن؟
نازانم و حەیرانم،     ئەی تەلیسمی ژیانم!
هەر ئەوەندم لێ ڕوونە:     ئەنجام لە یەک جوێبوونە!
ڕۆژێک، سبەی، دووسبەی؟     عایەن نییە چۆن، یا کەی،
تۆ ون ئەبی، لەش ئەمرێ؛     لەش بە یادگار قەبرێ
جێ دێڵێ تا زەمانێ؛     بەڵام، ئەی گیان، تۆ کوانێ
بەڵگەی مان و نەمانت:     قەبرت یا ناونیشانت؟

---

۱) بزوێن سووککراوی بزوێنەر، موحەڕڕیک.

# له که‌رکووکه‌وه بۆ دایکم نووسیوه

ئه‌ی دایه‌، ئه‌گه‌ر ئه‌پرسی حاڵم:
«ئێ: تۆیش وه‌کو باقی بێ‌ڕه‌حم نییت،
تۆزقاڵێ، که‌مێ ڕه‌حم ئه‌زانیت!»
ڕاستی شه‌و و ڕۆژ هه‌ر ده‌ناڵم!

ده‌گریم و ده‌سووتێم هه‌روه‌کوو مۆم،
ئاهم ئه‌گاته‌ گۆشی گه‌ردوون؛
مات و کز و مه‌لوول و مه‌حزوون
بۆ حاڵی غه‌ریبی، بێکه‌سیی خۆم!

•

که‌رکووك: ۱۹۲۱

# پێشەکیەک بە کورتی

ئاشکرایە کۆرپاییە باکووریەکان (شیمالییەکان) کۆمۆنیستن. هەرچی منیشم بە ئایین موسوڵمان و بە باوەڕی سیاسی دێموکرات و بە شەرەفی جینسیە هاونیشتمانێکی عیراقیم. بەڵام جیاوازیی ئایین، جیاوازیی ئایدیال، جیاوازیی پێڕەوی فەرمانداری (نیزامی حوکم) چیان هەیە بەسەر هەست و عاتیفەیەکەوە کە لە قووڵاییی سەرچاوەی ئینسانییەوە هەڵئەقوڵێ؟ بە دوو چاوی زەق ئەبینم چەقۆ خراوەتە گۆشتی نەتەوەیەکی ئازاد، تەنیا لەبەرئەوەی چۆن خۆی ئەیەوێ وا ئەژی، پاسەوانە ڕاستەقینەکانی دێموکراتییش بە هەموو دڵڕەقییەک ئەڵێن: نەء، ئێمە چۆنمان ئەوێت ئەبێ وا بژییت!

هیچکەس نەزانێت، ئێمە (دانیشتووانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) باش ئەزانین ئەمانە ئەیانەوێ کلۆلی داگیرکراوی ژێردەستیان چۆن بژی!

ئەمجا، ئەگەر بە بۆنەی بەسەرهاتی داماویی کۆریاوە فرمێسکێکی دڵسۆزانە بەسەر برینی هەردوولای ئەوانیش وخۆشمانا بڕێژم، باوەڕ ناکەم کەس بتوانێ زاتی ڕێلێ گرتنم بە دڵا بهێنێ.

گۆران

هەولێر، ساڵی ١٩٥١

## «گوڵاڵە برایمە... گری... گری
## چووینە غەزای ناو گاوری»
(فۆلکلۆری کورد)

ئازادیخواز! گری... گری...
کۆڕیای ئازاد: سەرانسەری
تەخت و تاراجی تێک درا
ماک ئارسەری[2] خوای سینگمان ری
کەوتە ژێر پێی درنج، پەری:
دیسانەوە بۆ «سینگمان ری»[1]،
لە فەرمانی «ماک ئارسەر»!!
ئازادیخواز! گری... گری...

* * *

نیشتمانێک هەبوو: کۆریا،
گەلێک ئەیویست بەری ڕەنجی
نەداتە دەست ئیمپریالیست؛
گەلێک ئەیویست فەرمانداری،
تا دەست باتە دەست ئیستیعمار
گەلێک ئەیویست ئاغای خۆی بێ
نەهێڵێ تیر هەرگاخۆر بێ،
پۆشتە لە جل دۆلاب پڕ کا،
گەلێک ئەیویست کە ڕێی ژیان،
ڕوونکاتەوە و ڕوونتری کا.
دەرگای دەزگای پیشە و هونەر،
وا بخاتە سەر گازی پشت:
گەلێکی وا ئازا و سەربەست،
مێشک ڕووناک، پڕ لە هێز لەش،
زنجیرێکی تێ ئاڵابوو
زنجیر: زنجیری دیلی بوو،
کلیلبەدەستی زنجیری
چاوی زەق، ڕەپ گوێچکە کانی،
تا «دەی!» ئەکرد ئاغای ماکی
گەلێک، سەربەست تیایا ئەژیا،
خۆی بیخوا و کلیلی گەنجی
لێی قول بدا نۆزدە لە بیست.
ئاغای نەبێ و سامانداری،
بۆ مژینی خوێنی هەژار.
کەڵکی گشت: ئامانج و هۆی بێ
سکی برسیش تا دێ زۆر بێ،
بەشی لات هەر دەرپێی شڕ کا؛
بۆ پێش چاوی هاونیشتمان
لە بەهرەی خوێندن پڕی کا.
بۆ ڕۆڵەی جووتیار و ڕەنجبەر،
خۆزگەی بێتە دی کۆمەڵ گشت،
بە باوەڕی ئازادی مەست،
خۆبەختکەر، بە خەبات چەش،
هەر هەڵقەی هەزار بەڵا بوو.
بۆ ئیستیعمار زەلیلی بوو.
«کۆیسلینگ»[3]ی ماک: سینگمان ری
چەشنی توولەی پاسەوانی
چەشتر ئەبوو بۆ ناپاکی

* * *

ئـــازادیـــخواز! گـــری... گـــری...
کـــۆریای ئـــازاد: ســـەرانســـەری
تـــەخت و تـــاراجـــی تـــێک درا
ماک ئارسەری خوای سینگمان ری
کـــەوتە ژێـــر پـــێی درنـج، پـەری:
دیـســـــانەوە بـــــۆ «ســـینگمان ری»
لە فـــــەرمانی «مـــــاک ئـــارسەر»!
ئـــــازادیـــــخواز! گـــری، گـــری.

* * *

تـــەکـــانی دا نـــەتەوەی مـــەرد،
قـــەف قـــەف بـڕیی هـەڵقەی زنـجیر،
بـــەڵام، هـــێشتا پـــەرچێک مابوو؛
خـــوای بـــە دراو بـەرچـاو گـێژکەر،
خـوای شـەڕ، گـوناه، ستەم، تـاوان،
مامسام خـۆی و ئـەکـوانـی دێـو
لەگـــــەڵ ســـــوپای ورده درنـــج
دەم ئـــــەمـــــاخنراو لە جـــــێنێوا
لە کـــــێ؟ لە نـــــەتەوەی کـــۆریا!
مـــل کـــەچ نـــاکـــا بـۆ ئـیستیعمار
ئـــەیەوێ ئـــازاد، یـــەکگـــرتوو
ئـــــەهرەمەن، ئـــەکـــوان لەگـــەڵا،
ســـەر پـــڕ لە ســـەودای بـــەدکاری،
بـــۆ ســـــەر کـــۆریا تـــاوی داوه
دانـــــراوه بـــــۆ کـــــۆتری شـــین:
بـــــە ڕاست و چـــــەپا ئـــەگـــەڕێ:
وەک دڕنــــــده لاشـــــەی نـــێچیر
شـــــەرمیش نـــــاکـــــا، داڕزیـــوه،
ڕووی دەم ئـــــەکـــاتە ئـــەنجومەن
ئـــــەڵێ: هـــــەر خـــۆمم پـــاسەوان
خـــــۆمم قـــــەڵای دیـــموکراســـی،
خـــۆمم لە دەست جـــەور و ئـــازار،
خـــۆمم، خـــۆمم، خـــۆمم، خـۆمم...
بـــــە بـــــانقی پـــــڕ لە مـــــلیارم،
بە نـەوسی سـەر ئـیستیعمار چـووم،

بـــــەربەندی نـــــا لە هـــەڵقەی بـــەند.
وەک لە مـۆم بـەی، بـە دەمـی شـێر.
نـرکەی خـــوای دۆلار پـــەیا بـــوو:
بـــــاوەڕی لەق لە خشـــــتە بـــــەر،
ئـــــەهرەمەنی گـــــەورەی دێـــوان.
«جـــۆنپۆڵ»ی پـــیر، قـــلیان بـــە لێـو
دایـــــانە بـــــەر دەشـــــتی بـــرنج،
ورووژان لە دەریـــــــا و کـــــێوا،
بـــۆچی؟ چـــونکە مـــەرده و وریـا!
بـــۆ نـــاپاکـــی نـــاوخۆی زۆردار،
بژی، نەک وەک کوردی نوستوو.
بـــــۆمبای ئـــــەتۆم لە بـــــاخەڵا،
زۆر بـــە ســـووری و بـــە لاســـاری
هـــەر کـــۆریای چـــی؟ کـــۆریا داوه
مـــــەلی ئـــاشتیی بـــەهەشتی ژیـــن.
خاپوور ئەکا و ئەکـوژێ و ئـەبڕێ،
شـــڕ شـــڕ ئـــەکـا بـەکـەڵبەی پـیر.
بـــــــە لمـــــۆزی خـــــوێناویوه،
ــ ئاخ دەست ناگـاتە ئـەنجومەن! ــ
بـــۆ کـــۆتری ئـــاشتیی جـــیهان!
بـــــەخێوکەری لات و بـــــرسی!
ڕزگـــــارکەری کـــۆریای هـــەژار!
بـــــە کـــۆشکی دووســـەد نـــهۆمم،
بـــە کـــەرخـــۆری دەنـــووکلارم،[۴]
بـــە ویـــژدانی هـەر زوو مـردووم،

بە قیزم لە پێستی بەدرەنگ:   زەرد و ڕەشی وەک شەوەزەنگ.
بە ڕقی زۆر زۆر بە قینم   لەو ژێردەستەی لێی ئەبینم:
پەلەفرتێ و داد و بێداد   بۆ ژینێکی نەختێک ئازاد.

* * *

ئازادیخواز! گری... گری...   کەوتە ژێر پێی درنج، پەری:
کۆریای ئازاد: سەرانسەری   دیانەوە بۆ «سینگمان ری»،
تەخت و تاراجی تێک درا   لە فەرمانی «ماک ئارسەر»!!
ماک ئارسەری خوای سینگمان ری   ئازادیخواز! گری، گری.

* * *

ئەی ماک ئارسەر، ماک ئیستیعمار!   هێزی پێشێلکەری هەژار!
ئەی چەنگێزی ژێر باڵی داڵ!   کۆنە تینووی خوێناوی ئاڵ!
تێغی زۆر و ستەم سماو دە   ئەسپی جیهانگیری تاو دە
بڕۆ بگرە و شەق و پەق کە...   لە دیلی گیراو چاو زەق کە،
پێش پێ تێنان شار خاپوور کە،   ئاسمانی وەک تەنوور سوور کە،
بە ئاگری نیرۆن[5]-واری،   با بسووتێ شارە و شاری،
ئەمجا لە پشت مۆسیقاوە،   بە دەم تریقەی قاقاوە،
بچۆرە سەر جێی بەرزی شار   تێر بمژە هەوای بۆچڕووکدار!
ڕەنگە خۆش بێ، پاش پیرۆزی،   «ساوای سووتاو»[6] بۆی بۆکرووزی!
بەڵام، نەشئەی جەور و ستەم،   دڵنیا بە، ماک ئارسەر، کەم
بخایەنێ و نەخایەنێ،   ڕۆژێک سزای هەر ئەدەنێ.
ئەمە خولی چەرخە و تەئریخ،   شیری تیژی دەست خوای میرڕیخ[7]
ڕۆژێک ئەبێ ڕوو لە زۆردار   وەربگەڕێ و ئەمجا کوشتار
بکەوێتە بەرەی ناحەق،   خاوەنبڕوا و بەرنامەی لەق.
ئەوسا، ئەی ماک تۆ و تروومان[8]،   بۆ لێبووردن، بۆ هەی ئامان!
ڕووی زەردی شەرم، ڕووی داوەشین،   ئەکەنە کام خاوەنبڕین؟!

* * *

ئازادیخواز! گری، گری،   کەوتە ژێر پێی درنج، پەری:
کۆریای ئازاد: سەرانسەری   دیانەوە بۆ «سینگمان ری»،
تەخت و تاراجی تێک درا   لە فەرمانی «ماک ئارسەر»!!
ماک ئارسەری خوای سینگمان ری،   ئازادیخواز! گری... گری...

ئەی سینگمان ری! ئەی سینگمان ری!    پرسەی مەیتی کۆریا ناگری،
بۆ ماک ئارسەر پێتە کەنی،    شەرمەزار بی، چەن خایەنی!
چەن بە پایە دەسخەڕۆ بووی!    چۆن دۆلار لە خشتەی بردووی!
گریمان: نەک سەرەک، تۆ شای،    خێوی خوار و ژووری کۆریای،
بەلاّم، عەرشی ناو کەلاوە    جێگای «بوو»، نەک هی پیاوە.
دۆلارێک، لێی کەپری    هەرگیز ناتوانی پێی بکڕی
یەک تک چییە، لەوگشت ئاوە    کە لای گەل لە ڕووت تکاوە،
لە پاشانا تۆ پاشا نییت،    نۆکەرێکی ئاغایانیت،
هەر سوورفلێک لێت پەیا بێ،    لە هەچکوێ و هەچکاتێکا بێ،
ئەتوانێ چۆن ئارەزووکا،    لە پووشی حورمەتت فووکا،
دەس باتە جڵەوی کارت:    چۆن بۆی بلوێ قورس کا بارت،
ئەم شوورفلەی چەتەوڵە،    موو پووش ڕەنگەی، ڕووی پێست شڵە
ئەم باڵرووتی، دوو لاق ڕووتە،    هەڵقەمچاو چەناگە و لووتە،
پێویست ناکا ماک ئارسەر بێ،    سەرەک، یا وەزیری دەر بێ،
هەر «یانکی» بێ، «جۆن» بێ، «جاک» بێ،    بە خوێن لە ڕەگەزی پاک بێ،
گۆشی شیری ئیستیعمار بێ،    با تەنانەت خزمەتکار بێ،
مادام هاتە موستەعمەرە،    گەر خوا نەبێ، پێغەمبەرە...
ئیتر، شای، وەزیری، سەری    هەرچی تۆ هەی ئەی سینگمان ری!
ئەبێ کە دیت چارەی «یانکی»    گوێی خۆت ڕەپ کەی چەشنی «دۆنکی»[٩]!
چۆن بارت کاو بتداتە بەر،    ورتەت لە دەم نەیەتە دەر...

* * *

ئازادیخواز! گری... گری...    کەوتە ژێر پێی درنج، پەری،
کۆریای ئازاد: سەرانسەری    دیانەوە بۆ «سینگمان ری»،
تەخت و تاراجی تێک درا    لە فەرمانی «ماک ئارسەر»!!
ماک ئارسەری خوای سینگمان ری    ئازادیخواز! گری... گری...

* * *

ئەی نەتەوەی کۆریای نەبەز!    ئەی سی ملیۆن لە زەرد ڕەگەز!
تۆ هەر ڕەنگ بی، من هەر ڕەنگ بم    گەر نەتپەرستم بە پەنگ بم!
گەر نەمەوێ سەرفەرازیت،    بە هەستی خۆتا شانازیت،

گەر دوژمنی ئازادیی تۆ — بە دوژمن نەزانم بۆ خۆ،
خوایە بەشم هەر دیلی بێ! — هەر ڕووزەردی و زەلیلی بێ!
چونکە، کۆریا، هەردوو لامان — بۆ یەک دەرد ئەخوازین دەرمان:
کۆنەپەرستی ناوخۆمان — بۆتە شمڵێکی شەڕ بۆمان،
ڕایکێشاوە دەستی یاری — بۆ بێگانەی ئیستیعماری،
بە هەردوو دوژمنی خوێنمژ، — بەگشت چەکێ: لەشکوژ، بیرکوژ،
تێمان بەربوون، ئەیانەوێ: — حەقمان هەرگیز چنگ نەکەوێ.
تەکاتێک بەین بۆ حەق سەندن: — وەک تۆ دات، نەتەوەی مەزن!
بە هەڵپەی دەم ئەنەڕێنن، — دنیامان لێ ئەوروژێنن،
بەڵام پەشمە و خەیاڵی خاو... — چەرخی تەئریخ بە چاوڕاو
بۆ هیچ هێزێک ڕاناوەستێ، — دەستی حەقدار کەس نایبەستێ.
ڕاستە: ئەمڕۆ یەکمان نوستووین، — ئەوی‌ترمان زەدە و ماندووین،
بەڵام ڕۆژ دێ و ئەڕوا و ماوە — لە هیچ کاممان نەگیراوە.
ئەممان لە خەو بێزار ئەبێ، — ئەو تۆز لە پشتی ئەتەکێ.
ئەوسا دووبارە پەلامار — ئاسانە بۆ سەر ستەمکار

* * *

ئازادیخواز! گری... گری... — کەوتە ژێر پێی درنج، پەری:
کۆریای ئازاد، سەرانسەری — دیسانەوە بۆ «سینگمان ری»،
تەختو تاراجی تێک درا — لە فەرمانی «ماک ئارسەر»!!
ماک ئارسەری خوای سینگمان ری... — ئازادیخواز! گری، گری.

* * *

ئەی نەتەوەی کوردی برسی! — عەرەب، هیندی. هەرکەس، هەرچی!
ئەم قەوماوەی کۆریا، پەندە — بۆگشت گەلی دیل و بەندە.
بە زمانی وەک ئاو ڕەوان، — ڕوون وەک ڕۆژی بەری ئاسمان،
تێمان ئەگەیەنێت دوژمن، — جانەوەری دڕ و نەوسن!
بەم گشت کاسەی خوێنگێڕیە، — گلاراوی پێشمەرگییە.
تەئریخ لە پەڕەی بێباکا — وا ئەنووسێ و درۆ ناکا
ئەڵێ دەوری ئیستیعمار خۆی — هەڵئەکەنێ بۆ خۆی گڵکۆی،
تا ئەو زیاتر داگیرکراو، — بداتە بەر کەڵبەی سواو،
قەفی زنجیر ئەستوورتر کا — لەشکر سەوقی ڕێی دوورتر کا،

دیارە چین و گەلی چەوساو     زووتر لە خەو هەڵدێنن چاو،
زیاتر خواستی بۆ ڕزگاربوون،     ئەیانخاتە جۆشی هەڵچوون،
ئەوسا دەزگا و دووکانی لەق،     خۆت توند بگرە بۆ شڵپەی شەق!
خۆت توند بگرە، ئەی ئیستیعمار!     ئەهرەمەنی جەور و ئازار،
لەبەر هێزی حەقخوراوا،     هێزی وەک ئاگر جۆشاوا،
هێزی ڕۆژی بەرامبەر شەو،     هێی وریایی بەرامبەر خەو،
هێی یەکێتی، هێی زات، باوەڕ     لەخۆبوردوویی... بەرامبەر:
هێزی ترس و لەرز و سستی،     هێی گومان و خۆپەرستی!
خۆت توند بگرە هێزی گومڕا،     تا مەرگانت دێ لەپڕا،
تەپ ها! ترپەت دێ و لنگە و قووچ،     بۆی ئەکەویت دەعبای وەک حووچ!

---

١) سینگمان ری: شەرۆکی ئەودەمەی کۆریای باشوور. م.م.ک.

٢) ماک ئارسەر: فەرماندەی گشتیی هێزە شەڕکەرەکانی ئەمەریکا و دەوڵەتە نۆکەرەکانی بوو لە کۆریا کە خۆیان ناو نابوو هێزی نەتەوە یەکگرتووەکان. م.م.ک.

٣) کۆیسلینگ: بەرپرسێکی نەرویجی بوو لە جەنگی دووهەمی جیهاندا، بە پێچەوانەی سوودی خەباتی ئازادیبەخشی وڵاتەکەی، دەستی لەگەڵ نازییەکانی ئەڵمانیا تێکەڵ کرد. م.م.ک.

۴) مەبەست لە دروشمی دەوڵەتی ئەمەریکایە. م.م.ک.

۵) نیرۆنوار: لە چەشنی نیرۆن. نیرۆن ئیمپراتۆری ڕۆما بووە، هەروا بۆ سەیر شاری ڕۆمای ئاگر تێبەرداوە. م.م.ک.

٦) لە دەسنووسێکدا لەجیاتیی «ساوای سووتاو» نووسراوە «گۆشتی ساوا». م.م.ک.

٧) میرریخ (مارس): خوای شەڕ لای یۆنانییەکان. م.م.ک.

٨) تروومان: سەرکۆماری ئەو سەردەمەی ئەمەریکا. م.م.ک.

٩) دۆنکی: بە ئینگلیزی واتە گوێدرێژ. م.م.ک.

# پەیامی کورد

بۆ میهرەجانی چوارەمی گەنجان و قوتابییان لە بوخارست

(١)

ئەی کۆترە سپییەکەی ناو هێلانەی بەرز!
ئەمەوێ بتخەمە سەر باڵی فڕین
بۆ شارێک: هەزاران لاوانی جیهان
لاوانی حەوت کیشوەر لە بوخارستن،
بە سەدویەک دەم و زمانی جیاواز
بە سەدویەک دەم و زمان ئەوترێ:
قسەی وا پیرۆزی پڕخۆشەویستی
بزە و لەبزی شیرین، نیگای گەرموگوڕ،
مۆسیقا و هەڵبەستی نەبزی دڵ یەکخەر،
لە باغچە و مەیدان و جێگا گشتییەکان
چینی بۆ بالقانی ئەبێ بە بولبول،
لاوی کورد، دەست لە دەست برای عەرەبا،
تەنانەت لاوانی میترۆپۆلەکان
لەگیانی پیکاسۆ ئیلهام ئەکەم قەرز
بە ڕاستی بتنێرم نەک بە خەوبینین.
بۆ ئاشتی ئەبەستن تیایا میهرەجان!
بە هەوای برایی و ئاشتی سەرمەستن!
لەگەڵ یەک گەرم ئەکەن گۆڕینەوەی ڕاز
«ئەی هاوڕێی دووروڵات، تۆم زۆر خۆش ئەوێ!»
تێی ئەگا هەر لاوێک، بە گوێی دڵ، بیستی...
چوونە کۆڕی یاری و، دانسی کچ و کوڕ،
نیگاری بە جوانی سرنجڕاکێشەر،
بە ڕاستی بێزمان دێننە زمان!
کۆریایی و «یانکی»ی باش دەست ئەکەنە مل،
دەردی دڵ بۆ لاوی گشت جیهان ئەبا،
دان ئەنێن بە حەقی کوردا بۆ ژیان!

(٢)

ئەی مەلی پەلوپۆ سپی وەکوو چوڕ!
شاخەوشاخ، دەشتاودەشت، دەریا بە دەریا،
پایتەخت: بوخارست، شاری پێشکەوتوو
جەمەی دێ لە لاو و ئاشتیخوازانا
ئەو لقە زەیتوونەی ناو دەنووکی سوور
هێزی لاو یەکبگرێ بۆ ئاشتیدنیا
نە تەقە لە کۆریا، نە لە هیندی چین
بۆنەوەی «خێو»ەکان لە واڵستریتا
ئەم دنیا ڕووخاو و ڕوو بریندارە
هیچ نەبێ هەتیوێک ئەگا بە داڵدە،
ورگێکی خەوێران پڕ ئەکرێ لە نان
ڕووتەیەک پارچەیەک جلی پێ ئەبڕێ
پیرێکی پەککەوتوو، یان ژنی داماو
یا ساوای لە چەقی ڕێگا تووڕدراو
سەگ نایخوا، وەک پلێک گۆشتی بێتاوان
لە لووتکەی شاخەوە باڵ بگرە بەگوڕ
هەر بفڕە و مەوەستە تا ڕۆمانیا،
لە کۆنەپەرستی خۆ ڕزگار کردوو،
جوانترە لە جاران لە میهرەجانا!
بە سەرا بگێڕە حەوت جار خوار و ژوور!
شەڕفرۆش مەگەر قوڕ بکا بە سەریا!
ئەمێنێ، نە ئێمەیش تووشی شەڕ ئەبین
گۆشتاومان زڵفنج کەن لەگەڵ تریتا
ماوەی چنگ ئەکەوێ دەرد بکا چارە:
بەندییەک لە زنجیر ئەبێ ئازادە؛
نەخۆشێک شیفای دێ بە داو و دەرمان
بۆی ئەلوێ پێک بێنێ چەپەرە شڕێ.
لە برسا مردنیان دڵ ناکا بە ئاو،
گەل ئەبێ بە دایکی و ئەیهێنێتە ناو
تا ئابڕووی ئەم عەسرەی پێ بەرێ ئینسان!

(٣)

ئەی کۆترا! ئەی ڕەمزی ئاشتی و ئاسایش!
بۆئاشتی گـلێرن، بۆ خۆشەویستی
دڵنیاین دەزگای شەڕ سەرەوژێر ئەکەن
ئەو تۆوەی ئەیچێنن، بە نیازی پاک
لاوانێک لە پشتی ئەوان دێنە خوار
نە فرمێسک، نە ناڵە، نە هەناسە و خەم
ئینسانی ئەو حەلەی بۆ خۆشی هەوڵدەر

ئەمەیە ــ کە لاوان کردوویانە ــ ئیش...
لە ڕێگای ئامانجا لاو ناکا سستی...
ئەمڕۆ بێ، سبەی بێ، بە ئامانج ئەگەن...
بەهەشتێک ئەڕوێنێ بۆ گشت لە رووی خاک!
دنیایەک ئەبینن دوانزە مانگ بەهار.
ئەو دنیا جوانەیان ناخاتە ژێر تەم!
بێخەم و بەختیار ژین ئەباتە سەر!

(٤)

ئەی کۆترا! ئەی شاباڵ مەشخەڵی سپی!
ڕێگای ڕاست پێشاندەی بە لاوانی کورد
دوشمنی گەورەی کورد، ئیستیعماری پیر،
بە ڕاست و بە چەپا مل بپەڕێنن
ئەم چڵکاوخۆرانەی ئیمپریالیزم،
هەر یەکە لە لایەک دیکتاتۆرێکن
جوتەمان لێ ئەدەن، گازمان لێ ئەگرن،
ڕەخنەیان لێ بگرین ڕەخنەیەکی ڕاست
بڵێین: «لەل» وەکوو هار دەستئەدەنە شیر
ترساون، بەڕاستی ئەوەن ترساون،
حیسابی جووڵەی موو، دەنگی نەبزی دڵ
بۆیە تۆم پێویستە بۆ ڕێی میهرەجان
کورد لاوی هۆشیار و نەختێک خوێندەوار

بۆ گەشتی بوخارست ئەبێ ڕابەر بی
دوشمن ڕێی تەنیون بە داوی ورد ورد.
نۆکەری هاندراوە دەست بدەنە شیر
سزای ئاشتیخوازی لە گەل بسێنن!
پاڵەوان کەچەڵی ڕێگای فاشیزم
بۆ بێشەرمیکردن ئێسترە تۆڕێکن!
نەختێک حەق داواکەین لە داخا ئەمرن.
سوێن ئەخۆن بەخەروار، کە زۆر ڕەش بوو ماست!
ئەوەندە ترساون لە ئازادیی بیر!
هەموو لەش هەر گوێچکەن، هەموو لەش چاون!
ئەپرسن لەو لاوەی کە لێی ئەکەن سڵ!
لاوەکان لە دەستم نەچن، کۆتری جوان!
تاقە یەک شک ئەبا ــ بەڵکوو! ــ لە هەزار!

(٥)

لاوی کورد: زنجیری دەرەبەگ لە مل
یان لەپڕ ئەیگرن، ئەیخەنە ژێر چەک
یان لە ئیحتیکاری نەوتا پاڵەیە
یان کەمەرشکاوی کۆڵی گرانە
یان لەسەر سووسەیەک بیرو بڕوای سوور

شەو و ڕۆژ ڕەنج ئەدا بێ نان و بێ جل
بۆ ئیمپریالیستی ئاغای دەرەبەگ
ڕۆژی چەوسانەوە، شەوی ناڵەیە
بە ئەرزاکشانی بۆ سواڵی نانە
ئەینێرن زنجیربەند بۆ زیندانی دوور!

ئەگەر هات بەڵگەیەک کەوتە دەست میری!
وا قورس بێ چەپۆکی کۆنەپەرستی
ئەم لاوە کەمانەی کە خوێندەوارن،
ئا لەبەر ئەوەیە زۆر بە خەمخواری
لە ڕەمزی بەرزی تۆ وەهام تکایە:
تا ئەبیەی ئەیخەیتە کۆڕی میهرەجان
لەو کۆڕە پیرۆزو بەرزەی لاوانا

هەر سەرە و ئەپەڕێ بە دەمی شیری!
ئیتر لاو چۆن ببا بۆ قەڵەم دەستی؟
ڕێگاپێشاندەری گەلی ژێر بارن،
ئەسپێرێ بە تۆ لاو لە کوردەواری!
شاباڵی سپیتی بۆ بکەی بە سایە
با دەمی بگاتە لاوانی جیهان
بنوێنێ «ئاشتیخواز» لە کوردستانا!

(٦)

ئەمەوێ لاوی کورد بخاتە سەر دەست:
بیگێڕێ بە ناو گشت دەستەی لاوانا
ئەڵێ من کوردم و دواکەوتوو و بچووک
شەبەقێک هاتۆتە ئاسۆ بۆ ئینسان:
شەبەقێک لە ڕۆژی مارکس و لەنین
ئێستاکە خەلیفەی گرانبەهای ئەو
ئەو ڕۆژەی کە ڕەنگی پێست، ژمارەی سەر،
لە ڕۆمانیا چەند ڕۆژێک هەتاو
ئەگەڕێ، تەماشا ئەکا و ئەبینێ:
لە شوێنی کەلاوەی وێرانی مێژوو
کەچی شەڕفرۆشی خاوەنەرمایە
مرقی خۆش کردووە ئەم دەزگا جوانە

ئەو دڵە گەرمەی خۆی کە پڕە لە هەست
هەستی خۆی جاڕ بدا بەناو جیهانا!
ئەترسم ببینرێم بە چاویلکەی سووک.
نانوێنێ بچووکی و گەورەیی گەلان...
مەشخەڵ بوو بۆ دەستی هاوڕێ ستالین
جیهانی پێ ئەبا بۆ ئاشتی بەدەو...
جیاوازیی چین و دین ئەگرێ بەرامبەر
بۆ لاوی کورد ئەکا بە زاخاوی چاو!
گەلێکی تێکۆشەر ئەژی، چ ژینێ؟
دایناوە چکۆشکێ بە مێشک و بازوو
دەستێکی میکرۆبە و دەستێک بۆمبایە
خاپوور کا و بایەقوش تیا بگرێ لانە!

(٧)

بەڵام، ئەی باڵداری سپیی ئاشتی!
لاوانێک کە ئێستا لە بوخارستن
بڕوانە ماسوولکەی لەشی پۆڵایان
بڕوانە یەکیەتیی مێشک و دڵیان،
ئەمانە خۆیان و گشت هاوتەمەنیان
لەشکرین، ئامادەن ببن بە عەسکەر،
ناخۆشە ئەگەرچی لە ژیان بووردن،

دووبارە پێت ئەڵێم گەرچی پێم وتی:
نوێنەری گەلانی ئاشتیپەرستن!
بڕوانە پرشنگی عەزمی نیگایان
بڕوانە ئارەزووی بۆ ژین بەکوڵیان،
بۆ پاسی ئاشتیی دنیا و وەتەنیان،
پێویست بێتە پێشێ درێغ نەکەن سەر!
بەڵام ناخۆشترە بە سەرجەم مردن!،

## (٨)

لاوی کورد کە گرتی ڕێی گەڕانەوە
بە دیاریی ئەم بیر و باوەڕانەوە،

بەیداخێک هەڵئەکا وێنەی تۆ لەسەر
بۆگشت لای وڵاتی ئەکا بە سێبەر،

ئەو حەلە دوژمنی بە شەڕ قنیاتکەر
وەک لاکێک لە ماڵمان ئەکێشینەدەر

دوای ئەمە ئێمەین و نوێکردنەوەی ماڵ:
هەر دە ساڵ لە تەئریخ ئەبڕین بە یەک ساڵ،

ئاوی چەم ئەکێشین بۆ سەر لووتکەی شاخ
بەردی ڕەق دەردێنین، جێی ئەکەین بە باخ

لەسەر هەر لووتکەیەک، تەپۆڵکە و یاڵێ
هەر بنـدار بەڕوویەک، ئەکەین بەماڵێ

درێژیی ناو دۆڵ و پانایی ناو دەشت
بە تەلاری جوان جوان ئەکەین بە بەهەشت

زەوی‌وزار بە بەری ڕەنجی تراکتۆر
عەمارمان پڕ ئەکات لە گەنمی زۆر

نەوتمان، کارگامان، بەرهەمی کانمان،
نادزرێ و نرخەکەی دێتە گیرفانمان.

چ خێری نیشتمان، چ ئارەقی ڕەنج
کوردستان سەرانسەر پڕ ئەکا لە گەنج!

باغچەمان سەرانسەر گوڵی ئەپشکوێ
بولبولمان فێر ئەبێ بە ئاوازەی نوێ

تەنانەت لە بێشکەی ساوامان، گریان
ون ئەکا، موعجیزەی بەختیار ژیان!

# شەهید

بە یادی شەشی ئەیلوول، شەڕی بەردەرکی سەراوە

هەزار و نۆسەد و سی بوو، شەشی ئەیلوول کە ڕۆژ هەڵهات:
غریوی ویستنی حەق کەوتە ناو شاری سلێمانی؛
«هەڵۆ بەگ» ئەو جوانەی پڕ دڵی بوو بۆ وەتەن ئاوات،
لەپێش جەمعێکەوە تا بەرسەرا ڕووی هەڵمەتی هانی.

لەگەڵ یارانی ئەیوت: «ئەی حوکوومەت! تا نەکەی تەسبیت
حوقووقی کوردەواری، نایەوێ کورد ئینتیخاباتت؛
ئەوانەی بانگکران و تۆ بە قووەت دەوریان ئەگریت:
دەنی و قازانجپەرەستن، هیچ نەبێ پێیان موبالاتت!

ئەوانەکەی لەمیللەت بوون هەتا تەمسیلی ڕەئیی کەن؟»
حوکوومەت! ئێمە کوردین، وا ئەڵێین: «نامانەوێ نوواب
کە داوێنی غەرەز بگرن بە هەردوو دەست، وەتەن بەردەن!
نەکەی، مەشرووع نیە، دەرکە لە سەر سەودایی ئینتیخاب...»

ئەمە جوملەی قسە و ئامالی یارانی هەڵۆ بەگ بوو،
نە نامەشرووعیی تیا بوو، نە تەجاوز بوو بە ئەمنییەت...
کەچی عەسکەر بە مەترالیۆزەوە بۆ قەتڵی عام دەرچوو؛
درایە بەر شەقەی شەستیر ڕجا و ئامالی میللییەت!

شەقەی شەستیر و قرچەی دەسترێژ و هەڵمەتی سونگی
بە خوێنی کوردی بێتاوان شەپۆلی خستە سەر جادە:
نەما جوانێ کە سونگی نەیسمیبێ سەد کەڕەت سنگی،
نەما پیرێ لە ڕیزی گوللە بوو بێ قەلبی ئازادە!

هەڵۆ بەگ گوللەیی ئەووەڵ لە ڕانی دا، دووەم دەستی:
کە خۆی و قەومەکەی وا دی، بە چەشنی شێر نرکانی،
پەلاماری کە دا بۆ زابتێ: یەک زللە خپ خستی،
دەمانچەی سەنگ لە دەستی و ئاگری دا تاوەکوو توانی...

بەڵام فیشەک نەما، هەر زابت و یەک دوو نەفەر کەوتن...
لەپاشا عەسکەریش دەستڕێژی لێ کرد و بە لادا هات؛
لەسەر دەریایی خوێن بووکەشتیی عومری بەرەو مردن
ئەچوو، ئەیوت: خوا حافیز، ئەوا ئەمرم وەتەن! هەیهات،

لە باوەشتا پشووی عومرم نەدی تاوێ بە سەربەستی،
هەتا مردن زڕەی زنجیری دیلی بوو لە گەردنما،
ژیانم عار و زیللەت بوو لەژێر پێڵاوی دوشمنما،
بە خوێن بێ و گڵ هەڵیلووشێ، کەوابێ، هەیکەلی هەستی!...

خوا کەی بولبولی باغی سەرا! هەرچەندە پاییزە،
بە خوێنی خۆم گوڵت بۆ ئاو ئەدەم، سا بۆم بلاوێنە!
لەگەڵ ئەو جوانە پاکانەی لە دەورم مەیتیان ڕیزە
لە خوێنا وێنەشێواوین، بە دایکمان بناسێنە!

بڵێ بەو بووکی تازەی یەکشەوەم گەر هاتە سەر نەعشم،
نەڵێ خۆی بۆ وەتەن کوشت و لە ڕێی عەشقی منا نەژیا
وەزیفەم بوو لەپێناوی وڵاتێکا سەرم بەخشم:
کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوێنی چیا و کەژیا!

ئەگەر خوای گەورە بەخشیی پێت هەتیوێ، پێی بڵێ: ڕۆڵە
لە من فرمێسکی ویست باوکت، لەتۆش داوا ئەکا تۆڵە!

**هەڵەبجە. ئەیلوولی ١٩٣٢**

# زیندانی ئەژدەهاک[1]

## بۆ بتەکانی فاشیزم

ئەژدەهاک! زیندانت قەڵاقەڵایە؛ دیواری کۆنکرێت، دەرگای پۆڵایە.
ئەژدەهاک! کونبڕە، سەختە زیندانت، ناڕووشێ بە بڕبەن بەندی گرانت!
هێزی لەش‌مرێنە کۆت و زنجیرت؛ کارییە لە دەمار ناپاکیی بیرت.
دڵڕەقیت هەر تاوە چەشنە سزایە بۆ بەندیی خاوەنهۆش ئەخاتە کایە.
هێند چەشن سەربڕ و زیندانەوانت، سەرخۆش بە خوێنی گشت بەندیەکانت!
ئەژدەهاک! ئەی دێوی لە «بیر» زراوچوو، ئەی ناشتای مارانت بە مێشک کردوو!
ئەو مێشکتازانەی زنجیرت کردوون، لە لێوی پێچاڵی مەرگا ڕاتگرتوون،
چاوەڕێ فەرمانن بە ڕێی نەهاتا ببڕێنە بەر تەناف لە نۆرە و کاتا،
مێشکیان، ئامانجیان، هیوا و تاسەیان لە پەتا بتاسێ وەک هەناسەیان!
ئەمانە گشت ئەڕۆن، ئەیانڕەوێنی، هیچ نەبێ لە بەندا ئەیانڕزێنی...
بەڵام تۆ، ئەژدەهاک، لە هەڵپەی خۆراک ــ ناتوانی بکەوی بۆ ماری ناپاک؛
هەر ئەگری، ئەکوژی، ئەدەی لە گەردن، مێشک دەرخوارد ئەدەی بە ماری نەوسن...
تا ڕۆژێک ئەو خوێنەی بە ناحەق ڕشتت، ئەو بیرەی واتزانی تێجگاری کوشتت،
تاو ئەدەن تەنووری دەماری کاوە، ئەو چەکوشەشێنەی ڕۆڵەکوژراوە
ئەخرۆشێ و ئەجۆشێ و کۆمەڵ یەک ئەخا، هەر هەڵسا و ئەبینی زیندانت ڕووخا!
ئەو حەلە هەر لاوێ لە زیندانتا مرد ئەبێتە مایەی بەخ بۆ نەتەوەی کورد؛
لە بنکەی پەیکەریا ئەنووسرێ ناوی لەگەڵ گشت کردەوەی پەسەندکراوی!

سلێمانی ــ ١٩٥٣

---

١) ئەژدەهاک: زوحاک. سووککراوی «ئەزیدهاک»ە.

## بەستەی نەبەز

من ئەو دیلەم لە زیندانی تاریکا
هەتاوی بیر ڕووناک ئەکا بەرچاوم؛
بە ناو هەزار حەڵقەی داوی باریکا
قەفی زنجیر ئەپچڕێنێ هەنگاوم!

من ئەو دیلەم لە پشت شووڕای پۆڵاوە
ئاسۆی هیوای گەشم هەرگیز ون ناکەم؛
لە ڕووی ئاسمان بە گڕی سوور نووسراوە
بەندە بەندەی ئاییننامەی بڕواکەم!
من ئەو دیلەم ئامانجم قیبلەی گشتە؛
با سامدار بێ و پڕدڕک بێ ڕێی ڕاستم،
مادام هێزی زوربەی گەلم لە پشتە:
دڕک گوڵە و ترس ئارامە بۆ خواستم!

من ئەو دیلەم کە سرنجی بێباکم،
سڵ لە چاوی پڕ لە قینی زەق ناکا؛
دانەچیرەی گورگی هاری سەر لاکم
زاتی گیانی نەلەرزیوم لەق ناکا!

من ئەو دیلەم کە دیلکەری زۆردارم.
دڵی لەبەر گوڕی ناڵەم ئەلەرزێ؛
تا شرتر کا کەڵبەی لەشی زامارم،
خۆی خراپتر لەناو خوێنا ئەگەوزێ!

من سەربازی ئامانجێکم: پیرۆزە،
فیداکاری ڕێگایەکم: بێگەردە،
ڕەنجێک ئەدەم ڕەنجی پیاوی دڵسۆزە،
لە ڕێیەکا بێباک ئەمرم: ڕێی مەردە!

سلێمانی ــ ١٩٥٣

# لە بنی بیرا

وەک قرژانگ و وەک مشک و مار
بەم کونەدا هاتوومە خوار

بە چنگ، بە پێ، بە پاچ، بە دان...
هەڵئەکەنم بۆ خۆم زیندان!

تا هەڵکەنم ڕۆتر ئەچم
هەی قوڕ بە سەر کوڕ و کچم!

بەو ڕەنجەی من بۆیان ئەدەم
تیکەی وشکیان ناگاتە دەم!

خۆیشم، لە بنی بێ ئەرزم،
بۆ تاریکی و ترس ئەلەرزم،

تەقە و ڕەقەی پارچە ئاسن،
کە دێ و دەچێ بۆ سەرو بن،

پڕ ئەشکەوتێک سام و گومان
ئەخاتە دڵ بۆ داخورپان!

هەوای نەفەس گەرووگیرە،
قەنارەم قوولایی بیرە!

هاکات زانی بە (گاز) خنکام!
یان ئاسنێک لە کەللەی دام

یان باسقەنەی نەوتی لەپڕ
بۆ ئاسمانی هەڵدام بە گوڕ!

کە من مردم، کچ و کوڕم
ئەخۆن لە کام کاسەی پڕم؟

کێ نانی وشک، کێ بەرگی شڕ،
پەیدا ئەکات بۆ کچ و کوڕ؟

بەری ڕەنجی عومری درێژ
گشت کەوتە لای ئارەقەڕێژ

کردەم بردەی کۆمپانی بوو:
هەم ڕەنجم چوو، هەم نەوتم چوو!

بڵێن دەرچووم لەبنی بیر:
بێهێز، پشتکۆم، ڕیشسپی، پیر!

ئەوسایش پەنا بۆ پەککەوتوو
هەر مردنە و، مردنی زوو!

تا گەل کاری ناوخۆی وا بێ،
کوڕیش ژینی چاتر نابێ!

ئەویش وەک باوک، ڕێی کوڵۆڵی
ئەبڕێ و، ئەبێ بە نەوت خۆڵی،

ئەو نەوتەی مام کۆمپانیمان
پوختەی سوودی ختە گیرفان!

ئێمەیش لە گەنجی ڕەنج و نەوت
ئاخمان بەرکەوت، داخمان بەرکەوت!...

سلێمانی ــ ١٩٥٣

# بۆ مایکڵ

ئەی ڕۆڵەی «ئەسیل»و «جۆلیۆس»، ئەی «مایکل»!
جەورێکە کراوە لە باوەڕ بە داد،
کێردێکە بە دەستی خوێناویی تاوان
ئەسیل و جۆلیۆسی دایک و باوکی تۆ
ئەیانویست زانستیان، بەری مێشکیان،
نەک دەزگای دۆزەخی قەڵاچۆکاری
تاگۆشتی گیانداری ڕووی بە یەک ژەم
ئەم پاکیی و پیرۆزی و بەرزیی نیازە
هەر لەبەر پەیکەری سەربەستیی بەرزا،
پەیکەری سەربەستی بە چاوی خۆی دی
لە پەرەی تەئریخا سەرەک لەنکۆڵن
کوژران دایک و باوکت، بەڵێ، لەناو چوون
تۆ و ڕۆبەرت ئێستاکە جووتێک هەتیون
کە تا مرد بۆ دایکت هۆی گەشی دڵ بوو

ئەوەی تۆی هەتیو خست: جەورێکە زۆر زل،
لە سەربەستیی زانست، لە بیری ئازاد.
دراوە لە جەرگی هۆی فەخری ئینسان
بۆ ئاشتی ئەیاندا لە یەک هەشت و نۆ...
بێتە هۆی ڕووناکیی بەرچاو بۆ ژیان.
دروست کا بۆ دەستی سەرمایەداری،
دەرخواردی دێوێک بەن دایپچڕیوە دەم.
بە تاوان دانرا لە دنیای تازە...
وەک قۆچی قوربانی دران بە ئەرزا!
وڵاتی: دوو زانای مردن، لەسەر چیی؟
سەرشۆڕە لە شەرمی زانا واکوشتن!
لە ڕێی باوەڕیانا بەقوربانی بوون!
خەمخواردن ئەو بزەی لە لێو بڕیون
دوا نامەی بۆ بزەی لێوتان بە کوڵ بوو؟

* * *

ئەی مایکل! ئەی ڕۆبەرت! ئەی نازدارەکان
لێتانی شاردەوە هەوری ڕەشی مەرگ
گرانە، ئەزانم، بێ دایک و باوک مان
بەڵام، گەر ئەسیل و جۆلیۆسی زانا
ژمارەی هەتیوی ئینسانی هەژار
دوایی، بەرخەکانی نەوەی ڕۆزەنبەرگ
لەجیاتیی دایکێک و باوکێک، یەک ملیار
باوەشی گەرم تیایە ئەم ڕووی جیهانە

ونتان کرد باوەشی گەرمی دایکتان!
پرشنگی باوکێتیی جۆلیۆس ڕۆزەنبەرگ
بۆ کۆرپەی وەک ئێوەی ئێکسوک و جوان،
نەبوورن لە خۆیان لە ڕێی ئینسانا،
دوو نابێ... ئەگاتە سەدهەزار هەزار!
ئێستاکە لای گشت کەس بوون بەکزەی جەرگ
دایک و باوک دایناون بە ڕۆڵەی نازدار!
بە گەرمی بۆ ئێوە ئەبێ بە لانە!

سلێمانی ـ ١٩٥٣

# بانگێک...
# بۆ پۆل ڕۆپسن...

ئەی بولبولی ئاشتیخوازی، پۆل ڕۆپسن!
دەمیان گرتی، نیازیان هەبوو ئاوازە
بەر نەگیرا بۆیان لە ڕۆژ، ناچار بوون
ئەو شێتانەی ساز و کەمان ئەشکێنن،
نایەڵن بێی، بۆ گەلانی ڕۆژهەڵات
ڕۆژهەڵاتمان: لای ڕووناکی ئاشناتە،
چاوەنوارین قەفەسی کۆن بشکێنی،
(جۆلیۆ نەیوت: ڕاستی و گۆرانیی ڕۆپسن
بمانگەیێ و بە ئاوازەی وەک هەنگوین
وا بخوێنی کە سپی و زەرد لەگەڵ ڕەش
سپی و زەرد و ڕەشی ڕێگای یەکگرتن
پۆل ڕۆپسن! ئەی پۆل ڕۆپسن!
تا ناو دۆڵی دوور و کلای کوردستان،
کوڕی ساوای حەوت ساڵانم ئەتناسێ،

ئەو شێتانەی لە خوێندنت ئەترسن
قەدەغە کەن لە گوێچکەی دنیای تازە.
ڕێی فڕینت لێ ببەستن بۆ دەرچوون!
بولبول ئەگرن، پەڕی باڵی دەردێنن،
بەستە بڵێی، تیژ کەی ئاگری خەبات!
لای شەویشی بێدارە، دڵی لاتە،
پەساپۆرتی دەنگ لە سنوور بنوێنی،
بێ پەساپۆرت سنوور ببڕن، نەترسن؟)
لە ناومانا بخوێنی بۆ: ئاشتی و ژین!
گوێت بۆ شل کەن وەک بەک دڵ و وەک بەک لەش!
تینووی گیانی گۆرانیتن، پۆل ڕۆپسن!
پاڵەوانی ئاشتی! بولبولی وتن!
ناو و دەنگت ئاشنان بە گوێچکەی ئینسان.
ناوت ئەبا، وەک هی مامی دراوسێ!

سلێمانی ــ ١٩٥٤

# لە زیندانا چواردەی تەمووز

دەنگێکی دوور،
دوور... ئێجگار دوور...
بە ئاستەمێک ئەگاتە ژوور!
ئەی دەنگی دوور،
بە ئاستەمێک ئەگەیتە ژوور!
ئاخۆ سپییت یان ڕەش یان سوور؟
وەرە پێشتر...
چۆن ئاو ئەڕژێتە ناو ئاگر،
لە ڕێی گوێوە، بڕژێرە گیان،
زیندانم پڕ کە لە کۆڵدان!
زنجیری پێ،
کپ بە تاوێ، وەک لۆکەی گوێ!
هەوای شڵەقاوی زیندان،
بنوو، وەک بەرمەمکان ئەنوێ!
با دەستڕێژی ئەم دەنگەی دەر
گوللەی مانای، گوێم بپێکێ
بەڵکوو گڕەی تینوێتیی سەر
وەک تۆپ ناڵەی بێ و بتەقێ!

* * *

لە لێشاوی غەڵبەغەڵبا
بانگێکی دا لە گوێچکەم «با»:
«...ڕژێمی جەمهووری بژی!»
خەو ئەبینم! جەمهووریی چی؟
ــ نە ، خەو نییە...
شایلۆغانی جەمهوورییە:
ئەم دەنگ و مژدەی دوورییە!

سا لەشی زیندانی مردوو:
بێرە سەما!
ئەی لە بستێ گۆڕا زیندوو:
مردن نەما!

بەندیخانەی بەعقووبە ـــ ١٩٥٨

•

# بت، بتەوان

**ڕابووردوو:**

**هەبوو، نەبوو**
**سەردەمی زوو**
**بت، بتەوان،**
**پیرە شەیتان**
**بتدروستکەر**
**بتەوان گۆشدەر**
**بتپەرستی بەئاینکەر**
**ڕەگداکەوتووی ئیمپریالیست**
**خوێنمژی ئاسایش نەویست!**
**بت، بتەوان**
**پیرە شەیتان**

**بتپەرستیان دابووە بەر**
**تێیان ئەخوڕی، وەک گا، وەک کەر**
**ــ دەی! لەشی بت بگرەرە زێڕ**
**شەیتان تێر کە بە خێر و بێر**
**جێگا خۆش کە بۆ بتەوان**
**لەسەر سەر، گلێنەی چاوان!**
**شەیتان و بتەوان و بت،**
**بەرامبەریان کەچ کە ملت؟**
**هەر بت خوایە!**
**هەر بت خوایە!**
**هەر بتپەرستی بڕوایە!**
**هەر شەیتان، بت، هەر بتەوان!**
**بڕواکانی‌تر هەموو بان**
**ڕوو لە خاکی بەرپێی بت سوو**
**یەک بەری ڕەنج بکە بە دوو،**

بیهاوەرە جانتای شەیتان،
بۆ بتەوان!
زمان لاڵ کە، گوێچکە کەڕ کە
کوێر بە، وەک کەر زەڕە زەڕ کە!
بۆ بتەوان
بۆ بت، شەیتان،
بۆ نۆکەریان!
ئارەق ڕەش و شین بڕێژە،
هەزار دەردی سەر بچێژە،
کۆشک دروستکە و باغ بنێژە،
بۆ بت، بتەوان و شەیتان...
هەر ئەمەیە مانای ژیان،
ڕاست و دروست
بۆ بتپەرست!

ــ بتپەرست نیم،
نابم و نیم،
کابرایەکی ڕووت و برسیم،
ناساخ، گیرۆدەی نەزانیم
بۆ بەرگ و ناوماڵ پەڕپووتم
بۆ خۆم ئەوێ بەری جووتم،
بڕوای من بە سبەینێیە
مژدەی ڕزگاریمی پێیە،
لە برسێتی و لە هەژاری
لە نەزانی و دەردەداری
لە ستەم و جەور و بێگار
لە قەدەغە و ئەشکەنجە و دار
ئازاد ئەبم،
پاش دڵتەنگی دڵشاد ئەبم!
بتپەرست نیم،
نابم و نیم...

کابرایه کی ڕووت و برسیم
به هیوای پاشەڕۆژ ئەژیم!
هێزی باڵ تک تک ئەڕێژم!
نەمامی دواڕۆژ ئەنێژم!
خوار و ژووری ئەم عیراقه،
شین ئەکەم وەک کەوای تاقه!

ــ هەی کفرکەر...
هەی ڕووخێنەر...
هەی تاوانی...
هەی نانبڕی بتەوانی...
نەموت کەڕ بە؟ نەموت کوێر بە؟
نەموت عیلمی لاڵی فێر بە؟
بیری نوێی پیس لە سەر دەرکە،
هەزار دەق خۆت گەوج و کەر کە؟
تیره خاکی بتپەرستە،
تەنیا بە چپە دروستە،
ڕاپۆرتی ڕاست بدەی بە من،
بەڵام درۆ:
«گیانم: درۆ!
ژینم درۆ!
دەستمایەی ئایینم، درۆ!»
بتپەرستێک پێی ڕەوایە
جاڕی دا، پڕ بەم دنیایە!
لە تۆم ئەوێ بیر بگۆڕی
ڕەنگ بگۆڕی
دەنگ بگۆڕی
بڕوای پیاوی ژیر بگۆڕی!

ــ بتپەرست نیم،
نابم و نیم،

ئاواتەخوازی سەربەستیم
خەبات ئەکەم بۆ ئازادیم...
ئێستا شەوە،
گەرچی شەوە،
چاو بە خەوە،
بەڵام کاروان لەسەر ڕەوە
بەرەو قۆناغ ڕەو بە دەوە...
ئەو کاتە دێ کە ڕۆژ هەڵدێ
گوێ تێر ئەبیە و چاو ئەبینێ!
بێ ترس و لەرز،
لە چیای بەرز،
لە چەم و دۆڵ،
دێگەلی چۆڵ
لە نوێ یەک یەک ئاوا ئەکەم،
ئەخۆم، ئەنووم، ئەژیم بێ خەم!

ـــ بتپەرست نیم،
نابم و نیم،
تینووی سەربەستی و ئازادیم!...
ـــ ئەم کابرایە!
بێحەیایە...
بێبڕوایە...
بێ شەیتان و بت و خوایە...
دەی! یاساوڵ، دۆزەخەوان،
کێشی کەنە کونی زیندان!
زمانەکەی لە بن ببڕن،
گاز لە قوڕقوڕاگەی بگرن،
لە قوڕاوا بیگەوزێنن،
نینۆکی لە بن دەربێنن،
مووی سەر بە چەرمەوە بگروون،
برۆ و سمێڵ پاکتاو بدروون،

سەربەرەوخوار هەڵیواسن،
داخی کەن بە شیشی ئاسن
دەی، یاساوڵ! دوو چاوی زەق
دوو کاسەی خوێن،
ببڕە چاوی و دەم پڕ لە جوێن،
تێی بەربیە بە زللەو شەق
گورز و مەترەق
یا ئەوەتا، ئیمان بێنێ،
یا ئەوەتا...
هەتا... هەتا...
گۆڕی زیندانی تەنگ جێی بێ،
زنجیر بەندی دەست و پێی و بێ!

* * *

ــ ئێستا شەوە.
گەرچی شەوە...
چاو بێ خەوە...
سەرم گێژە...
شەو درێژە...
ئەی چاوی زام
زووخ بڕێژە!
ئەی شوێن ئەشکەنجەی مۆر و شین
با ئازارت پل دا چین چین!
تا وەک من، دیلی کولانە
کەڵەشێر جارِ دا: بەیانە،
نانووم لە تاو ئێش و ئازار
ڕائەژەنم لەشی زامار!
چاوی هیوام ئەبڕمە دوور،
سرنج ئەدەم لە ئاسۆی سوور!.
شەو درێژە،
ئازار سەختە،

دیزەی دڵ لە خوێن لێوڕێژە.
لافاوی ڕق نەختە نەختە،
گوڕ ئەخاتە هێزی زاتم
جۆش ئەداگەرمیی خەباتم!
لێکدانەوەی دوور و درێژ،
وەك کەشتی ئەمخاتە ناو گێژ
تاوێك ئەڵێم:
من چیم؟ من کێم؟
کابرایەکی بێدەستەڵات!
ئەی بت؟ ئەی بتەوان؟ شەیتان؟
خاوەندانی دەزگا و دووکان؟
خاوەندانی هێزی وڵات!
کەوابێتە، با مل کەچ کەم؟
لەپ لە ناو دەمی خۆم ئەدەم:
هەی ترسنۆك، هەی بێورە
پیاو بە! دان بە خۆتا بگرە!
لێو بکرۆژە،
پاش شەو رۆژە،
لەسەر خەبات
ئازایی و زات
بڕۆی تا سەر، ئەنجامی کار،
ئەبی لە دەستەی بت ڕزگار!
بت ورد ئەکەی، ئەیکەی بە خۆڵ
بتەوان ئەکوتی وەك دەهۆڵ
شەیتان ئەکەی بە پەڕۆی پەن،
ئەیهاویتە دوور لە وەتەن
دەزگای بۆگەن ئەڕووخێنی،
ژینی تازە دائەهێنی!

## ١٤ی تەمووز:

ــ کوانێ بتم؟
ــ کوشتم! کوشتم!
ــ کێ کوشتی کێ؟ بتم کوانێ؟
ــ من کوشتم، من... کێ نازانێ؟
بت زێڕ نەبوو، موقەببا بوو،
خولم پێدا تەنیا بە فوو!
موقەببا بوو، موقەببا بوو،
چەن گەوج بووم ڕۆژانی زوو؟
وام ئەزانی پێچکەی تەختی
دامەزراوە لەسەر سەختی...
کەچی بە یەک دەسترێژی تۆپ
تەخت وەرگەڕا، بەخت وتی: هۆپ!
ــ من بتم دایە دەست خاڵی...
پاسەوانی وەک گەماڵی
سەری خۆیشی و ئەویشی خوارد
ئەویش ئێسقانی بوو بە ئارد!
ــ ئاخ بتم ڕۆ! داخ بتم ڕۆ!
هەزاران وردە شتم ڕۆ!
ئەی بتەوان کوا؟ بتەوان؟
نابوومە ناو عەبای ژنان...
ئاخ بتەوان! داخ بتەوان!
عەباکەم لەسەر داماڵی،
لێی نەئەهات! دایکی ئاڵی!
گرتم خستم وەک دەڵەدێو،
تفم لێ کرد، پێمدا جنێو،
بە لەقە چوومە سەر ورگی،
کوتام تا مرد، مەرگی گورگی!

* * *

ــ سا مەرگ شەیتان!

بت، بەوان،
خوێنیان بڕژێ،
گەلی عیراق بیانکوژێ...
دەزگای گشت نەیرەنگ و فێڵم
لەم ڕۆژهەڵاتە جێ‌بێڵم
کەچی لە ترسی دەنگی دوور،
ناڵەی تۆپی سنووری سوور،
لە تاو قیڕەی ئاشتیخوازان،
بۆ قەدەغەی شەڕ لە ئینسان،
ناچار بم، سەری خۆم شۆڕ کەم،
بو کۆچ ناومالم لە هۆڕ کەم،
هەی داخە کەم!
هەی داخە کەم!

* * *

بتم شکان،
دوو بەوان،
کوژران، نەمان،
چنگ لەسەر شان!
لە نیشتمان!
ئێستا بە ڕاست بتپەرست نیم،
سەربەست، ئازاد، ئازا ئەژیم...
بەڵام هێشتا بۆ ڕزگاریم
لە دوژمن، برسێتی، ڕووتی،
نەزانی و دەرد و نابووتی،
ڕێم لەبەرە... نابێ کول بم،
دیلی بەنە و فیزی زل بم.
ئەبێ وەک پیاو، وەک پاڵەوان،
بە ڕەنجی شان،
کۆشکی وڵات بنیات بنێم،
وێنەی بەهەشت خۆش بکەم جێم!

دوژمنم: شەیتانی نەگریس،
ئەمریکا بێ، یان ئینگلیس
تا ماوە چاوی لێم زیتە...
«ئەمە خووی ئیمپریالیستە!»
بێت و ستیم لێ ببینێ،
کۆنەپەرست ئەورووژێنێ!
دەرەبەگ، کلک، کرێگرتە
هان ئەدا بۆ بۆڵە و خوتە،
بۆ کەڵەک و بۆ فڕ و فێڵ،
تەنانەت بۆ بە پاچ و بێڵ
خاپوور کردن...
ئەبێ وریا بم، وریا من!
من گەلم، گەلی عیراقم
عەرەب ئەم لاق، کورد ئەو لاقم
ڕێی کاروانم ناهێمن بوو،
شوێن بۆسەی هێزی دوژمن بوو،
مۆڵم دابوو لە شوێنی خۆم،
نەمئەوێرا بار کەم، بڕۆم...
وا ئێستا ڕێم بەرەڵڵایە
خواستی کۆچم لە دڵایە،
هێندە گەرمە کە ڵکەڵەی سەرم
وەک گوللە تیژ تێئەپەڕم!
بەسەر ڕێگای پێشکەوتنا،
ڕێی خۆبەختیارکردنا!

بەعقووبە. تەمووزی ١٩٥٨

# شۆڕشگێر

**بەبۆنەی ١٤ی تەمووزەوە**

بۆ تێجگاری سارد بووەوە و دای‌دا چۆک،
کەڵبەکەوتووی بێ‌نینۆک

لەکاتێکا لەناو خوێنا ئەگەوزا،
خزمەکانی لە تاریکی ژێر ئەرزا

دەستیان کرد بە چپەچپ:
«ئاغا» ئەیوت: گاجووت قووتدان کردی‌خپ!
بە دەم بینی لەرزینەوە سەر جاسووس،
دای لە ڕان دەستی ئەفسووس،

وتی: ئەوەی کوشتی ــ یاران! ــ نوستن بوو،
بێئاگایی لە خشەی پێی دوژمن بوو!

کەللەیەکی ژێر مێزەر،
بزنە ڕیشەی سابرێنانە مرقێنەر،
وتی: ئەوەی کوشتی حەرامخواردن بوو،
بۆ خوا خێر نەکردن بوو!

ورگنێکی کۆنە حاکم هاتە ڕوو،
وتی: «گەورە» دز بوو، بۆیە زوو تیاچوو!
سەرەک پۆلیس، بە سرکە،
پێشانی‌دا کە چاو بۆ کوێر بە کەڵکە...

کوێر نەبوایە نەئەمردا!
بازرگان دەستی پێ کرد،

وتی: گەورەم، هەر تەماعی زۆر کوشتی،
تەماع دای لە ئەرز پشتی!

سەرپزیشکی تایبەتیش هاتە دەنگ،

وتی: بە ڕاست، هۆی مردنی پەنگ بوو پەنگ:

کێمی سفلیس گەیشتبووە ناو جەرگی
دەرمان نەما ڕۆژێک دواتر خا مەرگی!

ــ شەل نەبوایە ڕای ئەکرد،
بە قەڵا پەنای ئەبرد!

ــ پۆکەر کوشتی!
ــ ڕایسس کوشتی!
نە ء، ویسکی:
بوو بە گڕی ئاگر و چووە ئێسکی!

لەپشتەوە شەپقەزلێک وەستابوو،
«ئەو چاوزەقە دزی نەوت و خورما بوو!»

ڕووی هاوخەمیی گێڕا بە خزمانا گشت،
وتی: هەی داخ! نازانن کێ گەورەی کوشت؟

یاساوڵە کەتە کەی ژێر ئاڵای سوور
کە چەقیوە وەک میل لەسەر ئاسۆی دوور

ئەو تەقەی کرد و کوشتی،
ئەم خوێنە هەر ئەو ڕشتی!

کەڵبە کەوتوو کە درابوو بە ئەرزا،
لە ناو خوێنا تلێکی تریش گەوزا.

بە هەناسەی ساردەوە ئەیوت: مردم...
زۆر بایی بووم، باییبوون وای لێ کردم!

* * *

لە لێشاوی کۆبوونەوەی گەل، یەک دەنگ
وتی: سەرباز ــ بژی! ــ کوشتی بە تفەنگ

سەربازی لاو، ڕۆڵەی دڵسۆز و ئازا
بەرەو ڕووی گەل بە گوڕ پەنجەی ڕاکێشا:

ـــ من نیم، ئەوە، هەر خۆیەتی کۆڵنەدەر،
کۆنەڕووخێن، بنیاتی تازە دانەر!

بە عقووبە. تەمووزی ١٩٥٨

•

# تاسەی دیدار

به زمان دایکی کوردستانەوە بۆ برا فەیلییەکان

ڕۆڵەی دووری ئاوارە بووم
کەللەی پڕ بوو لە ئارەزووم
سەودای سەری، تاسەی دڵی
خۆزگە و ئاواتی بەکوڵی
هەر ئەوە بوو: کە باڵ بگرێ
وەک مەل، تا باوەشم بفڕێ!
دەم بنێتە دەمی کانیم،
دەست بکاتە ملی لووتکەم،
گوێچکە شل کا بۆ گۆرانیم،
بۆم پێکەنێ وەک خوڕەی چەم!
بەڵام ساڵان،
ساڵانی زوو،
کوندەبەبوو
کوندەبەبووی شووم ئەیقڕان:
قەدەغە بوو لە مناڵان
بۆ گۆی مەمک بەرن دەمیان،
قەدەغە بوو دەستی دایک
بنێتە دەم ساوا مەمک!
سەردەمێک بوو،
کوندەبەبوو،
قەل ئەیقڕان،
گورگ ئەیلووران،
پڵنگی دوو پێی دارستان
شارستانیەتیی ئەلەرزان!
ڕۆژ تاریک بوو، ڕێگا ترس بوو،

«جووڵە» پەڵپی هەزار پرس بوو...
ڕۆڵەی دووری دەشتنشینم
ئەبوو، هەرگیز، تێر نەبینم!
ڕۆڵەم لەگەڵ ڕۆڵەی دیجلە،
لەگەڵ ڕۆڵەی دیجلە و فورات:
لە خوێناوا ئەیکرد مەلە،
بە خوێنی جەرگ ئەیکرد قنیات!
ڕۆڵەم دیل بوو،
دیل زەلیل بوو،
ڕۆژی شەو بوو،
شەو بێخەو بوو،
پۆلیس وا بە سەریا زاڵ بوو
وەک کۆتر نێچیری داڵ بوو!
سەرەڕای هاودەردیی دیجلە،
ترس هەبوو، شەق و زللە،
وشەی کوردیی سەر زمانی
باتە قەڵەم بە تاوانی!
بەڵام ڕۆڵەی من و فورات
ڕۆژی پیرۆزیان لێ هەڵهات،
چواردەی تەمووز پچڕی زنجیر:
لەسەر مل لاچوو دەمی شیر،
پرشنگی ڕۆژی ئازادی
وێرانەی پڕکرد لە شادی،
بای فێنکی زەردەخەنە
بەسەر کوڵماکەوتە شنە،
چاو وەکوو گوڵ مەستی ڕەنگ بوو
زمان بەستەی خەستی دەنگ بوو،
کوڕ کۆشی دایکی کەوتە بیر،

دایک مەمکی پڕ بوو لە شیر...
ئەوا، ئێستا: خوشک و برا،
برا و برا،
لە یەکتری بوون ئاشکرا.
هەر دەستە، هەر دەستە گوشرا،
تینوو تینوو! لە مل کرا...
هەر ڕۆڵەی دوور کوردستانە
لە کۆشی دایکا میوانە!

سلێمانی. ئابی ١٩٥٨

# بۆ سەربازی جومهووریمان

ئەی لاوەکان!
باوکان، دایکان، برا و خوشکان،
دەزگیرانە چاوجوانەکان،
تیر تیر دەستیان کردە ملتان،
ماچیان کردن،
بە پەلەپەل... بە پەلەپەل...
بڕۆن بۆ ژێر بەیاخی گەل!
چەک هەڵگرن،
بەرگ بپۆشن،
وا بورووژێن، وا بخرۆشن:
دابلەرزێ دڵی دوژمن!

ئەی لاوەکان!
ئێستا دایکان
لە سنگ نادەن،
شیوەن ناکەن،
کە کوڕیان ئەچێتە ژێر چەک!
شوکری خوا ئەکەن هەزار لەک،
کە کوڕیان بۆتە شێر بۆ گەل،
دوژمنی گەل ئەکا پەل پەل!
باوکان دەستەئەژنۆ و خەمبار
دانانیشن وەک پار، پێرار،
چونکە کوڕیان بوو بە سەرباز،
کز و بێناز،
بێگار ئەکا بۆ ناپاکان!
ئێستە خوشکان،
خەم سیس ناکا گوڵی ڕوویان
بۆ دەزگیرانیان، بۆ کاکیان،
ئێستا کچان،

گشت ئافرەتان،
گوڵبارانی سەرباز ئەکەن،
خۆیشیان وەك پیاو سەرباز ئەدەن!
چونکە دەزگای تازەی وڵات
بە بێ خەبات،
بێ پاس و بێ پارێزگاری!
سەقام ناخوا هەرگیز کاری!
تێری، پۆشتەیی و شادیمان،
سەرفرازی و ئازادیمان،
بەیاخەکەی «جومهووری»مان:
هۆی شانازی و ڕووسووریمان،
گشت لەسەر خەبات وەستاوە،
ئەویش پیشەی ڕۆڵەی لاوە!
ئەی لاوی کورد!
ئەو ڕۆژە مرد:
کە من و تۆ و درشت و ورد
لە سەربازی سڵمان ئەکرد!
ئەو ڕۆژە چوو
کە ئەوەندەی شەو تاریک بوو!
ئێستا ڕۆژی جومهوورییە،
ڕۆژی مەردی و ڕووسوورییە!

بڕۆ ئەی لاو،
وەك کوڕی پیاو،
بەرگی خاکی بکەرەبەر،
لە قوبەی ئاسمان بسوو سەر!
وێنەی شێری چەش بنوێنە،
دڵی دوژمن داخورپێنە،
دوژمنی گەل،
هیی گشت جیهان،
کە ئەگێڕێ چاوی بۆ هەل،

ئاگر هەڵسێنێ لە خەرمان،
ئاگشت ئینسان
بێسەر کا وەک قۆچی قوربان!
تا ساوای ناو بێشکەی سوتاو
لە شیش دا وەک جەرگی برژاو...
ئەی ڕۆڵەی کوردا!
ئیمپریالیست ئەو باوکەی مرد
کە برای عەرەب لەگەڵ تۆ
وەک جاران بکا ڕەنجەڕۆ!
بێت تەقە بێ لە تفەنگی
بە ملیۆنان مەردی جەنگی
پشتت ئەگرن،
وەک ژەشکەی کا ورگی ئەدڕن!
پتر لە ملیار ئاشتیخواز
پشتیوانتن، ڕۆڵەی سەرباز!

سلێمانی. ئەیلوولی ١٩٥٨

# مۆسکۆی جوان

ئەی مۆسکۆ! ئەی ژنی جوانی سپیپۆش!
بە ئاوازەی «ئۆرکسترا»ت وا مەستم،
لە هەنگوینی ئەفسانەی دانسی «بالێ»ت،
لەرەی دەنگی «ئۆپێرا»کەت کە تک تک،
خونچەی تەڕی چیرۆکی بەستەکانی
ئەی مۆسکۆی جوان،گەورەکچی ئوکتۆبەر!
لە ناو زیوی تەماگەش ئەجریوێنن،
«مەترۆ»ت ئەڵێی نوێنەگای نیگارە،
تاقەگوڵی سووری جقەی دانشگات،
ڕۆژ لەنینە و لەسەر سەرت وەستاوە،
مناڵەکەی ڕوومەتئاڵی تێرشیرت
بۆیە کۆتری سپی و نەرمی باوەشت
لە ناو بەفری بەرپێتا واق وڕماوم،

ناو دەمی ئاڵ پڕ لە گۆرانیی خۆش خۆش!
هەر شەپۆلی شیعرە و ئەدا لە هەستم!
بە هەردوو چنگ ئەخۆم وێنەی برسیی شێت!
لە ناوگوێوە نەشتەر ئەدا لە گورچک،
بۆم ئەپشکوێت وەک گوڵی بەربەیانی!
حەوت ئەستێرەی یاقووت کە داوتن لە سەر،
هەزار زوهرەی ئاسمانی شین ئەهێنن!
«مەیدانی سوور» جێی هەزاران هەزارە!
عەتری شەپۆل ئەدا ولات بە ولات!
ڕێگات ڕووناک وەک بەفری بەر هەتاوە!
گوڵی پارکی «گۆرکی» دێنێتە بیرت،
مل هەڵئەسوێ، بێ سڵ لە گەرمی لەشت!
لە کام جوانیت نازانم، بدرووم چاوم؟!

* * *

ئەی مۆسکۆ! ئەی ژنی جوانی سپیپۆش
هەتا ئەمرێ، منیش، هەتا هەتایە
بە شەو چەمی گەوهەربەندی پشتێنت
لە ناو ئاوا مۆسکۆیەکی نازدارتر،
جادەی شۆراو بریقەی دێ وەک بلوور،
تاکسیم ئەکشێ بە شەقامی بێگەردا
ئەم ڕەنگانە و ئەو پرشنگەی ئاوازە
یی هەست ئەمکەن بە زاوای بەردەمی بووک،

هەروەک: مەمێک زینێک ناکا فەرامۆش
دڵگیریی تۆم هەرگیز لە دڵ دەرنایە!
لێم ئەبێتە ئاوێنەی باڵانوێنت،
لەنجەی دانسی گیان پڕ ئەکا لە ئاگر!
تیا ئەلەرزێ «وێنە»ی گڕی سەوز و سوور،
بە سەر عەکسی وەنەوشەیی، یان زەردا
ئەیدا لە ڕووی پەنجەرەی کۆشکی تازە،
دەم بو ماچت ئەبەم موسکۆی ئیسکسووک!

مۆسکۆ. کانوونی یەکەمی ١٩٥٨

# ڕێگای لەنین

لەگەڵ کۆتر شوێن ڕووناکیی ڕۆژ کەوتم     نە ڕۆژ، نە شەو، نەحەوتم
چیا و چیا، دەشتاودەشت، دەریا و دەریا     پێوانەم کرد بەرەو باکوور ڕووی دنیا
فڕیم بەناو هەوری بەرزی ئاسمانا     بەسەر هەزار هەزار دیمەنی جوانا...
تا گەیشتمە بەر دەروازەی کرەملین     ژێر سێبەری پەیکەری بەرزی لەنین!
ڕووی سرنجم کردە هەرکوێ لەنین بوو،     هەر خۆی باوک، سەرۆک، مامۆستای چین بوو...
دیم: نە بە ڕەنگ، دیم: نە بە دەنگ، نە بە بیر     لەکیس چووە، بۆ ئینسان، لەنینی ژیر!
ئێستایش دەستی درێژ ئەکا و بە ئەموست     شەقامی ڕاست پێشان ئەدا بت بە بست،
لە تاریکیی دنیای پڕ ئارەق و خوێن،     دنیای شەڕ و دنیای جەور و دنیای جوێن
پەلکێش ئەکا ئینسان بۆ دنیای تازە،     ئەو دنیایەی هەر خۆشییە و هەر نازە!.
لەو گەلانەی کە شوێن بڕوای ڕاست کەوتن،     وەک گەلانی دواکەوتووی تر نەحەوتن!
«ئازەری» بوو، ئازەربایجان وڵاتی،     ڕێگای لەنین کەوتە فریای نەجاتی!
دۆینێ کەڵبەی گورگی قەیسەر ئەیکرۆشت،     وەک تالانی بە تێلا و شەق ئەیفرۆشت،
شاری وێران وەک شاری تۆ و دێهاتی     ژاوەی ئەهات لە نەخۆشی و لە قاتی،
لە نەزانی و ڕووتی و قووتی و هەژاری،     ترس و لەرزی ماڵوێرانی و بێکاری...
بەڵام ئەمڕۆ خاکی ئازەربایجانی،     کە دوو ڕۆژە هاتووین بووین بە میوانی،
وا لە تیژگی ڕۆژی لەنینا نوقمە،     ئەڵێی لە بەر خۆرا گوڵی ئاوریشمە!
«باکۆ»ی کچی لەسەر دەریاچەی قەزوێن،     شانە ئەدا لە قژی زەردی خاوێن
لەگەڵ شانەکردنی بەر ئاوێنە،     سەری گەرمە بە گۆرانیی بێوێنە.
غەزەل غەزەل عەشقی «فزوولی»و «مەجنوون»     بە دەنگی سۆز ئەخاتە بەستەی مەحزوون
تا هونەری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی     گەشە بکا و بژی دیسان «نیزامی»!.

باکۆ. کانوونی دووەمی ١٩٥٩

# نەورۆز

ئەی نەتەوەی کاوەی زنجیر قەف قەف‌بڕ!
گەرمی و ژین و شادیی هێنا بە دیاری،
پووش بوو بە گیا، چیلکەی باخ بوو بە دارگوڵ،
گوڵاڵەی دەشت، نێرگزی مەست، وەنەوشە،
ئەڵێی پەلەی پەرداختی نەورۆزیانە،
هەروەک سروشت ئاگادار بێ: کە کاوە
هەروەک مەلان بە حەواوە بزانن:
تا زنجیری ئەژدەهاکی لە گەردن
شەوی دیلی بوو بە ڕۆژ، خەم بە شادی،
ئەی هاوچین و هاونەتەوەی کاوەی مەرد!
شەڕفرۆش و ئیمپریالیست و ناپاک،
ئیتر هەرگیز سەر هەڵنەبڕن وێنەی مار

ڕۆژی نەورۆز دای بە هەوری زستان، دڕ!
کوردی خستە جەژنی تازەی بەهاری
لە وشکەسی کانی کەوتە قوڵە قوڵ.
وەک پێشەنگی بەهار کەوتوونە گەشە،
بۆ جەژنی کورد ئەو گوڵانەش سۆزیانە
چ ڕەنجێکی بۆ ئازادیی گەل داوە!
کە بە ساردی چەن دای چەکوش لە ئاسن!
نەتەوەیەک دامالّی پێکی ئاسن!
زستان گەڕا بە بەهاری ئازادی...
تۆیش بە بازووی خەباتی سەختی وەک بەرد،
وا داپلۆسە کە یەکسان بن لە گەڵ خاک؛
هەنگوینی ژین لە مرۆڤ پڕ کەن لە ژار!

سلێمانی. مارتی ١٩٦٠

# بە ڕێگادا... بەرەو کۆنفرانس[1]

بە هەنگاوی گورج و درێژ،
ئەبڕین ڕێگای هەوراز و لێژ...
بەدەم سەرگەرمیی هیواوە
بە باڵ ئەفڕین،
لە شەقڵاوەی خانزادنشین
«دڵە زۆر تەڕەکەی سەفین!»
دووەم کۆنفرانس ئەبەستین...

مامۆستایان ئەیانەوێ:
هەتاوی کورد زوو دەرکەوێ،
ڕێی بیرو بۆ مێشکمان خۆش کەن،
زمانمان بە کوردی گۆش کەن...
ئێمەیش شوێنکەوتووی کاروانین:
هەم خانەخوێین، هەم میوانین!
بە هەنگاوی گورج و درێژ،
ئەبڕین ڕێگای هەوراز و لێژ
بەدەم سەرگەرمیی هیواوە
بە باڵ ئەفڕین،
کۆنفرانسی دووەم ئەگرین!

بە پیرمەما تێئەپەڕین
دار بەڕووی زۆر دێتە ڕێمان...
پیرەداربەڕووی لاڕێمان،
ڕۆژێ لە ڕۆژانی زۆر زوو،
جۆلانەی لێ هەڵبەسترابوو،
ساوای ناو جۆلانەی ژێردار
ئەیپرخان وەک بەرخی بەهار!
دایکی ساوا،
لەگەڵ هاژەی دووری ئاوا،
بە لایەلایەی شیرینی

خەوی خێری پێ ئەبینی،
شیری پاکی ئەنایە دەم:
گەشەی پێ ئەکرد ژەم بە ژەم...
باوکی وریای بە نووکی تیر
بۆی ڕاو ئەکرد، کەڵ کەڵ، نێچیر،
بە «ڕم» پڵنگی ئەتاران
لە جۆلانەی کۆرپەلەی جوان!
ئەو ساوایەی ژێر داربەڕوو
کام شێر؟ کام شێربەزێن دەرچوو؟

ـ نەوەی شێرکۆ، سەلاحەدین،
پاڵەوانی غەزای ڕێی دین!
ئەوەی بۆ پاسی قەڵای قودس
وەک بەردی ڕووی شوورا، بێ‌ترس،
لەبەر شیر و تیرا وەستا،
تا دەنگی: «هەی ئامان!» هەستا:
لە گرۆی خاچ
کە خاچیان کردبوو بە پاچ
بۆ ڕووخاندن،
بۆ: ئاسیا پڕ لە مردن،
پڕ لە کەلاوەی شار کردن...

بە هەنگاوی گورج و درێژ،
ئەبڕین ڕێگای هەوراز و لێژ،
بەدەم سەرگەرمیی هیواوە
بە باڵ ئەفڕین،
پیرمەم جێ‌دێڵین لە دواوە:
بەرەو لووتکەی چیای سەفین...
ڕیزی ئۆتۆمۆبیل ئەکشێ،
پێچ پێچ، هەتا داوێنی کێو،
لەوێ کاروان هەڵئەلووشێ:

ورگی باغچەی هەڵووژە و سێو...
لە شەقڵاوا،

دوێنێ، ساوا
کە لە بێشکەی نازا شاد بوو،
میر کچ بوو، بە ناو خانزاد بوو!
خانزادی جوان،
مامزی ناز، پڵنگی لان،
تۆڵەسێنی میر سلێمان،
شۆخی سەر زمانی حەیران،
خانزادی جوان...

بە هەنگاوی گورج و درێژ،
ئەبڕین ڕێگای هەوراز و لێژ،
بە دەم سەرگەرمیی هیواوە
بە باڵ ئەفڕین،
لەسەر لووتکەی بەرزی سەفین
ماوەی خولدان لە داڵ ئەگرین.

چیاکانمان،
چیاکانی کوردستانمان،
هەموو سەرپۆش سپی و بەرزن،
بەرپێ بەفراو، داوێن سەوزن.
سەرانسەری ئەم کێوانە:
درەختە و بێشکە و جۆلانە...
لەناو بێشکەی ڕازەنراوا
دەنگی گڕوگاڵی ساوا،
کچ بێ، کوڕ بێ، دێنێتە یاد:
شکۆی سەلاحەدین، خانزاد!
بەڵام دوێنێ،
نە ئەمڕۆیە، نە سبەینێ...

سەلاحەدین یەک سوڵتان بوو،
خانزاد یەک پڵنگی جوان بوو...
ئەمڕۆ بازووی بەکار بۆ کورد،
«ژنی بەرز وەک مانگی دەستکرد»،
چەکوش بە دەست، داس بە دەستە،
ڕۆشنبیر و خاوەنهەستە
«هەستی دڵسۆزیی نیشتمان،
هەستی خۆشەویستیی ئینسان!»
ڕەنجی بە ملیۆن لەمانە
هێزی باڵی کوردستانە!

ئەگەر دوێنێ مامۆستاکان
یەک سوڵتانیان پێ ئەگەیان،
ئەمڕۆ ئەبێ مامۆستای کورد
دانیشێ و بە ڕاوێژی ورد
ڕێگای پێگەیاندن دانێ،
بۆ ملیۆنان، نەک سوڵتانێ!
لە بێشکەی بن هەر سێبەرێ
سبەی ئەگەر بێتە دەرێ:
خانزادێ، سەلاحەدینێ،
کاکەمەمێ، خاتوو زینێ...
ئەوسا بەستەی بێخەمیمان
چ هیی پێنووس، چ دەمیمان،
بە تاقە یەک زاری شیرین
شاخ پڕ ئەکا لە پێکەنین!
ئەوسا: «خانی»، خانیی سەردەم
بە زمانێک ئەنووسێ «مەم»
کە پێی ئەدوون «نالی» و «مەحوی»
وەک «قوبادی»، وەک «مەولەوی»!

* * *

ئا بۆ گەیشتن بەو کاتە،

بەو ئاواتە،
لە کورتترین ڕێی ڕوونەوە
مامۆستایان کۆبوونەوە،
بە دڵسۆزیو بە لێبووری،
بە ڕەنجێک مایەی ڕووسووری،
دەریای مێشک ئەشڵەقێنن،
دانەی گەوهەر و مرواری
لە بن بنی ئاو دەردێنن...

کام گەوهەر گرانبەها بێ،
بە زانستی کورد ڕەوا بێ،
لێی پڕ ئەکەن کیسەی دیاری،
ئەیبەن بۆ دەزگای زانیاری!...

**شەقڵاوە ــ ١٩٦٠**

---

١) مەبەست کۆنفرانسی دووهەمی مامۆستایانی کوردە کە لە هاوینی ساڵی ١٩٦٠دا لە شەقڵاوە گیرا و لە گیرو گرفتەکانی خوێندنو نووسینی کوردی کۆڵیەوە و نوێنەرانی مامۆستایانی هەموو شارستانەکانی کوردستانی عیراق و هەموو بیروباوەرە نیشتمانیەکانی ناو مامۆستایانی کوردی عیراقی تیا بەشدار بوو. کۆنگرەی یەکەمیش لە هاوینی ١٩٥٩دا هەر لە شەقڵاوە گیرا. م.م.ک.

# نەورۆزی ٦١

وەنەوشەی بن دڕک خزاو
چاوی ڕەشی کردەوە، دیی،
نێرگسەجاڕ بە هەزار چاو
پێئە کەنێ: زەرد و سپی!
نێر گسی بەر هەتاوی گەرم
مژدەی پێ بوو بۆ وەنەوشە،
وتی: «خوشکێ،
خوشکی جوانی چاو پڕ لە شەرم
خڕ داخراو دەرگای حەوشە،
فرمێسکێ لە چاوت بۆ ئەتکێ؟
وا، بەهارە،
لەسەر لووتکەی سپی دیارە
ورشە و پرشەی یاقووتی ئاڵ،
گڕی جەژنی سەرەتای ساڵ!...»
وەنەوشەی چاوڕەشی شەرمن
دەستی کرد بە بەستە وتن!
بێ سڵ کردن
لە نووکی خەنجەری دوژمن،
خۆی هاویشتە باوەش چەپک
گوڵی وەنەوشەی ناو دڕک
کە گەیشتە دەستی تاسەم،
پڕ لە بۆنی بوو هەناسەم؛
عەتری چپەی تکاندە گوێم،
مژدەی: «هات نەورۆز»ی دا پێم

* * *

ئەی ئەو جەژنەی هاتیت و چوو
لە دەم، تاڵیی پاری مردوو!
ئەی ئەو جەژنەی هەزاران ساڵ
لە ڕابوردووی کوردی زۆر تاڵ،

تاقه بزەی یادگاریان
هەر تۆ بووی: جەژن و بەهاریان!
لە خەمی کۆن، ئازاری کۆن،
زووخاوی دەست زۆرداری کۆن،
یەک ساڵی تر دوورت خستین؛
لەولاشەوە، جەژنی شیرین،
بە هاتنت یەک ساڵی دەق
کاروان پێش‌کەوت، بەرەو شەبەق
واتا: ڕێگا ببڕین بە دەو،
ساڵێک زووتر دوایی دێ شەو؛
ئەو شەوەی مەشخەڵی گەلان،
ئاگری بەرئەدا لە گیان
لە هەرچوار لای جیهانەوە،
تا بە دەم بای سووتانەوە،
تۆزی لە ڕووی پەڕەی مێژوو
ئەنیشێ وەک خاکەی ڕێژوو!
ئەوسا، نەورۆز،
جەژنی پیرۆز!
دڕک ئەڕزێ و داخی دڵی،
ئەبێ بە بۆ گەن بۆ گڵی
تۆیش ئاهەنگی بەهارە کەت
نەخشی لووتکە و نزارە کەت،
لە باخچەی گوڵی گەلانا
گوڵێک ئەبێ لە مەیدانا...
هەر مرۆڤێ دی و بۆنی کرد
ئەڵێ: بژی نەورۆزی کوردا!...

بەغدا. مارتی ١٩٦١

# چیرۆکێکی برایەتی

برای عەرەب!
چەخماخەی شمشێری زۆردار
ئا لەو خوێنەدا ئاوا بوو
کە لە ملی باوکت، باوکم
ڕژایە سەر لمی مێژوو!
بە جووت هەردوو باوککوژراو،
تک تک خەممان تکا لە چاو،
دەست لە مل، بەسەر یەکترا
گریان کردینی بە برا.
بەڵام زۆردار
کەللەی پڕ بوو بۆمان لە مار:
پەلی گرتین، کێشی کردین
بۆ بن داری ئێش و ئازار،
زنجیری خستینە گەردن،
دایە دەستمان سەر و زەنگن،
قەمچیی هەڕەشەی خستە کار:
بیری پێ لێداین بە بێگار!
لەژێر درەختی ئازارا
ئەوەندەی تر بووین بە برا؛
بۆیە لە ناو هەردووکمانا
بە چپەی ورد،
ئەم داری دڕکەمان ناو نا:
برایەتیی عەرەب و کورد!
ئیتر زرمە، زرمەی زەنگن،
ناڵەی ڕەنجی تۆ بوو، هیی من،
بە ڕۆژ، بە شەو، ساڵەهای ساڵ،
تاگەنجی زۆر دەرچوو لە چاڵ،
بۆ گیرفانی باوککوژمان،
شیلەی ڕەنجی شیرینمژمان.

* * *

برای عەرەب!

ئای... لە بێگاری زۆردارا،

عەبا و فەرەنجیمان دڕی!

ئای... لەژێر قورسایی بارا

ئارەقی ناوچاومان سڕی!

بهاتایە پشتی ماندووی کوورڕ هەڵبڕین،

زۆردار لێمان ڕائەپەڕی و تێی ئەخوڕین...

ئێمەیش ناچار، بەم شان، بەو شان،

بێ‌پشوو پاچمان ئەوەشان.

لە نووکی پاچ ئەهاتەدەر:

کۆمەڵ کۆمەڵ زێڕ و گەوهەر

زۆردار ئەیبرد و من و تۆ،

بۆ بەرگی جاو، بۆ نان و دۆ،

دەستی دەرۆزەمان پان بوو،

چاومان زەق زەق چاوەڕوان بوو!

* * *

برای عەرەبی چاوڕەشم

تاڵ بوو بەشت، تاڵ بوو بەشم!

لە یەک کاسە «تاڵی» نۆشین

برایی کردین بە هەنگوین.

هەردوو برا، عەرەب وکورد،

سەرمان بۆ بناگوێی یەک برد،

تا تێرمان خوارد چپەمان کرد

«پەی»مان برد بە ڕاوێژی ورد...

دیسان بەم شان، دیسان بەو شان،

بێ پشوودان پاچمان وەشان

بەڵام پاچێک لە بنی بیر،

پاچەی تر لە قەفی زنجیر...

لەپڕ زنجیر قەف قەف پسا،

دیلی نەما لە قەفەسا...
ئێستا هەردوو برای ئازاد،
ڕاستە بە سەربەستین دڵشاد،
بەڵام ئاسۆی ڕێمان لێڵە،
ڕێگای ئاسۆی لێڵیش وێڵە
وێڵ بین «بەد» لە کەمینایە
«بەد» ڕێگری بێ ڕێگایە...

* * *

برای عەرەب!
بمانەوێ براییمان
میوەی شیرین بچنێ لە دار،
بمانەوێ ئازادیمان
گوڵ بگرێ وەك باخچەی بەهار،
بمانەوێ هەموو کاتێ
ئەمساڵمان چاتر بێ لە پار،
ئیتر هەرگیز نەمانگاتێ
دەستی تاوانباری زۆردار
ئەبێ بەرەو ئاسۆی ڕووناك،
ڕێی ڕاست بگرێ نیازی پاك!
ئەبێ وەکوو گەلانی تر
گڕی سپیی باڵی کۆتر
بۆ کاملا ئەبرێ ئاسۆی شین،
سواری یەکیەتیی وشە بین،
شوێنی کەوین،
بە دەو بچین،
تا ئەگەینە دوا ئامانجی هەرە شیرین!

بەغدا. تەشرینی یەکەمی ١٩٦١

# مۆسکۆی ئەیار

بیرەوەریی ڕاوەستانێک لە
خۆپێشاندانی جەژنی یەکی
ئەیاردا لە مەیدانی سوور۔
مۆسکۆ، سالی ١٩٦٢

کە پێکەنی جەژنی ئەیار
بەفری زستان کردی ئارەق،
مۆسکۆی پێشڕۆی دنیای ڕزگار
جوولەی تێ کەوت لە گەڵ شەبەق.

لە کۆشکە بەرزەکانی شار
مرۆڤ داچدا وەکوو باران،
لافاوی ناو شەقامەکان،
بە گرمەی وەک هەوری بەهار،
بەرەو مەیدانی سوور کشا؛
دەریای مەیدان تێک‌خرۆشا!

شەپۆل ئالای سوور بوو، گوڵ بوو،
ڕەنگاوڕەنگ ئەشەکایەوە؛
لە گەڵ هەر جوولە و هەر ڕەنگێک
جۆرە دەنگێک ئەزرِایەوە.
ئێجگار شەش وشەی پرشنگدار
زوو زوو دەنگی ئەدایەوە،

وشەی هەرە پڕ بە دەمیان:
ئاشتی، ئاشتی، ئاشتی، ئاشتی...
دوو ڕەنگیش بوو، وەرزشکەران
وەک پەردە ئەچوونە پشتی:
ئاڵ: وەک کوڵمێک گەرمی خەبات،

سەوز: وەک ژینێک پڕ لە ئاشتی!

دوایی، شەپۆل چوو، شەپۆل هات
لە خەڵکی مۆسکۆی بەهەشتی؛
ئەو خەڵکەی بەهەشت ئەخوازن
بۆ ژیانی مرۆڤ گشتی!

جۆشی دەنگ و ڕەنگ و جووڵە
گیانی منی خستە سەر باڵ،
لە ئاسۆی دووری وڵاتم
ورد ورد گێڕام چاوی خەیاڵ:
بۆ ڕەنگی سەوز، پاش ڕەنگی ئاڵ،
بۆ ڕزگاری لە ژینی تاڵ!

١٩٦٢/٥/٣

## بێشکەی مناڵ

دایک دای ڕەنج، بۆ مناڵ دای؛
بۆ بزەی ناو بێشکەی ئارام،
بۆ شیرینیی گڕوگاڵ دای...

باوک هەچ ئارەقێکی ڕشت
بۆ ئەوەی ڕشت — من دڵنیام —
نەمری کات: بڕبڕەی پشت...

ئای ئەو ماڵە چەن ئاوایە:
کە دایک‌و باوک لای بێشکەدا،
گوێیان لە مشەی ساوایە!

ئای ئەو ماڵە چەن بێباکە:
کە لە باروت‌و لە بۆمبا
ژێر بێشکەی مناڵیان پاکە!

ئای چەن خۆشە: ماڵێک بێ وا
ڕووی دنیا، ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ،
دڵنیا بین بێشکەی ساوا
نابێ بە خۆڵەمێشی شەڕ!

بەرڤیخە: ١٩٦٢/٦/١٢

# تیر و کەوان

پێشکەشە بۆ کۆنگرێسی ئاشتی و چەکفڕێدانی گشتی لە مۆسکۆ، مانگی تەمووز

٩ ــ ١٤/ساڵی ١٩٦٢

ئەو ئاسمانە شینەی ژوور سەر
کۆتری سپیی تیا خول ئەدا
بەبێ خەتەر،
مژدەی گوڵ بە بولبول ئەدا.

لەو ئاسمانە،
گڕی سپیی ئەو باڵانە:
ئاوێنەی ئارامیی ژینە،
کۆشی وەنەوزی شیرینە؛
ڕوونی ئەخاتە شەبەقمان؛
سێبەر ئەکا بۆ ئارەقمان،
بەری ڕەنجی تاڵمان بە لێو
ئەکا بە هەنگوینی بێ مێو.

ئەگەر مەلی ئاسمانی شین
باڵی بەیاخ نەبێ بۆ ژین،
لە هیچ باغچە و بەهارێکا
لە جێی دڕک گوڵ نابینین،
گوڵ نابینین!

ئەو تاوانبارەی بۆ کۆتر
لە ژێی کەوان تیر گیر ئەکا،
پارچەی جەرگی ناو بێشکەی خۆی،
پێش هێنی من نێچیر ئەکا!

لەگەڵ ئەوەش دەستی چەپەڵ،
ئابڕووتکاو،

هەرخەریکە، تەکەڵ تەکەڵ،
بۆ ئاسمانی پڕ لە هەتاو
تەپەدووکەڵ هەڵئەسێنێ،
گڕی سپی ئەخنکێنێ!

پیاوخۆرێک وا
بەگۆشتی ڕۆڵەی خۆی چەش بێ،
ڕۆژهەڵات بۆی، وەک ڕۆژئاوا
دەبۆی تیر بێ، هیی تەرکەش بێ،
دیارە هەرگیز لە پەلامار
واز ناهێنێ وەک گورگی هار!

با هەزار جار،
گیرفانم پڕ لە بەڵێن کا،
جووتبەقێی بەڵێن بە سوێن کا:
کە هەڵئەگرێ
دەست لەگەزەن هەتا ئەمرێ.
من تەجرەبەی پار و پێرار
نایەڵێ چاو بێترس لێک نێم،
لەگازی مار!

ئەگەر دنیا ئاشتیی ئەوێ،
بۆ ژێرسەری خەوی ئارام
لە تووکی قوو پشتیی ئەوێ،
ڕاوێژ هەر ئەوەیە لەلام:
هەتا زووە،
تا خەڵک گشت بە قڕ نەچووە،
دان لە دەمی مار دەربێنێ! —
چەک نەمێنێ،
ئەوسا، بێترس، تێر ئەنوێ چاو،
ئەچێتە ئیش دوو دەستی پیاو!
ئەوسا باخچەی ژیانی نوێ،

جوانترین گوڵ تیا ئەپشکوێ!
ئەوسا ئینسان،
بە دەستی بێ تیر و کەوان،
زووتر تۆوی گوڵی زەوی
بۆ ئەبرێ تا ئەستێرەکان!...

بەرڤیخە: ١٩٦٢/٦/١٧

# بۆ لاوان

بەبۆنەی میهرەجانی هەشتەمی لاوانی جیهانەوە
بۆ ئاشتیو برایەتی لە هەلسینکی، فینلەندە،
هاوینی ساڵی ١٩٦٢

ئەی لاوانی گشت دنیا!
هەلسینکی،
باخچەی زەمەقی سپی،
کە لە گەرمەی هاوینیا
ناسکیی بەهار دیارە،
ئەمجارە
جێگای میهرەجانتانە!

وەك درێژی و ڕووناکیی
شەبەقی،
مێشکتان پڕە لە بیر،
وێنەی گوڵی زەمەقی
دڵتان پڕە لە پاکی،
پاکیی ڕەنگی سپیی شیر...

ئەی لاوان،
کچان، کوڕانی ڕووی ئەزر!
با گۆرانیتان ئاسمان
کەڕ کات بە شەپۆلی بەرز!
بە سەد زمانی جیا جیا،
وەکوو هەور بگرمێنن
یەکیەتیی لاوانی دنیا
بە هەمووکەس بنوێنن!
با ئەوانەی لە شەڕا،

تا خەڵک بمرێ، گۆشت ئەگرن،
بزانن،
چەک هەڵناگرێ لە برا
هیچ لاوێ!
هیچ لاوێ شەڕی ناوێ!

ئەی لاوان!
هەر ئێوەن:
بەهاری ژینی ئینسان،
هەر ئێوەن:
ئاغای سبەینێی ژیان!
ئاغای «ئەمڕۆ ـ داگیرکەر»
ئەبێ زۆر باش بزانێ،
ناتوانێ:
بۆ شەڕ ئێوە باتە بەر!
برا، برا ناکوژێ،
خوێنی دایک نامژێ
ـ خۆشەویستیی خۆی تیابێ ـ
هەتا دنیا دنیا بێ!

دڕندەی شەڕ لەشی ژین،
بە برین،
وا شڕ ئەکات، سبەینێ،
کاسەی شکاوتان، هەنگوین،
تکێ لە بنیا نەمێنێ!

ئەی لاوان!
میهرەجان،
وێنەی هاوژیانییە؛
هەرکاتێکی ژیانی

عومرێک خۆشی و جوانییە!

خوشکان و برایانی
دنیای زۆرنزیک، زۆر دوور،
هێزی ئاشتی و برایی
یەکی خستوون لە باکوور
وەک چەپکە گوڵی شایی،
سپی و ڕەش و زەرد و سوور،
تێکەڵ بوون...
بە ڕۆژ، بە شەو تا ئەنوون
بە ستەتان وا لە دەما،
یاری ئەکەن و سەما...
بێ کۆڵدان، بێ ماندوو بوون،
لە ئاشتیی جیهان ئەدوون!

ئەی لاوان!
مشتی وەک پۆڵای ڕقتان
ڕاست کەنەوە لەوانەی
تەم ئەخەنە شەبەقتان،
نایانەوێ کە سبەی
سەرانسەری ژیانتان:
هەر جەژن و میهرەجان بێ!
وەک فینلەندە جیهانتان
شەوی لەسەر بەیان بێ!
تێیان خوڕن ــ لەوانە ــ
شێرانە!
با ئەو چەکەی پێیانە،
فڕێی دەنە بن دەریا،
تا دنیا

داخەکەی هێرۆشیما
سارێژ بێ لە دڵیا!
تا ئینسان،
لە سێبەری ئاشتیا،
دەستی بچێتە فرمان،
لمی دەشت، بەردی چیا،
پڕکات لەگوڵ و لە نان!.

ئەی لاوان!
ئەوسا چواروەرزەی ژیان،
بۆ گەلان
گشت، جەژن ئەبێ و میهرەجان!

بەرڤیخە: ١٩٦٢/٦/٢٥

# ئاوابوونێک

**بە بۆنەی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو**
**مامۆستا ڕەفیق حیلمییەوە**

ئەی سەیوانگای ئارامگای ڕابوردوومان،
لەو کۆشەتا کە خاکی نیشتمانە،
با تێر بنوێ ئەو ئەستێرەی کە بە شەو،
هەر ئەینووسی لەسەر تەختەی ئاسۆی ڕەش،
ئەو ڕەنجەی دای بە دەرس و نامە و هەڵبەست
لە بن هەموو بەردێکی چیای کوردا،
ئێستا کە ڕووناکیی ئاسۆی ڕۆژهەڵات
دڵنیا بوو لە ئەنجام و بە بێ دەنگ،
لەپاش ماندووبوونی مەردانەی مەیدان،
بەڵام ئێمەی گیرۆدەی ئەستێرەی گەش،
چاوی تاسەی بە شوێنا هەر ئەگێڕین،
پێت سپێررا کۆستی تازەی کەوتوومان!
گۆشەی سنگی نازداری کوردستانە
بە شەوی کورد، نەچووە چاوی یەک تکێک خەو!
وشەی «هیوا»ی کوردی بە پیتی گەش گەش
شوێنی دیارە: لەو گڕەدا کڵپەی بەست
لە قووڵایی دڵی درشت و وردا
مژدەی پێیە کورد نزیکە لە ئاوات
کێشایەوە بۆ سێبەری خەوی مەنگ.
با لە کۆشی دایکا بنوێ پاڵەوان!
تا ئەو ڕۆژەی گوڵ ئەمانخاتە باوەش،
لە ئاسمانا، چونکە جێی چۆڵ ئەبینین.

سلێمانی. ئابی ۱۹۶۰

# یادی «بێکەس»

هەڵدانەوەی لاپەڕەی کۆنی عومرە
کوردستانی ئەو سەردەمە وا تار بوو،
بولبولەکان لە قەفەسا قەتیس بوون
ئەو مەلانەی داڵدەیەکی گەرمیان بوو،
پەڕەی گوڵیان بە ڕەنگی «ڕوو» سوور ئەکرد،
جار جار لەپاڵ مەتحی درۆی زۆردارا،
یاری هەڵبەست یان هیی تێری بێدڵ بوو،
بەڵێ هەبوو بولبولی وایش، برسی بێ،
هەرە برسی و هەرە لێبووردووی دەستە
لە باغێکا فرمێسکی «خانی» ئەڕژا،
«بێکەس»*دڵی بڕوای نەدا خامۆش بێ،
لە ڕووی شیری ڕووتا وەستا و نەڕانی،
زمانبڕین سزای قەی نەستەق بوو،
کزی چاو بوو، بە چاوی هۆشمەندی
لەناو هەردوو نەتەوەی عەرەبا و کورد،
لەکاتێکا دەستی دوژمنی نامەرد
بەو نیازەی بکەوێتە خۆ خۆری:

بۆیە فرمێسک لە چاویایە ئەم شیعرە!
بەفری زستان گوڵی باغچەی بەهار بوو.
لە سەرمانا ئەلەرزین، وەک گوڵ سیس بوون
دانەوێڵەی چینە مایەی شەرمیان بوو
وا هەڵبەستیان پێشکەش بەرەوژوور ئەکرد.
چەن گوڵێکیش ئەکرا بە قۆزی یارا...
یان هیی لاتی ناپەسەندی لای گوڵ بوو...
ئەماع هەرگیز شیعری پێ نەنووسیبێ
«بێکەس» زیاتر، خەباتی خستە بەستە،
دڵی «حاجی» لە ئاگرا ئەبرژا،
لە بەستەیا نیشتمان فەرامۆش بێ!
ئازادیی ویست بۆ گەل و نیشتمانی!
توانجی «بێکەس» بۆ دوژمن بەردی ڕەق بوو
لە ئاسۆی دوور برایەتیی کرد بە دی،
بە بانگی بەرز ئەمەی خستە شیعری ورد.
تۆوی کینەی چاندبوو وەک گەرای دەرد،
کورد و عەرەب، تورکمان و ئاسۆری!

* * *

ئەمویست «بێکەس» ئێستا بە سەر بژیایە،
بیزانیایە براگەورەی عەرەبمان،
بیزانیایە گەوهەری نرخی «بێکەس»
«بێکەس»! لەشت با لە خاکا ڕزیبێ،
بەڵام بولبول کە ئامانجی لەم ژینە:
تاکوو دەنگی چریکەی بێ لەسەر دار،
کە وا بێ تۆیش تاکوو «داری ئازادی»

ئەم گەرمییەی برایەتیی بدیایە.
چەن دڵسۆزە بۆ خزمەتی ئەدەبمان.
براکانی چۆن ئەیگێڕن دەساودەس!
با مرۆڤیت بە یاسای مەرگ ڕازی بێ،
بەس خوێندنی بەستەی شیرین شیرینە،
هەر زیندووە و هەر بولبولە و هەر باڵدار؛
بەستەی کوردە، ئەژییت، نەمری یادی!

بەغدا. کانوونی یەکەمی ١٩٦٠

## یادی پیرەمێردی بوێژ

ئەم بەهارە
لەسەر گردی مامەیارە،
بۆ یانزە جار،
نوێ گوڵاڵەی سووری بەهار
خوێنی ڕژایە سەر گیای سەوز،
خوێن پەنگی خواردەوە وەک حەوز...
بۆ یانزە جار،
سەوزە گیاکەی گردی یارە
مووی سپی کرد وەک چوڕی شیر،
تووکی کەللەی بۆ یانزە جار
با ڕشتییە بەر پێی ڕێبوار!
•
پووشی دە ساڵ ئێستە خۆڵە
لە و ڕۆژەوە جێی پیرەمێرد
ـ قۆچی تینوو بۆ دەمی کێرد[1] ـ
لە باخچەی هەڵبەستا چۆڵە.

باغچەی هەڵبەست،
هەزار و یەک جۆر گوڵ ئەگرێ،
تیایا هەیە زووڕەس، بۆنمەست،
بەڵام، ئاخ، زوو هەڵئەوەرێ

لە ناو هەزار و یەک گوڵا،
من هێرۆم زۆر چۆ بە دڵا؛
کە پاش ئەوەی بەهار پیر بوو،
بە دڕک و پووش هەرد داگیر بوو،
گوڵی هێرۆ،
گورج لەسەر بنجی سەربەخۆ،
سپی و سوور هەڵئەکا بەیاخ،
دڕک و داڵ ئەگێڕێ بە باخ!

پاش بەهارێ،
کاتێک: ڕۆژی لای نیوەڕۆ
دەرزیی داخی لێ ئەبارێ،
ڕێبوار تک تک ئەتوێتەوە...
لەوکاتەدا گوڵی هێرۆ
لەناکاو ئەشەکێتەوە،
سرنجێک ئەگرێتە ڕێ و بان:
فێنک وەک ئاو، وەک بای کوێستان!
هێرۆم بۆیە لا پەسەندە:
لەسەر ڕەگێکی قووڵ بەندە
بەسەر دڕکی ژینا زاڵە،
تا ئەمرێ، سەر لقی ئاڵە.

بەغدا. حوزەیرانی ١٩٦١

---

١) ئیشارەتە بۆ ئەم شیعرەی پیرەمێرد لە قەسیدەی «هاتن شەهیدەکان»دا:
من وام ئەوێ کە حەشر ئەکرێم خوێن بە بەگەروە
بەو عەشقی میللییەوە، بە کزەی سۆزی جەرگەوە م.م.ک.

# ئەنجامی یاران

شوێن:سەرچاوەیەک لە بن سێبەری کۆمەڵە درەختێکا، لە دێیەکی بنار شاخ.
پلووسکێکی دارین لەکەڵەکە بەردێکی بەرزەوە ئاوێکی زۆری لێ دێتە خوار.

برزوو:
ئەی دایەی سەرکانیی ژێر سوورە چنار،
داپیرەی نوورانی؛
کوا فەڕی ئەم کاتەی ئەم جێگایەی پار؟
کوا شەوقی جارانی؟

وەنەوش:
کوڕی خۆم، ڕێبواری جوان و هەرزەکار،
جیاوازیی چیت دیوە
لەکانی و پلووسکی ژێر سێبەری دار،
کە زیخی مرواری و ئاوی وەک زیوە؟

برزوو:
دایە، ئاو ئەو ئاوە، جێگە ئەو جێیە
هیچ نەگۆڕاوە،
بەڵام سوورەگوڵێک هەیە لەم دێیە
مەنیجی ناوە،
نابینم وەکوو پارلە بەر پلووسکا
ئاو بدا بەکوڵمی نەرم و ناسکا!

وەنەوش:
ئەی جوانی سەر ڕێگا، زۆر هەنگی برسی
بە باڵ هات لە دوور
لای دایە ئەم شوێنە و ئەم پرسەی پرسی
دەرحەق گوڵی سوور!
پێم ناڵێی چکارەی؟ ڕۆڵەم، چ کەسی؟
سەر سەودای چی کەوتووی، مەنیج ئەپرسی؟

برزوو:
دایە، پار چەتە بووم، چەتەی نیشتمان
لە شاخ هاتمە خوار
لەسەر ئەم پلووسکە مەنیجی چاوجوان
تووش بووم یەکەمجار
بۆم ڕوانی... بۆی ڕوانیم بە دوو چاوی ڕەش
سەرکوڵمی ئاڵتر کرد زەردەخەنەی گەش!

وەنەوش [ لە بە رخۆیەوە ] :
ڕووخۆشی و شەرم و ناز تێکەڵ پێشاندان
هەر شیاوی خۆتە ئەی مەنیجی جوان!

برزوو [ لەسەر گۆرانیی خۆی ئەڕوا ] :
بەو دڵەکوتێوە کە چوومە پێشتر،
داوای ئاوم کرد
بۆی ڕوانیم بە نیگای ڕیشەی دڵکێشتر
دەستی بۆ جام برد
بینم نا بە جامی «ئەناهیتا»وە،
(خوا ژنی نازداری کانی و سەرچاوە)
ئاوم خوارد، سرنجم دا لە باسکی ڕووت؛
پووزی هەڵکراو
لەسەر وردە زیخی مرواری و زمڕووت
وەک مەڕمەڕ تاشراو
ڕوانیمە باڵای ڕێک، سەر و پێچی شل
ئەگریجەی وەک شەوەی سەر بەفری لامل.

وەنەوش [ لەبەرخۆیەوە ] :
شیرینە سەرتاپای ئەندامی مەنیج
شیرینتر: ڕەوشت و خوو و فامی مەنیج!
برزوو [ لەسەر تەواوکردنی گۆرانیی خۆی ئەڕوا ] :

به قسەی لە رزۆکی لە گەروو گیراو
لە گەڵی دوام
لاوانمی بە دەم و لەبزی وەک شەکراو
پرسیار و وەڵام—
گەیشتە: ناونیشان، ناو، دۆست، دەزگیران
تا دەستمان بۆ یەکتر نایە سەر قورعان:
کە هەرگا پێویستی نیشتمانم دی،
لە چەک بەردرام
ماڵی زۆر هەڵگرم، بێمە خوازبێنیی
گوڵغونچەی هیوام!
وا ئێستا چیم هەبوو کردوومە بە نەخت
وەک عەوداڵ کەوتوومە شوێن تروسکەی بەخت

وەنەوش:
ئەی ڕۆڵەی لاوچاکم، چەتەی نیشتمان!
داخی گرانم!
زمانم ناچەرخێ بە قسەی ڕەوان
ئەوەی ئەیزانم—
لەبارەی مەنیج و ئەستێرەی بەختی،
بۆ تۆی بگێڕمەوە بە ساردی و سەختی!

برزوو:
هەی داپیر! دەخیلم، چییە خەبەرت؟
ئارامت بردم!
وەنەوش:
ڕۆڵەکەم، کەڵکەڵەی مەنیج لە سەرت
دەربکە...

برزوو:
— مردم!
بێگومان مەنیجی نازدار مردووە؟
وەنەوش:

ئه ء ماوه، چ مانێ؟ مێردی کردووه؛
بۆ ماڵ و ژن به ژن باوکی چرووکی
له دێیه‌کی دوور
له به‌ندی پیرێکی توند کرد به بووکی،
ژاکاگوڵی سوور
وا ئێستا که‌وتووه له‌سه‌ر نوێنی خه‌م
فرمێسك ئه‌بارێنێ: که‌ی که‌م ئێسته‌که‌م!
[له هه‌مان جێگا، له‌پاش هه‌فته‌یه‌ك، له‌سه‌ر گڵکۆی برزوو]

کۆرسی کوڕان:
لێره‌دا دڵدارێك ئه‌نوێ کش و مات
نه‌وجوانێك بوو؛
نه‌ریتی به‌د نه‌یهێشت بگا به ئاوات
یاری له‌کیس چوو!
یه‌که‌مجار لێره‌دا به‌ستبووی په‌یمان
هه‌ر لێره‌یش خۆی پێ کوشت ده‌ردی بێ‌ده‌رمان
[له‌سه‌ر گڵکۆکه‌ی ته‌نشتی ئه‌و]

کۆرسی کچان:
ئه‌مه‌یه قیبله‌گای ته‌وافی کچان:
گڵکۆی مه‌نیج جوان
بۆ دۆستی جوانه‌مه‌رگ وه‌فای خۆی نوان
ئه‌ویش خۆی خنکان
خۆی کرده قوچی عه‌شق، قوچی سه‌ربه‌ستی
پچڕانی زنجیری کۆنه‌په‌رستی!
[له هه‌مان جێگا]

هه‌ردوو کۆرس [به تێکه‌ڵی]:
بێن کچان، بێن کوڕان، په‌یمان ببه‌ستین:
بۆ هێزی زۆرداری ملکه‌چ نه‌وه‌ستین؛
شه هیدانی عه‌شق

بکەین بە سەرمەشق
دڵداریی ڕاست و پاک ئامانجمان بێ گشت
یان بژیین سەرفراز، یان بچین بە کوشت!

سلێمانی. مارتی ١٩٥٣

# ئەنجامی ئەژدەهاک

یەک دوو هەفتە پێش جەژنی نەورۆزی ئەمساڵ (١٩٥٩) لەگەڵ هونەرمەندی بەهرەدار کاک قادر دیلان بڕیارمان دا کە پێکەوە تەقەلا بدەین بۆ بەرهەمهێنانی پارچەیەکی هونەری بۆ ئەوەی لە جەژنی باسکراوا پێشکەشی گەلی شارە خۆشەویستەکەمانی بکەین.

بەری تەقەلای من لەم پێناوەدا بیرکردنەوە بوو لە دانانی ئۆپێرایەک کە ئەمەی لای خوارەوە یەکەم پەردەیەتی.

لەبەرکەم و کورپیی ئەو کاتەی بە دەستمانەوە بوو، بڕیارمان دابوو کە ئەو بۆ ئەم پەردەیە دەست بکات بە دانانی ئاوازە و پراوەکردن لەگەڵ تیپی ئاوازە و تیپی تەمسیل تا من لە دانانی پەردەی دووەم ئەبمەوە، وە بەمجۆرە بڕۆین تا ئۆپێراکە ئەگاتە ئەنجام.

بەڵام داخەکەم کاک قادر بۆی نەکرا بەڵێنەکەی بێنێتە جێ. ئەمە بوو بە هۆی ساردبوونەوەی منیش، وە بەم ڕەنگە دەستم لە پرۆژە هەڵگرت.

ئێستا کە پەردەی یەکەم لە ئۆپێرای ناتەواو ئەخەمە پێش چاوی خوێنەوارانی «بەیان»[1]، ئەگەر لە هونەرمەندەکانمان ــ بە مۆسیقار و ئاکتۆرەکانەوە ــ هاندان و بەڵێنێک ببینم بۆ پشتگرتن و هاوکاری لە سەرپێگرتنی پرۆژەدا، ئەوا ئامادەبوونم پێشان ئەدەم بۆ تێهەڵچوونەوە و تەواوکردنی پەردەکانی تر.

**«گۆران»**

---

١) مامۆستا گۆران ئەم ئۆپەرێتەی لە ژمارە «٤» ی بەرگی «٢» ی ئاباری ١٩٥٩ ی گۆڤاری «بەیان» دا بڵاوکردووەتەوە کە بە سەرپەرشتیی خۆی لە سلێمانی دەرئەچوو. من خۆم دانەیەکی ئەو ژمارەیەی گۆڤارەکەم لابوو مامۆستا گۆران بە دەستی خۆی گەلێ دەسکاریی ئۆپەرێتەکەی تیا کردبوو، بەداخەوە لە بار و دۆخێکی سەختدا لە دەستم دەرچوو. م. م. ک.

پەردەی یەک

## بازاڕی ئاسنگەران

**جاڕچی** [ بەدەم زەنگ لێدانەوە] :

بە فەرمانی شای بێباک،
خاوەنشکۆ ئەژدەهاک،
ورتەتان لە دەم دەرێ،
بە شیر لە سەرتان ئەدرێ!

**یاساوڵان:** [ شیر هەڵئەکێشن] :

ورتەتان لە دەم دەرێ،
بە شیر لە سەرتان ئەدرێ!

•

**جاڕچی:**

مارانی شا بێقەرارن،
ناشتای مێشکی هەرزەکارن.
هەر ماڵەتان سەر و کوڕ،
کاسەی سەر لە مێشک پڕ
ئامادەکەن،
با یاساوڵان بیانبەن
بۆ چێشتخانەی شا، تا جووت جووت
مێشکیان بۆ مار ببێ بە قووت
بە دەستی وەزیر: کرماییلی ژیر!

**سەرکردەی یاساوڵان:**

سەر هیی شایە، ماڵ هیی شایە،
هەر ماڵە کوڕێک... چیی تیایە؟!

**جاڕچی:**

یەڵڵا! دەسا خاوەنکوڕان! هەریەکتان کوڕێ...
هەر ئێستا کە لەگەڵ ئێمە بیانخەنە ڕێ!

سەرکردە:

پەلە نەکرێ،
وەڵلا! بیللا! ئاگر لەماڵتان بەر ئەدرێ،
خاوخێزانتان ئەسووتێنرێ!
با گشت نەڕوا، یەک کوڕ بیرێ!

جاڕچی [لیستەیەک دەرئەهێنێ، دەست ئەکا بە خوێندنەوەی]:

ڕۆستەم کوڕی کاوە، کوڕی یانزەمین...

کاوە [بەدەم ئاسنکوتانەوە، لە بەر خۆیەوە]:

دەربەستی دە و یانزە نین،
وەستای پۆڵا و ئاسنین،
ڕۆژێک ئەبێ تۆڵەی گەلمان بسێنین!

جاڕچی [لەسەر خوێندنەوە ئەڕوا]:

برزووی خوسرەو، کوڕی هەشتەمی خوسرەو،
نەوزاد کوڕی قوباد، بێژەنگی پڕتەو...
دەرچن لە ڕیز، بێن لێرەدا بوەستن...

یاساوڵی یەکەم:

باوکی سەگتان بۆتان ئەگرین وەکوو ژن!

کاوە [لەبەر خۆیەوە]:

هۆی ژیانی گەل ژنە،
خەنجەر بێچووی ئاسنە،
زامی جەرگی ژن و پیاو
هیی دەستی یەک دوژمنە!
[دوو لاو بە پاڵەپەستۆ نۆرەبڕی لە یەکتری ئەکەن]

یاساوڵی دووەم:

کێشمەکێشی ئەم دوو سەگە
گلاراوی سەرەمەرگە!

**لاوی یەکەم:**
منم بێژەنگ، کوڕی خوسرەو!

**لاوی دووەم:**
منم! منم! خوشکمە ئەو!
[ یاساوڵێک شیرین لە نیشانەی تیری ڕووت ئەکا]

**سەرکردە** [ بە تووڕەیی سەر با ئەدا] :
غەش لە شای ئەژدەهاک ئەکا؟!

**کچان** [ لە ڕیزی پشتەوە دەرئەپەڕنە دەرەوە] :
زۆر چاک ئەکا! زۆر چاک ئەکا!
کچ بۆ نابەن لەباتیی کوڕ، خوشک لە جێی برا؟
کچ بۆ بژی، لەکاتێکا کوڕ تۆوبڕ کرا؟
[ نیوەی یاساوڵان لاوەکان ئەدەنە بەر و ئەیانبەن]
مێشکی کوڕ و کچ لای مار،
لای ئەژدەهاکی زۆردار
هەر یەکە، هەر یەک بێگومان!
ئیتر بۆچ بێبەش بن کچان
لە خەبات و قوربانی دان
بۆ نیشتمان، بۆ کوردستان؟

**سەرکردە:**
یاساوڵان، ئەم کچانەش هەموو بگرن،
تا لە بەندیخانەی شاژن ئەیانکوژن!
[ بەستەی کچان]
بۆ کچە کورد ژینی دیلی ژین نییە،
بە دەمی دیل هەنگوین هیچ شیرین نییە،
ئەی قژی زەرد، وەکوو پووش دەسکەنە بە!
ئەی لێوی ئاڵ، بە بێ زەردەخەنە بە!
چاوی ڕێژراو پێمەکەنە وەکوو گوڵ
بۆ ڕۆژی ڕەش برژێنە فرمێسک بە کوڵ!

لەنجە مە کە بەژنوباڵای نەمامی،
ڕەشپۆشی جوانەمەرگیی چەند برامی؟
بە کەساسی کەچ بە، گەردنی بێگەردا!
سەرکوڵمە کان، بگرن ڕەنگی لیمۆی زەردا!
بۆ خۆشەویستی لێمەدە ئیتر، دڵ!
لە ناو گۆڕی تەنگا با ببی بە گڵ!
کە ئازادی و باوك و برا لە کیس چوو،
کچە کوردێك چ زیندوو بێ، چ مردوو!
[کرماییلی وەزیر کە تێئەپەڕێ، گوێ لە گۆرانیی کچان ئە گرێ کە تەواو ئەبێ. دوایی کچان ئەبەن]

[ ئاسنگەرە کان لەناو خۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆ]

**یەکەم:**
داوەشینە! دارزینە!
خەڵکینە کەی ئەمە ژینە؟

**زۆربە:**
خەڵکینە کەی ئەمە ژینە؟

**شاگردێک:**
وەستا هەلی ڕاپەڕینە!

**هه ندێک:**
ڕاستە، هەلی ڕاپەڕینە!

**کرماییل:**
[ ئە گاتە بازاڕی ئاسنگەران، سڵاو لە کاوە ئە کا] :
خاوەنشکۆ بێدەماخە.
دڵمان هەموو پڕ لە داخە!
چاوی ماری ناچێتە خەو
نە کاتی ڕۆژ، نە کاتی شەو!
لە خۆراکی مێشکی کوڕیش

سەر با ئەدەن بە فیشە فیش!
ئیستا ئەڵێم چۆنیی کچان
بکەم بە هۆی ڕەشمار لاسدان،
ماری دڵتەڕ، کچ هەڵپەڕێ
خەویشی دێ و ئەشلەوەڕێ!
[سەر ئەنێتە گوێی کاوە]
هەر لاوێکم لە مەرگ بۆ لا دراوە،
لە نهێنگا ئامادە ڕاوەستاوە،
لەگەڵ یەکەم جووڵەی شۆڕش ئەوان زوو
داگیر ئەکەن لە کۆشکا برج و باروو

کاوە:
جووڵە بە زستان ئەتەزێ
سەرما وەکوو مار ئەگەزێ!
تا گوڵاڵە دەشت سوور نەکا،
پیاو ئاسان خوار و ژوور نەکا،
دەستدانە شۆڕش گرانە،
لەم وڵاتی کوردستانە!

کرماییل:
ئەی کە پێمان نایە بەهار؟

کاوە:
زۆر زۆر بەجێیە پەلامار!
هات و پەلامار سەرنەکەوت،
مل ئەنێین بۆ شاخ و ئەشکەوت.

کرماییل [هەر بە چپە]:
ئەم کچانەی ئەمرۆ گیران،
پەڵپ و بیانووی چۆنیی ماران،
دەربازیان ئەکا وەک یاران!

کاوە:

هەر بژییت سەرباشقەی ژیران!
[کرمایل ملی ڕێ ئەگرێ. دوور ئەکەوێتەوە]

کاوە: [بە ئاسنگەرە هەڵچووەکان]:
براکانم! ئەمڕۆ ڕۆژی دان بە خۆداگرتنە
ڕاپەڕینێک بێوادە بێ هۆی تێچگاری مردنە
لەم کاتەدا خزمەت تەنیا بێوچان ئیشکردنە،
بۆ ڕۆژی خۆی چەکی زۆر و تفاقی زۆر خستنە.
ئەگەر دڵسۆزی ڕاستیین،
ئەبێ هەرگیز نەوەستین،
ئاسن بکوتین بە ئاسن،
داس دروست کەین و گاسن،
شمشێر و تیر و خەنجەر
فریا خەین بۆ شۆڕشکەر!
[ئاسنگەرەکان سارد بوونەوە و دەستیان دایەوە کەرەستەکانیان و کەوتنەوە کارکردن]

ــ پەردە داکشا ــ

## کۆمەڵەی حەوتەم

# پیەس لە یەک پەردەی کورتا

# دوشمنمان مێشووله

ــ پەردە هەڵکشا ــ

[کۆشکێکی گەورە دەرئەکەوێ، بە خەتی درشت لەسەر دەرگاکەی نووسراوە: «پرۆژەی لە ناو بردنی مەلاریا». لە کۆریدۆر چوار پێنج پسپۆڕ و ناپسپۆڕی بێگانە دەوری مێزێکیان داوە بە میکرۆسکۆب تەماشای گەرا و کرمی مێشوولە ئەکەن. ئەمانە گشتیان نیشانەی پسپۆڕی: چاویلکەی زەق زەق و کەللەسەری زل زلی ڕووتاوەیان هەیە... لە پشت سەریانەوە تابلۆیەک بە دیوارا هەڵواسراوە، هی وێنەی هەزار جار گەورە کراوی مێشوولەیەکە بە هەزار ڕەنگ بۆیە کراوە، ڕەنگی وا جوان کە مێشوولەی قەحبەباب هەرگیز بە پەپوولەی بەهاریشەوە نەیدیوە... پۆلێک کرێکاری نیشتمانییش، پەڵاسی شڕ و چڵکن لەبەرا، سێپا و لوولەی خەریتە و سەتڵ و ترومپا و پاچ و خاکەنازیان هەڵگرتووە چاوەنواڕی ئەکەن... پیرۆتە سیس کە نەخۆشێکی سیلاویی بێدەرمان و بێخۆراکە، لەوبەری شەقامەوە پاڵی لێداوە بە دیوارەوە، تەماشای ئەم دەزگا و دووکانە ئەکات.]

**پیرۆتە سیس** [بە گۆرانییە کەلەگیزەی مێشوولە ئەچێ]:

ئەم زانا و دوکتۆرە گەورانەی دوور وڵات،
نێرراون: بگەنە هاواری ئێمەی لات
دوو فلسێک هەمانە و تیا نابێ نرخی نان
بیدەنە تفاق و ترومپا و داودەرمان
تا ڕەگی مێشوولەی دوشمنمان دەربێنن
وا تۆڵەی لەبرسا مردنمان بسێنن!

ــ پەردە داکشا ــ

تەمووزی ۱۹۵۳

# شیوەنی دارستان

ـ پەردە هەڵکشا ـ

[ لادێیی چۆغەشڕ بەرامبەر بە کۆشکێکی گەورە وەستاوە، بە ئینگلیزی و بە عەرەبی لەسەر دەرگاکەی نووسراوە: «دائیرەی دارستان»].

لادێیی چۆغەشڕ:

ئەم کۆشک و دەزگایە کە پۆشتەی تفاقە — بێگانە ئەیگێڕێ و بە ناو هی عیراقە...
کەس نەبوو عیراقی کە هێندە دانا بێ: — بزانێ شاخ نابێ دارستانی تیا بێ!
ناچار بووین هێنامان پسپۆڕی بێگانە، — بە زانست سووتاندی ئەم دارستانانە،
هەمووی کرد بە خەڵووز، پێشکەشی ئاغای کرد — ئاغاشمان بە دیاری بۆ پاشای بەغای برد...
ئێستا کە ئێمەین و شاخێکی وەک کەچەڵ، — با هەر بەین بە سەرا قوڕی خەست بە تۆپەڵ!

ـ پەردە داکشا ـ

تەمووزی ١٩٥٣

# ماستاو...

ـ پەردە هەڵکشا ـ

ئا: تەلەفۆنی ئەمسەر: ئاغا لە هاوینە هەواری کوێستان
ب: تەلەفۆنی ئەوسەر: کاربەدەستێک لە باڵیۆزخانەیەک

ئا:

هەلاو... هەلاو... گەورەم! سێرم!
هۆی گیرفان و سکی تێرم
هەلاو... هەلاو...
ڕووناکیی چاو!

ب:

ئەلۆ... ئەلۆ... «شێک»م! «ئاگا»[1]م!
لەناو گەلتا پشتم، پەنام!
ئەلۆ... ئەلۆ...
«کۆت» براڤۆ!

ئا:

جێگام بەرزە و سەیرانگایە،
نزیک بەوپەڕی دنیایە...
بۆچ بچووکت گەورە ناکەی؟
چاوەڕوانیی من هەتا کەی؟
هەلاو... هەلاو...
ڕووناکیی چاو!

ب:

زۆر «موشتاک»م، زۆر پەرۆشم:
بێم ماستاوی سارد بنۆشم،
بەڵام «ئاک!» لە «داک»ی ڕووتە
نۆشی گیان لام «زەکنەبووت»ە!
هەرچەند من دێم ڕائەپەڕن
لە منیش و لە تۆیش پڕن!
ئەلۆ... ئەلۆ...

«کۆم» برای تۆ!.

ئا:

هەلاو... هەلاو... ڕووناکیی چاو!
لەگەڵ خۆت زۆر بێنە دراو،
بە مانگانە پیاو ڕائەگرم،
ورتەیان کرد سەریان ئەبڕم!
دوایی: نەیەی، ئەودیو سنوور
لێمان ئەکرێ بە ئاگری سوور!
هەلاو... هەلاو...
خاوەندراو!

ب:

هەر تۆ و دراو؟ بە بانی چاو!
بەرخ سەر بڕە و سارد کە ماستاو
ئەلۆ... ئەلۆ...
«کۆت» براقۆ!

ئا:

هەرتۆ و کەباب؟ هەرتۆ و ماستاو؟
هەی بەسەر چاو! هەی بەسەر چاو!

[ئاغا هستێریای کامەرانی ئەیگرێ، لەگەڵ ئەوەی خەت داخراوە، گوێدانی تەلەفۆنەکەی هەر بەدەستەوەیە، بەدەوری خۆیا ئەسووڕێتەوە و سەما ئەکا]

میوان؟ دراو؟
کەباب؟ ماستاو؟
هەلاو...! هەلاو...!
هەلاو...! هەلاو...!

ـ پەردەداکشا ـ

سلێمانی. ئابی ١٩٥٣

---

١) ئەو وشانەی کە لە ناو کەوانەکەدان، ئیملایان بەپێی دەم و زمانی بێگانە کە نووسراوە کە بە ئاغا ئەڵێ «ئاگا» وە بە خۆم ئەڵێ «کۆم».

# وڵاتی ئاوا

ـ پەردە هەڵکشا ـ

[ دەستەیەك شاریی بێکار و بێدەرەتان لەبەر دەرگای کۆشکێك وەستاون کە ئەوەندەی قشڵەیەك گەورەیە، لەسەر دەرگاکەی نووسراوە: «لاتخانەی شار» لەناو ئەم دەستەیەدا «نالە یەك‌لنگ» خۆی داوە بەسەر دارشەقەکەیا، هۆرە بۆ مەجلیسی ئیعمار ئەکا کە ئەم کۆشکە جوانەی بنیات‌ناوە] :

بـــڕوانـــن لاتـــخانەی ئـیعمار چ زلە: چل ژوورە و هەر ژووری جێی نوێنی چلە!
بــەم‌جۆرە، هــەر شـارە سـەر و لاتـخانە دروست کا، کێ ئـەڵێ: عـیراق وێـرانـە؟
هەر بـژی وڵاتـێك: دەزگـای ئـیعماری، لاتخانەی پـڕ نـاکـا دانـیشتووی شـاری!

ـ پەردە داکشا ـ

سلێمانی. ئابی ۱۹۵۳

# جۆقی یۆنسکۆ

**شوێن:** دێیەکی ناوشاخ.
**کەسەکان:** ١) ئەندامانی جۆق: پڕۆفیسۆر، دومبەکچی، کەمانەژەن، کچە مامۆستای گۆرانیبێژ، کچە مامۆستای سەماکەرە. ٢) دانیشتووانی دێ بە ورد و درشتەوە.
**نیاز لە هاتنی جۆق:** فێرکردنی خوێندەواری و ماڵداری و دروومان وکشتوکاڵ و مۆسیقا و دانس تاد، بە دوو هەفتە لە چوار پێنج دێدا.

ـ پەردە هەڵکشا ـ

**پڕۆفیسۆر:**
هاتووینە دێی بەرد و کوچک
خڕ بیژەنە وەستای دومبک!
خڕ بیژەنە کەمانەژەن!
کچان، ئێوەش شەما بکەن!
[ساز و سەما دەست پێ ئەکا]

**کچە مامۆستای گۆرانیبێژ:**
من زانای دەرسی ئەلفبام
دوو جار بڵێن: تەرلای لای لام!

**هەموو:**
تەرلای لای لام...
تەرلای لای لام...

**کچە مامۆستای گۆرانیبێژ:**
«نوون» بۆ نانە، نانی گەنم.
تەرلای... پێتان پێئە کەنم!

**هەموو:**
تەر لای لای لام...
تەر لای لای لام...
**کچە مامۆستای گۆرانیبێژ:**

«گاف» بۆ گۆشته و «پێ» بۆ پلاو
نه‌ك نایخۆن، نایبینن به چاو
ته‌رلای لای لام، ته‌رلای لای لام
دوایی هات ده‌رسی ئه‌لفبام!

هه‌موو:
ته‌رلای لای لام...
ته‌رلای لای لام...

دومبه‌كچی:
ته‌پ ته‌پ... ته‌پ ته‌پ...
به هه‌ردوو ده‌ست: سێ راست، یه‌ك چه‌پ!
ته‌پ وه‌ك زرمه‌ی ده‌سترێژ وایه
بێ شه‌ڕ نابێ ئه‌م دنیایه!
تا ئه‌توانن ته‌پ ته‌پ فێر بن
سێ سك برسی، یه‌ك سك تێر بن!

هه‌موو:
ته‌پ ته‌پ... ته‌پ ته‌پ...
سێ راست، یه‌ك چه‌پ!

كچه ماموٚستای سه‌ماكه‌ره:
ده‌ی دانیشتووی به‌رد و كوچك
له‌سه‌ر هه‌وای پیره دومبك
چه‌پڵه لێده‌ن، سه‌ما بكه‌ن
[چه‌قه‌نه لێ ئه‌دا]
ئاوا بكه‌ن!
[سمت بائه‌دا]
ئاوا بكه‌ن!
[گشتیان ئاوا و ئاوا ئه‌كه‌ن]
تا وا نه‌كه‌ن چۆن تێئه‌گه‌ن؟
تا تێنه‌گه‌ن چۆن پێئه‌گه‌ن؟
پرۆفیسۆر:

دانیشتووی دێ، درشت و وردا!
هەموو تانمان زۆر باش فێر کردا!
«تە رلای لای لام»تان لەبەرە
گشتتان بوون بە سەماکەرە.
[ چەقەنە لێ ئەدا و گشت بە شوێنیا لێی ئەدەن]
ئاوا ئە کەن!
[ سمت بائەدا و گشت بەشوێنیا بای ئەدەن]
ئاوا ئە کەن!
لە من باشتر سەما ئە کەن!
ئیتر کارمان نەما لاتان
ئەتانسپێرین بە خواتان!
[ بە دەم گۆرانی و چەقەنە و سووڕدانەوە، شانۆ دەست ئە کا بە چۆڵبوون]

هەموو:
تەرلای لای لا... تەرلای لای لا...
یۆنسکۆ جوان دەرس دائەدا!

ـ پەردە داکشا ـ

سلێمانی. ئەیلوولی ١٩٥٣

# موحاكەمەی مام چەوەندەر

[ پەردە هەڵکشا وساڵۆنی موحاکەمە بە دەستەی تەواوەوە، کەوتە بەرچاو...]

١ ــ موحاکەمە:
ــ ناوت چییە؟
ــ مام چەوەندەر!
ــ لە کوێوە دێی؟
ــ لە دەشت و دەر.
ــ بە چی هاتی؟
ــ بە پشتی کەر.
ــ کێ هانیتی؟
ــ لالە ڕەنجدەر.
ــ چۆنی هانیت؟
ــ بە دەردی سەر.
ــ بۆ کێی هانیت؟
ــ ئاغای سێبەر.
ــ ئاغا چیی وت؟
ئیللا گێزەر!
کەڵکی نەگرت
تکای ڕنجدەر،
بەر شەقیان دا
دەستەی نۆکەر:
«ئیللا گێزەر...
ئیللا گێزەر...»

٢ ــ بڕیار:
بەڵێ، مادام لالە ڕەنجدەر
بۆی نەگونجا لە چەوەندەر
بارەگێزەر بێنێتە بەر؛
وا دامانتا بە تاوانکەر!

یەڵلا، پۆلیس، بیدەنە بەر،
لشەشی کوت کوت کەن بە خەنجەر!

[ پەردە دا کشا و ئیتر کەس نەیزانی مام چەوەندەریش چیی بەسەر هات؟ ]

سلێمانی. ئەیلوولی ١٩٥٣

# نق و جق

**دیمەن:** ژووری دائیرەیەک... لای ڕاست کورسی و مێزی نق... لای چەپ کورسی‌و مێزی جق.
جێگای تەلەفۆن لە ناوەڕاستی هەردووکیانا، بە دیوارەکەی پشتیانەوە... دەرگای مەعبێن لەگەڵ
ژووری سەرەک لە بەری لای نقەوە... تاد.

ـ پەردە هەڵکشا ـ

**هەژار** [سێ هەنگاو ئەنێ بۆ بەردەمی نق]:
ـ قوربان کارم؟
**نق** [بێ سەرهەڵبڕین]:
ـ بە دەست جقە.

**هەژار** [سێ هەنگاو ئەنێ بۆ بەردەمی جق]:
ـ قوربان کارم؟
**جق** [بێ سەرهەڵبڕین]:
ـ بە دەست نقە.

**هەژار:**
ـ قوربان، مەئمووری نق، کارم،
عەرزوحاڵەکەی پێرارم؟
**نق** [سەر هەڵئەبڕێ... قەڵەمەکەی دائەنێ... جگەرەیەک دائەگیرسێنێ... پاڵی لێ ئەداتەوە]:
ـ کوڕە، کابرا، ئەموت بڕۆ
لای جقە عەرزوحاڵی تۆ؟!

**هەژار:**
ـ مەئمووری جق عەرزوحاڵم؟
هێند پرسیم کاول بوو ماڵم!
**جق** [هەمان دەستووری نق پاڵی لێ ئەداتەوە]:
ـ کوڕە. کابرای بێ سەر و پێ،
ئەموت لای نق بۆی بگەڕێ؟

**هەژار** [لە بەر خۆیەوە]:

ـ تەقیم... ورگم پڕ بوو لە ڕق
[ بە دەنگی بەرز] :
داد، گەورەی نق! داد، گەورەی جق!
[ دەرگای مەعبێن کرایەوە، سەرەك بە دەموچاوێکی تووڕەوە سەری کێشا، نق و جق هەڵسانە سەر پێ]

سەرەك:
چیە کابرای قرە قڕکەر؟

جق:
گەورەم، لێمان تێك ئەدا سەر!

هەژار:
قوربان! عەرزوحاڵی پێرار!

سەرەك:
هەی قو ڕزەڵقورت! هەی زەهری مار!
پەلە لە کاربەدەست ئە کەی؟
لە نق و جق سەر تێك ئەدەی؟
هەژار:
قوربان، پەلەم نە کردووە!

سەرەك:
بۆ عەرزوحاڵ دوو ساڵ زووە!
بۆچی ئێرە خومخانەیە؟
یا جقخانەی شاهانەیە؟!

نق:
کاری ئاغا چوار ساڵی برد!

جق:
هی بە گمان بە پێنج تەواو کرد!

سەرەك: [ لە بەر خۆیەوە بە تەوس و تووڕەیی] :
پێرێ عەرزو حاڵی داوە،

ئەمڕۆ کەوتۆتە ئاژاوە...
[ ڕوو ئەکاتە نق]
تەلەفۆن کە، تەوقیف بکرێ.
با بەس بێت بەرۆکمان بگرێ!
نق: [ دەم ئەنێ بەگوێچکەدانی تەلەفۆنەوە] :
ئەلۆ... پۆلیس! مەوقووف هەیە.

سەرەک:
با تێبگات درەنگ کەیە!
[ ئەوەندەی نەخایاند، پۆلیس پەیدا بوو... دەس کرا بەکەلەپچە کردنی هەژار...]

هەژار: [ بە واقوڕماوی چاوی گێڕا بەگشتیانا. لە بەر خۆیەوە] :
حەی لە نق و جقی کارم
چەند گورج دەرچوون بۆ ئازارم!؟
[ هەژار درایە بەر بۆ بەندیخانە و ئیتر پەردە داکشا]

سلێمانی. ئەیلوولی ١٩٥٣

# خۆزگەی هەژار

ـ پەردە هەڵکشا ـ

[بارامەگول بە پەڕۆی خامی چڵکن برینەکانی دەست و قاچ و ملی پێچاوە. لە تاو ئازار لە بن سێبەری درەختی شەقامدا چیچکەی کردووە... لەنگەری لەشی خستووەتە سەر گۆچانە لار و گێرەکەی... بەرامبەری ئەو دەروازەی بەیتاڵخانەیە... ئەسپێکی ژانکردوو بە دەست نۆکەری ئاغاوەیە، بەیتاڵ خەریکە تەرمۆمیتر (گەرمپێو) لە کۆمی وڵاخەکە دەرئەهێنێ و ئەیداتە بەر شووشەی چاویلکەکانی بۆ خوێندنەوە... مادامێکی تەڕپیریش خۆی لە پۆدرەیەکی خەستا گەوزاندووە، بە لچ و لێوێکی خوێناوییەوە توولەیەکی نەخۆشی گرتووەتە باوەشی، لایانا وەستاوە... مادام توولەکەی وەکوو منداڵ ڕائەژەنێ بۆ سووککردنی ئازاری...]

بارامەگول [بەدەم گریی تاوە، بە گۆرانی]:

ئەم کۆشکە، کۆشکی چوارپێی نەخۆشە، بۆیە وا بەرزە و گەورەیە و خۆشە!
تفاقی و دەرزی و دەوا و دەستووری، پڕفەرشیی و پاکیی تەویلە و ژووری
مایەی حەسرەتی دووپێی هەژارە کە دوکتۆر دەوای ناکا بێ پارە!
سا خۆزگەی هەژار: بەگاجووتی بەگ، بە ئەسپی ئاغا، بە تانجی، بە سەگ!

ـ پەردە داکشا ـ

سلێمانی. ئەیلوولی ١٩٥٣

# عەرزوحاڵ

بنووسە بۆ پاشای مەزنی «بەغا»[1]   نیشانەی دڵسۆزیی بێگەردی ئاغا:
دوو لۆری دیاریمان ئەوا خستە ڕێ   هیوایە بەڵێنی خۆی بێنێتە جێ!
ڕاسپێریت کە لێرە جەنابی مدیر   لە نایب دانانا بمخاتەوە بیر،
نەهێڵێ ڕووڕەش بم وەک جاری پێشوو   کە درام بۆ ئاغای ئامۆزام بە شوو!
دیاریی من لە دیاریی ئەو چەورترە،   بەرتیلم لە هی ئەو جێگاگرترە
ڕاستە ئەو ناو بە ناو، لە باڵوێزخانە   سەرئەدا و وەرئەگرێ یەک دوو مانگانە...
ئەمەیە کە فەڕی خستۆتە بەختی،   پاشاکان ناچار بوون بگرن حورمەتی!
خۆ منیش دووراودوور هەر فەرمانبەرم،   بۆ باڵوێزخانەکان خەفاوە سەرم،
بە دوو چاوی تیژ و جووتێ گوێچکەی سووک   هەمیشە هەڵپەمە و خزمەتی بچووک
پێشکەشی بارەگای بەرزیان ئەکەم،   ڕاپۆرتی دەنگوباس مانگ بە مانگ ئەدەم!
هەر ئەوەم تاوانە کە لە شار دوورم   تا تۆزی دەرگایان زەرد کا ڕووی سوورم،
وەک ئاغای ئامۆزام، وەکوو پاشا خۆی   کە کۆشک و کارخانە و بانق لواوە بۆی!
دە ڕێم بەن، یەک دوو ساڵ منیش بێمە شار   دەستی قرپ بێنمە خەرمانی دینار!
چیم وەر گرت لە میری، لە باڵوێزخانە،   چیم دزی لە ڕووتەی ئەم نیشتمانە
دوا فلسی بهاومە بنی ئاوی حەوز:   لەسەر جێی شەوی سوور، لەسەر مێزی سەوز...
بزانن ئەو حەلە من یا ئامۆزا:   قەڵانتر ئەنوێنین گەردنی ڕەزا؟!
بزانن من یا ئەو، لە حەق پارلەمان   ئەبینە هۆی لوتفی باڵوێزخانەکان:
بە دەنگدان، مۆرکردن، هەڵبرینی دەست،   هەر پاشا بنوێنێ گۆشەی چاوی مەست!
بزانن من یا ئەو، کەڵکی کۆمپانی   باش ئەگرین بە خەستیی بەستەزمانی؟
بزانن من یا ئەو، وەکوو کەڕ و لاڵ   بەرامبەر بە تانە و توانجی تاڵ تاڵ،
کونی گوێ بە لۆکەی بێعاری ئەگرین،   «نە» نالێین بە میری هەرگیز تا ئەمرین؟
بزانن من یا ئەو، بماندەنێ تێغ،   بۆ پاکۆی سەری گەل نامانبێ دریغ؟

* * *

ئەی پاشای خاوەندی کۆشک و کادیلاک!   بۆ باڵوێزخانەکان بە دڵسۆزیی پاک
سوێن ئەخۆم کە بوومە نوێنەری کورد   تێکۆشم ملی کورد چاکتر بکەم ورد!
ئیتر چاوەڕوانم جەنابی مدیر،   ڕاسپێری، ئەمجارە دەرنەچم لە بیر!

**ئیمزا   سلێمانی مۆری ئاغا ـ ١٩٥٤**

---

١) بە بۆنەی بار و دۆخی ڕۆژی بڵاوکردنەوەی یەکەمجاری ئەم پارچە شیعرەوە لە ڕۆژنامەی «ژین»دا ـ ١٩٥٤ ـ مامۆستا گۆران لە جیاتیی «بەغا» نووسیبووی «غەوغا». بەڵام من خۆم ئاگادارم ڕاستەکەی «بەغا» بوو. م. م. ک.

# دەنگی مردوو

**لیستەی هەڵبژاردن، لە زۆر شوێن، ژمارەیەکی نەک کەم، ناوی مردووی لەگۆڕا ڕزیوی تیا بوو... ئاگاداربوون لەم ناوانە بوو بە هۆی دانانی ئەم هەلبەستە.**

نوێنەری هەڵبژاردەم!
بەپێی لیستەی میری و موختار
خۆت و هاوڕێت هەڵئەبژێرم
مادام منم هەڵبژێرتان،
ئێوەش نوێنەری چا بن
ناڵێم: مەخۆن، چش لە خواردن،
بەڵام، وێنهار، پارلەمانتان
بەرد بێتە گۆ، ئێوە وس بن،
دوایی مەبزوون، بە موو چییە؟
لە ڕووناکی بەرچاو ڕەش کەن،
ئاسۆتان تەنگ بێ وەک گۆڕم،
تا دنیا کۆن بێ هەر وەک خۆی،
دەزگاتان وەک ئێک ڕزیو بێ،
ڕۆزی و ڕزقی بە سەر زیندووی
دوایی: ڕاستیی بێزمانیم،
لەبەرئەوە: کورد نیم، نەکەن
بەرگم ناویێ، هەرزانیی جل
بەڵام کفنی زۆر داوا کەن،
بۆ تابووت و بۆ تاتەشۆر
ئەڵقین خوێندن ئیجباری بێ!
حەڵوای سێ ڕۆژگانە لێنان
بەڵام، ئەی هەڵبژاردەی من!

هەرچەن مردووی یەک دوو سەدەم،
وەک تووتی هاتوومە گوفتار،
بۆ پارلەمانتان ئەنێرم...
هۆی مانگانە و خێر و بێرتان،
کوتومت چەشنی خۆم وا بن!
چش لە ورگیش پەتی کردن
بێتە چەشنی گۆڕستانتان.
دوورن لە یەک: مردوو و وتن!
جووڵان بەڵگەی ژیاوییە!
گوێتان لە بیستن بێبەش کەن،
هیچ مەگۆڕن، وەک ناگۆڕم!
هەوای تازە هەڵنەکا بۆی!
وڵاتتان گڵکۆی تەپیو بێ،
زیاتر نەبێ لە هی مردووی...
دەرئەخاکوردی نەزانیم،
دەمتان لە حەق بۆ کورد بدەن!
بۆ گەل هەرگیز نەگرنە مل!
گۆڕستان پۆشتە و ئاوا کەن!
وەستای هونەر تەرخان کەن زۆر!
گۆڕ هەڵکەندن میعماری بێ!
بە کچ فێر کەن، نەک چێشت و نان!
دەست نەدەنە دەستی دوشمن!

هەرچەن کۆن و کۆنپەرستم، لە ناپاکی کردن پەستم.
پێم شەرمە وڵات بفرۆشن، یان بۆ دەزگای شەڕ تێکۆشن!
چونکە نوێنەری منن، لایەنگری ڕێی مردنن،
وا ئەزانن هەڵبژاردەن بۆ ئەوەی میللەت بە قڕ دەن!
دڵنیا بن کە دەستخەڕۆن، لە ئەنجاما هەر ڕەنجەڕۆن!
ڕۆژێک ئەبێ گۆڕبەگۆڕ بن خواش خۆش نەبێ لێتان وەک من.
منیش کردەی نوێنەرم، خراپەکەی دێتە بەرم،
ئەبینم ڕۆژێک لە ڕۆژان: دنیا بوو بە ئاگرباران!
بۆمبا گۆڕی هەڵتەکانم با بردی گەردی ئێسقانم!!
ئەوسا وەک زیندوو تێئەگەم: چ شوومێک بوو هەڵبژاردەم؟!

سلێمانی ـ ١٩٥٤

# جاسووس...

بێ خشپە و زیاندار، ئەکشێم چەشنی مار:
بە پێچ و بە پەنا، بێ هەرا و بێ زەنا،
ئەگەڕێم، ئەگەڕێم، تا تووشی نێچیر دێم!
نێچیری هەژارم، بێخەبەر لە کارم،
وەستاوە بێگومان لە ماری بێئامان!
ئەوەندە ئەزانێ شەقەیەک دێ و دانێ
لە زامی ئەچەقێ، ژان وەک تۆپ ئەتەقێ
نێچیری گلاوم ئەبینم بە چاوم،
چۆن ئەکا تەپاوتل لە عەزرەت ژان و گل
بەڵام من بێهەستم، ئیتر چۆن دەربەستم؟
ژان چییە و زیان چی؟ بەزەیی و ویجدان چی؟
ئەوەندە ئەزانم: دوژمنی ئینسانم
درەنگ، زوو، ڕۆژێک دێ: کام ئینسان، لە کام جێ؟
قۆندەرەی بمگاتێ، حەقی خۆم ئەداتێ!

سلێمانی ـ ١٩٥٤

# چەقەڵ

ئەلوورێنێ...
چەقەڵی پیر ئەلوورێنێ...
بڵێسەی دوو چرای چاوی
بەرەو ئاوایی ئەکشێنێ:
لەناو تاریکایی شەوا،
کاتێک چاوان وان لە خەوا،
کاتێک سەران لەسەر سەرین
بۆ خەو ئەژین! بۆ خەو ئەژین!

چەقەڵ! چەقەڵ! چەقەڵی پیر!
بە لوورە لوور
هاتووی لە دوور،
لە کام کەتنا کول ئەکەی بیر؟
دانت لە گۆشت مریشک جیرە،
یان کەڵەشێر...؟
یان خەریکی ئەکەی زیرە
بۆ کولێنی پڕ خێرو بێر؟
یان قەپۆز ئامادەی قەپی
بۆ قۆزتنەوەی کۆتری سپی؟
چەقەڵی پیر! چەقەڵی گەڕ!
بیری پووچی ناو مێشکی لەڕ
لە سەر دەرکە،
خۆت بەس کەرکە!

وا خەریکە: شەبەق ئەدا،
کەڵەشێر بانگی حەق ئەدا،
خاوەنکولێن، وریا و بێدار،
باڵی هەڵماڵیوە بۆکار،
کۆتر ئەفڕێ و مژدەی ئاشتی
جاڕ ئەدا بە درێژیی گەشتی!

ئیتر چەقەڵ!
تاک یان کۆمەڵ:
شۆڕ کەنەوە کلک بۆ ناوگەڵ،
بکشێنەوە بەرەو شەخەڵ،
بڕۆن، خوای شەیتانتان لەگەڵ!

سلێمانی ـ ١٩٥٤

# سەگوەڕ

**بۆ ئەوانەی خۆیشیان ئەزانن کە لە ناحەق ئەگەفن!**

توولەی دەرگای ئاغایان گشت،
کلکی نایە سەر نەڕەی پشت!
سەری کێشا، دی: بنی ئاو
توولەی تیایە، سەردا کێشاو!
گوێچکەی قوت کرد... گوێچکە قوت بوو.
کە بۆی مڕان... بۆی مڕان زوو

ــ حەپ، حەپ... حەپ، حەپ...
ــ حەپ، حەپ... حەپ، حەپ...
ــ بتنێمە ژێر بەگاز، بە قەپ؟
ــ بتنێمە ژێر بەگاز، بە قەپ؟

ــ حەپ، حەپ... حەپ، حەپ...
ــ حەپ، حەپ... حەپ، حەپ...

ــ توولەی بن ئاو، سەگی خوێڕی!
وات لێ هات لە من بوەڕی؟
ــ توولەی سەر ئاو، سەگی خوێڕی!
وات لێ هات لە من بوەڕی؟
ــ حەپ، حەپ... حەپ، حەپ...
ــ حەپ، حەپ... حەپ، حەپ...

توولەی دەرگای ئاغایان گشت،
وەك کەڵەشێر کلك لەسەر پشت،

ئەوەن وەڕی... ئەوەن وەڕی
تا لە کاسە چاو دەرپەڕی...

* * *

منیش هەندێ کەس، پاشملە،
لێم کەوتوونە تەقەی زلە،

بەڵام، من وەک حەوزێکی مەنگ،
هەرگیز لێیان نایەمە دەنگ!

با بۆ خۆیان هەر بگەفن؛
هەر خۆیان هەردوو تەرەفن!

سلێمانی ــ ١٩٥٤

# ماکارتی

سەناتۆر ماکارتی، کۆنەپەرستی گەیاندیە ڕادەی کتێب سووتاندن. جارێکیان لە شاڵاوێکیا کە بردی، ژمارەی چەند سەدێک کتێبی وەک پیری مشکان داپاچی...

پیرە مشکی دێرینەیە ماکارتی،
عەقڵی شڕ، پینە پینەیە ماکارتی،
چەوریلێسی مەکینەیە ماکارتی،
دەرگای کونی گەنجینەیە ماکارتی،
لە بیری نوێ بەکینەیە ماکارتی،
کتێب لای ئەو پەڵپینەیە ماکارتی،
ئینسانی مشک: ماکارتی!
مشکی بێ کلک: ماکارتی!
مشکی دوو قاچ: ماکارتی!
کتێبداپاچ: ماکارتی!
مشکی چەپەڵ: ماکارتی!
میکرۆب لەگەڵ: ماکارتی!
ماکارتی... هۆ ماکارتی!
هۆی شەرمی ئەمریکاتی!

# ڕازی... ناڕازی

ڕازی... ناڕازی...
عەلی حیجازی[1]
«ئە بازی و بازی
بە ڕیشی قازی!»[2]

ئەی سالح جەبر[3]
پڵنگ بی و بەبر
نەتماوە زەبر
بەس بگرە سەبر
ڕاکە بۆ قەبر

ئینگلیزە هەردوو
بە ئینسان کردوو
گەر دار، گەر پەردوو
لەعنەتی کورد و
عەرەب لە هەردوو

ڕازی... ناڕازی...
عەلی حیجازی
ئە بازی و بازی
بە ڕیشی قازی
ئەم عیراقە
دوڕگەی واق واقە!
سەری ساباقە،
بنی وڕاقە!
هەم جێی نیفاقە،
هەم بێتفاقە!
پایەی وەک فاقە!

**بۆ واقە واقە!**
**کام گەورەی تاقە**
**کەری دوو لاقە!**

٭

---

١) عەلی حیجازی لەساڵی ١٩٥٠ دا بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس بوو، ویستی کوودەتایەک بکا، گوایە مەبەستی دەرکردنی ساڵح جەبر بوو لە وەزارەتی ناوخۆ، بەڵام بۆی نەچووە سەر، گرتیان و خستیانە بەندیخانە. کەچی پاش نۆ مانگێک لە وەزارەتی نووری سەعیددا بە فەرمانێکی شاهانە بەرەڵلایان کرد. م. م. ک.
٢) فۆلکلۆر: «بازی.. بازی.. بە ریشی قازی».
٣) ساڵح جەبر: یەکێک بوو لە سەرەک وەزیرە هەرە کۆنەپەرستەکانی چەرخی پاشایەتی. ناوی بە پەیمانی پۆرتسماوسەوە بەندە. م.م.ک.

## دانە دانە

دانە دانە نووری! دانە دانە
مام سام چاوەڕێی پەیمانە

مام سام ئەڵێ بە جۆن پۆڵ
بە جەمال‌و نووریی زۆڵ[١]
هەردوکمان ئەکەنە کۆڵ
ئەمانبەن بۆ چیاوچۆڵ
بۆ شەڕ لێ ئەدەین دەهۆڵ

جەمال لای کالیسیکە[٢]
وەک گا ئەگلێنێ تیکە
ئەوەن کەرە بە فیکە
چین ئەخاتە زریکە
فیکەکەی بای ئالیکە
ئەم وڵاتە بەپیتە
هۆی شوومی و نەگبەتیتە
هەی کرمی قوڕەلیتە!
هەی کرمی قوڕەلیتە!

---

١) جەمال:جەمال بابان.نووری: نووری سەعید، دوان بوون لەبەرپرسە گەورەکانی چەرخی پاشایەتیی سەر بە ئیمپریالیزم.م.ک.
٢) کالیسیک: عەرەبانە. وشەکە لە کوردیدا(گالیسکە)یە،لە بنەڕەتدا لە (کۆلیاسک)ی رووسی‌یەوە هاتووە.م. ک.

# کوردستان

کوردستان؛ کوردستان!
نیشتمانی جوان!
هەر بژی بە شادی
سەربەستی و ئازادی
هەر بژی! هەر بژی! هەر بژی!

لووتکەی بەرزی گەردنکەشت
نزاری سپی، بەرخۆری ڕەشت
دۆڵی کپ و چەمی خوڕت
دارستانی زەبەند و چڕت
بەهەشتی سەرزەمینن،
هێلانەی خۆشیی ژینن،
جێگەی نۆشن،
ئاگر تیژکەری ئیلهام و هۆشن.

کوردستان کوردستان!
نیشتمانی جوان!
هەر بژی بە شادی
سەربەستیو ئازادی
هەر بژی! هەر بژی! هەر بژی!

# بەری بەیانە

بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ: ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ!
دەنگی بانگ هەڵسا لە مزگەوتی دێ، باڵدار هێلانەی خەو بە جێدێڵێ،
قاسپە قاسپی کەو ئاشکرا ئەڵێ: کاتی فرمان هات، کورد نابێ بنوێ.
بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ: ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ!
هەڵسە ئەی لاوی نیشتمانیی کورد! سەردەمی هەڵسان هەرکەسێ نوست، مرد!
پێویستی پیرۆز؛ بەڵام سەخت و ورد چاوەڕوانتە، هەڵسە دەستوبرد!
بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ: ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ!

بۆ بەختیاری و سەربەخوییی گەل، لەگەڵ هاوڕێتا پەل بدەرە پەل!
کەی دەرچوو تیشکی هەتاو لە دەم کەل، وریا بی، زۆر چاك بەکاربێنی هەل
بەری بەیانە، ڕووناکە ئاسۆ، ئاسۆی هیوای کورد، مژدە بێ لە تۆ!

## دەمی ڕاپەڕینە

دەمی راپەڕینە، دەمی راپەڕین!
هەتاکەی بە سستی و بە پەستی بژین؟
پەلامار دە، ئەی کورد، عەرەقڕشتنێ!
لە دڵ کرمی ناکۆکی دەرکردنێ!
بە یەکبوونە گشت:
پتەوبوونی پشت!
بە یەکبوون ئەبێ:
گەلت پێش کەوێ!

دەمی ڕاپەڕینە، دەمی ڕاپەڕین!
هەتاکەی بە سستیو بە پەستی بژین؟
بە لادا بکە چاکی مەردایەتی،
درێغی مەکە گیان لە کوردایەتی،
بگرمێنە وەك شێر، بچۆ ناوی بەرد[1]،
بڵێ: کوا هەقی ژینی ئینسانی مەرد؟
درشت تاکو ورد،
نەکەین دەستوبرد،
بە هەق چۆن ئەگەین؟
پشوو چۆن ئەدەین؟
دەمی ڕاپەڕینە، دەمی ڕاپەڕین!
هەتاکەی بە سستیو بە پەستی بژین؟

١٩٤٣

---

١) بچۆ ناوی بەرد: ئەوەی لەناو خەڵکا باوە وبچۆرە نەبەردە. م. م. ك.

# نەورۆز ئەکەم

نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!
نەورۆزێکی بەسۆز ئەکەم،
جەژنی گەلی پیرۆز ئەکەم؛
وەك کوردێکی دڵسۆز ئەکەم:
ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم!
نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!

نەورۆزی من بەهارییە،
زەردەخەنەی ڕووی سروشتە؛
لە دەشتی ڕەنگین دیارییە:
هەر هیی من نا، جەژنی گشتە:
ڕۆژی ژیانەوەی گەلە،
هیی گژ و گیایە، هی مەلە!

نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!
نەورۆزێکی بەسۆز ئەکەم،
جەژنی گەلی پیرۆز ئەکەم؛
وەك کوردێکی دڵسۆز ئەکەم:
ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم!
نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!
بەفری چیا کشایەوە،
سەرمای زۆردار سوپای شکا؛
هێزی ژیان بە دوایەوە
ئەڕوا و گەڵا و گیا سەوز ئەکا؛
دەست لە پشتی گیاندار ئەسوێ
ئەیخاتەوە سکوزای نوێ!

نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!

نەورۆزێکی بەسۆز ئەکەم،
جەژنی گەلی پیرۆز ئەکەم؛
وەك کوردێکی دڵسۆز ئەکەم:
ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم!
نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!

بولبول ئەڵێ: ئاواتی گوڵ
لەم جەژنەوە بۆم دێتە دی.
هەنگی لە ناو کونا خجڵ،
لەم ڕۆژەوە ڕێی ئازادی
ئەگرێتەوە بەر بۆ مژین:
لە دەمی گوڵ شیلەی هەنگوین!

نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!
نەورۆزێکی بەسۆز ئەکەم،
جەژنی گەلی پیرۆز ئەکەم؛
وەك کوردێکی دڵسۆز ئەکەم:
ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم!
نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!

کۆنەپەرست لێم ناگرێ:
ڕێی وریایی نیشتمانی،
کێ ئەتوانێ: بگرێ لە زێ
ڕێی هەڵسان، کاتی هەڵسانی؟
یا تەنانەت بەری گەشە
بگرێ لە چڵی وەنەوشە؟

نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!
نەورۆزێکی بە سۆز ئەکەم،
جەژنی گەلی پیرۆز ئەکەم؛

وەک کوردێکی دڵسۆز ئەکەم:
ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم!
نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!

کۆنەپەرستی چاوقووچاو!
لە جەژنی گەل بۆ ئەترسی؟
لەگەل دزی کۆشک و دراو!
بۆ ناتەوێ جەژنی برسی؟
بۆ ناتەوێ گیانی چڵکن!
جەژنی پاکی نەورۆزی من؟

نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!
نەورۆزێکی بەسۆز ئەکەم،
جەژنی گەلی پیرۆز ئەکەم؛
وەک کوردێکی دڵسۆز ئەکەم:
ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم!
نەورۆز ئەکەم! نەورۆز ئەکەم!

# ئەی لاوی کورد

ئەی لاوی کوردا کوڕی ئازا: دانەوێنێ بۆ قەزا،
بۆ زوڵم و زۆر، ملی ڕەزا! نە بە نیاز، نە بە نزا:
نیشتمانت ڕزگار ئەبێ، کۆمەڵت بەختیار ئەبێ!
هێز پێویستە بۆ حەقسەندن: هێزی پێکهاتووی یەکگرتن،
هێزی باوەڕ، هێزی وتن، هێزی کردن. ورەی دوشمن
هەر هێز بنچینەی دەردێنێ قەڵای سەختی ئەلەرزێنێ!
ڕێگای ئامانج با سامدار بێ، با پڕ لە ترس و ئازار بێ،
دڵسۆز ڕابەر، هێز ڕێبوار بێ، کۆمەڵ یەک گیان، یەک بڕیار بێ:
کاروانی چۆن پێش ناکەوێ؟ دوشمن لە بەریا نارەوێ؟
ئەی لاوی کورد، ئەی ڕۆڵەی ژیر، ئەی نیشتمان دیلی زنجیر،
ئەی کۆمەڵ یەک چینی فەقیر، نابێ هەرگیز دەرکەی لە بیر:
ئەو ئیستیعمارە خوێنمژە کە کوردکوژە، هەژارکوژە!
ئەو ئەژدیها ژارپڕژێنە، پاروو لە ناودەم فڕێنە،
ڕەنجدەر لە برسا مرێنە وەک پڵنگ شڕکە، بدڕێنە!
با کوردستان سەرفراز بێ، بەهەشتی نیعمەت و ناز بێ!
ئەی لاوی کوردا پڵنگی لان! کوڕانە باز دەرە مەیدان؛
حەق بسێنە بە ڕەنجی شان بۆ گشت هەژار، بۆ گشت ئینسان!
لە کێ؟ یەکەم لە ئیستیعمار، ئەمجا داگیرکەر و زۆردار!

## گۆرانیی قوتابییان

بەسەر دنیای فراوانا
دەنگدانەوەی گۆرانیمان
بە لاوانی گشت ڕووی زەوی
ئەگەیەنێت برایمان،

ئیتر هەرگیز ڕووی ڕۆژی ڕوون
داناپۆشێ هەوری چڵکن،
ترسی تاڵ و تاریکی شەڕ
ڕووناکیمان لێ ناکا ون!

ئەی قوتابیی وڵاتان گشت،
بە یەکتری ببەستن پشت!
بە یەکیەتیی ورد و درشت
حەقی ئاشتی ئەخەینە مشت!
بۆمبای ئەتۆم نایترسێنێ
هێزی لاوان خۆی بنوێنێ،
ڕاوەستاوین وەک پاڵەوان
ئەجەنگین تا شەڕ نامێنێ،
تا مەشخەڵی ئازادیی گشت
گڕ لە گشت لا هەڵئەسێنێ!

ئەی قوتابی بۆ یەکگرتن
لە خەباتا بۆ پێشکەوتن،
بۆ پێشەوە بەرەو ئاشتی،
بەرەو بەختیاری چەشتن!

سلێمانی. تەشرینی دووەمی ١٩٥٣

# جەژنە پیرۆزەی ئاشتیخوازان[1]

ئاشتیخواز! ئاشتیخواز! ئاشتیخوازی کورد! / بە ئاشتی سەرئەگرێ گشت نیازی کورد!
ئەی برا، جەژنەکەت پڕ نان و گوڵ بێ! / نان بۆ تێریی سک، گوڵ نەشەی دڵ بێ!
ئەی برا و خوشکەکان! ئەی ورد و درشت! / ئاشتییە ئازاد و بەختیار کا گشت!

---

١) ئاشتیخوازانی سلێمانی، لە جەژنی قوربانی ساڵی ١٩٥٤ دا چەند عەرەبانەیەکیان ڕازاندەوە و منداڵی جوانکیلەی جلوبەرگی جوان و خاوێن لەبەریان سوار کردن و بە ناو شەقام و کۆڵانەکانی شاراگێرانیان. منداڵەکان ئەم سروودەیان ئەوت کە مامۆستا گۆران بۆی دانابوون، تا لەسەر ئاوازی «هەی بە لار و بە لار...» بیڵێن. مامۆستا گۆران خۆی لە بارەگای ڕۆژنامەی ژیندا سروودەکەی بە منداڵەکان لەبەر ئەکرد و بە ئاوازەوە لەگەڵی ئەوتنەوە. م. م. ک.

## چواردەی تەمووز

تــۆ ئــاسۆی ئاواتــی گەلی!      تــۆ خــۆشترین کــاتی گــەلی!
نـــۆبەرەی خـــەباتی گـــەلی!      سەرەتا و هـۆی هـاتی گـەلی!
چواردەی تەمووز! چواردەی تەمووز!

تۆ هەڵهاتی، شەو دوایـی هـات      ڕۆژی گـــەلی عـیراق هــەڵهات
ڕووناکی کـەوتە ڕووی وڵات      بـژی شـۆڕش! بـژی خـەبات!
چواردەی تەمووز! چواردەی تەمووز!

دەزگـــای دەرەبــەگی شکـا      ئـیمپریالیست ئـابڕووی تکـا
بـــێت و شـــەڕفرۆشی بکـــا،      ســـەر ئــەماڵێ بــە کـــوچکا!
چواردەی تەمووز! چواردەی تەمووز!

وڵات یـــە کـــەر پـــێکەنینە،      بـــەم شـــۆڕش و ڕاپـــەڕینە
کـــۆترە سپی و ئـاسمان شـینە      ئــاشتی هـۆی شـیرینی ژیـنە
چواردەی تەمووز! چواردەی تەمووز!

١٩٥٩

## مارشی ئاشتیخواز

ئاشتیخوازین، پشتیوانمان گەلانە،
کۆتری سپیی ئاڵامان ناونیشانە:
ڕێگامان ڕێی برایەتیی ئینسانە،
ناکۆکی و شەڕ نەهێشتن ئامانجمانە!

باوەڕمان وایە:
ناکۆکی شەڕی لە دوایە،
شەڕ هۆی وێرانیی دنیایە
هەر دۆستیی گەلان،
ئەپارێزێ ئاشتیی جیهان،
فەڕ ئەخاتە ژینی ئینسان!

خوێنڕشتنی یەکتری لاوان بەسە!
بەکەلاوەکردنی شاران بەسە!
بێشکەی مناڵ ئاگر تێبەردان بەسە!
ئەتۆم کڕین بە دراوی نان بەسە!
ئەی شەڕفرۆشان!
قاسەپڕ و کەللەبۆشان!
بەس بێ، بەس: بۆ شەڕ تێکۆشان!
شەڕ هەڵبگیرسێ،
ئەوەی لە مەرگ زۆر ئەترسێ
ــ خاوەن ملیار ــ ناخەلەسێ!

پاسی ئاشتی ئامانجی خەباتمانە.
ئاشتی ڕێگای ڕزگاریی وڵاتمانە.
کاتی ئاشتی، کاتی خۆشی و هاتمانە.
هۆی تێر بوون و پۆشتەبوونی لاتمانە!

ڕێی کامەرانی،
ڕێی پێشکەوتنی ئاوەدانی،
ئاشتیی گشتیە و جیهانی.
سا ئەی ئاشتیخواز!
بە دڵسۆزی و بەرزیی نیاز،
گوێی زەوی کەڕ کە بە ئاواز!

ئاشتیخوازین، پشتیوانمان گەلانە،
کۆتری سپیی ئاڵامان ناونیشانە:
ڕێگامان ڕێی برایەتیی ئینسانە،
ناکۆکی و شەڕنەهێشتن ئامانجمانە!
باوەڕمان وایە:
ناکۆکی شەڕی لە دوایە،
شەڕ هۆی وێرانیی دنیایە
هەر دۆستیی گەلان،
ئەپارێزی ئاشتیی جیهان،
فەڕ ئەخاتە ژینی ئینسان!

١٩٥٩

# یادی لەنین

بە سەرکردەیی بەرزی هاوڕێ لەنین،
کشا لەشکری شۆڕشی سووری چین[1]،

بە زانست و بیر و بە خوێن و عەرەق،
شەوی ئادەمیزادی خستە شەبەق.
برادەر لەنین،
بە عەزم ئاسنین،
کە پێی نایە ژین،
سەری بەرزە چین.

بژی یادی پیرۆز و بەرزی لەنین!
بژی داس و چەککوش! بژی حیزبی چین!
بژی شۆڕشی یەکخەری گشت گەلان[2]،

---

١) چین: تەبەقە. م. م. ک.
٢) ئەم سروودە تەواو نیە، پاشماوەکەی فەوتاوە. م. م. ک.

# جەژنی ئایار

یـــادی پـــیرۆزە یـــەکـــەمی ئـــایار جـــەژنی جـــیهانە بـــۆ گشت کـــرێکار
کـــــرێکار بـــەندی ســـەرمایەدار بـــوو ڕووت بوو، برسی بوو، کز بوو، هەژار بوو
ئـــــەیچەوسانەوە خـــــاوەنسەرمایە بـــە مـــەمرە و مـــەژی کـــرێی ئـەدایـە
لە دنـــــیای تـــــازە شـــاری شـــیکاغۆ هـــۆشی کـــرێکار هـــاتەوە بـــەر خـــۆ
هـــێرشیان بـــردە ســـەر شـــەقامەکـــان بـــۆ حـەقیان چـەشنی شـێر ئـەبانترکان[1]

---

1) وادیارە ئەم سروودەش ناتەواوە. م. ک.

# ساوای ئاشتیخواز

منداڵێکم کۆرپەی ناز
وەک باوکی خۆم ئاشتیخواز
کۆتری سپیی تەقڵەباز
لە چەقەڵ ئەکەم دەرباز
منداڵێکم، منداڵێکم، ئاشتیخواز

نامەوێ گرمەی بۆمبا
بەکوتەک لە کەللەم با
نامەوێ چەپۆکی شەڕ
ماڵی باوکم با بە با
منداڵێکم، منداڵێکم، ئاشتیخواز

باوکم نابێ بێکار بێ
ڕووت و قووت و هەژار بێ
دایکم فرمێسکی خەمی
وەک دڵۆپی بەهار بێ
منداڵێکم، منداڵێکم، ئاشتیخواز

نامەوێ هەتیو کەوم
کەلاوە بێ جێی خەوم
لەبەر ئەوە، مایەی شەڕ
کێ بێ، دوژمنی ئەوم
منداڵێکم، منداڵێکم، ئاشتیخواز

ئەمجا مەرجە تا ماوم
بە زمانی پاراوم
گۆرانیی ئاشتی بڵێم
ئاشتیی ڕووناکیی چاوم
منداڵێکم، منداڵێکم، ئاشتیخواز

# جگەرتانین

**بە زمانی منالّی ساواوە**

جگـــــەرتانین، ســـاواتـــانین، گـــوڵی بـاخچەی هـیواتـانین،
بزەی ناو بێشکەین بـۆ دایکـان، ڕووناکیی چاوین بـۆ بـاوکان،
هـــێزی دوارِۆژی ئـــینسانین بەکەڵک ئەبین هەروەک جوانین
مـــاوە مـەدەن شـەیتانی شـەڕ، دەزگـــای کـینەی بـخاتە گـەڕ،
بە چـەخماخەی تـیشکی ئـەتۆم ئـێسقانمانتان بـۆ بکـا بـە مـۆم!
مـــاوە مـــەدەن بـێشکەی مـناڵ گڕ تێی بەربێ وەک کۆی زوخاڵ
ماوە مەدەن ڕووی ئەرز هەموو بــــێتە هـــێلانەی بـــێ بێچوو!

## ساگۆرانیی کەو

قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!
شاخی بەرز و بەردی رەق،
جێگای چێڵە و جێگای بەق
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

بەفری تازە و بەفری پار،
نابڕێ لە لووتکە و نزار:
نە پاییز و نە بەهار،
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

بەربەڕۆچکەی ئەشکەوتم،
زستان جێگلەی سرەوتم،
مەڵبەندی چینە و ڕەوتم،
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

ڕائەپەڕم بەربەیان،
هەڵئەکشێم بۆ لووتکەی جوان،
ئەخوێنم ڕوو لە ئاسمان:
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

مەهی هەزار بە هەزار،
بە یەک گڤەی بەرەوخوار
ئەبڕم لە ترسی زۆردار
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

«فجووق...» لە داڵی چاوزەق،
«قغ...» لە ڕاوکەری دڵڕەق،
لە تفەنگ و تەقە تەق

قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

گشت تێوارە و گشت شەبەق،
شاخ پڕ ئەکەین چێڵ و بەق،
لە جیرکە، جیڕ، قەق، قەق، قەق،
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

## بەرخەکەم

ئەی بەرخۆلەکە!
نەرمونۆڵەکە!
سپی و خرپنی،
وەك کولووی لۆکە!

دەستەمۆ و چەشی،
فێرە باوەشی،
دەنگی باڕە خۆش،
جوان و چاوڕەشی!

بۆ هەرکوێیەك چووم،
تۆیش وموە لە دووم،
ئەتلەوەڕێنم،
هەر وەکوو بێچووم.
وەرە خلەخل!
بچۆ نەرموشل!
بباڕێنە: باع...
بەرخی چاو بەکل!

# گۆرانیی دەنکە گەنم

ناوی خوای لێ ئەهێنم
دەرکی عەمار ئەشکێنم
بە بار گەنم دەردێنم
لە ناو وەردا ئەیچێنم
وەک ئاڵتوون زەردە
پاک و بێگەردە
دەنکە گەنم...

پۆلە چۆلەکەی سەر چڵ!
مشکی ناو کون! کرمی گڵ!
وردە مەلی سرک و سڵ!
تۆوم وەشاند پڕ بە دڵ!
ئەیگرێ خوا
هەرکەسێ بیخوا:
دەنکە گەنم...

ئێستا وشکە، بێگیانە
ئەم دەنکە گەنمە جوانە
دوو ڕۆژی تر بڕوانە
تەلیسمێکی ژیانە
خوا ئەفەرموێ
ئەویش ئەڕوێ
دەنکە گەنم...
ئەبێ بە قەرسیلی شین
بەرز ئەبێتەوە چین چین
دیمەنێکی چەند شیرین
ئەبەخشێ بە سەرزەمین

خوا دای گیانی
خوا نەخشانی
دەنکە گەنمم...

گا و گوێرە کەی سەرەڕۆ
ئاژاڵی زیانەخرۆ
بەرازی شەخەڵی کۆ
دوژمن نەیخوا گەنم و جۆ
نەفرینی خوا
لەوەی بیخوا
دەنکە گەنمم...

بەهارێ قەف دەرئە کا
گوڵ تا بەر سنگ سەرئە کا
قەلاس نووک نەشتەر ئە کا
دڕک پاسی بەر ئە کا
بە شنەی با
شەپۆل ئەدا
دەنکە گەنمم...

ئەی خوای گەردوونە بەرزە!
دەغڵە کەم بپارێزە
لە سن وکوللە و تەرزە
ئەی خوای گەردوونە بەرزە!
هی تۆیە و من
نە ک هی دوژمن
دەنکە گەنمم...
دەغڵم وە ک ئاڵتون زەردە
وەرزێرا داس لە هەسان دە!

خۆت ئاسایی ئەکان دە
مەڵۆم بۆ لە خەرمان دە
خەرمانی سوور
وەك كۆگای نوور
دەنكەگەنمم...

هەر دەنكە بوو بە هەزار
سوپاس بۆ تۆ كردگار!
بەشی تۆو بەشی عەمار
بەشی دەسكورت و هەژار
هاتە بەرهەم
سوپاس ئەكەم
دەنكەگەنمم...

# پشیله‌که‌م

میاو میاو! میاو میاو! ورد ورد ڕاکه، پشه خرپنه‌ی ده‌م و لووت پاکه!
کلووه ئاوریشمی گیاندارم، چاو پیرۆزه، کلک کوڵه‌مارم!
ڕاکه، ڕاکه، وه‌ره باوه‌شم، لا مل هه‌ڵسوو تێر له له‌شم!
کلکی تیسکن لوول که و ڕه‌پ که، نه‌رمه‌ی ده‌ستم گاڵته‌قه‌پ که.
نینۆکی تیژ ده‌رپه‌ڕێنه، قه‌ی ناکا! بڕنه، بدڕێنه:
ده‌ست و ده‌م‌وچاو و جلم پشه، هه‌ردوو ده‌ست بکه‌ره ملم!
مووی سمێڵی شاش، لووتی سوور بگره بۆ ماچماچێنی دوور!
که مانوو بووی له ده‌ستبازی، پشه، ڕاهاتووی کۆشی نازی.
خۆت په‌پکه ده له‌سه‌ر ڕانم، به پرخه پرخ، پشه‌که‌ی جوانم،
لێک نێ چاوی مه‌یله‌و شینت، ورده جووڵه‌ی خه‌وبینینت،
ئه‌گه‌رچی رامه‌چڵه‌کێنێ، به‌ڵام نه‌خته نه‌خته دێنێ
پرخه پرخی یه‌کتاهه‌نگت، شێوه‌ی کشومات و مه‌نگت،
بۆ چاوی منیش وه‌نه‌وزێک، چاو لێک ئه‌نێم منیش تۆزێک.

# کەروێشک

کــــەروێشک لەنــــاو لانــا   گــــوێی لەســـەر پشت دانــا
چــاوی نــووقاند پــرخــەپرخ   نوست تا ڕاوکــەر وتــی: پــخ!
ئەمجا هــەردوو گــوێی لەقــان   شــــانی پــــیا کــرد بــە بــازدان
کەروێشک، نــزیکە دوژمــن!   کەروێشک، ڕا کە قونەقون!

# بەفر[1]

ئای بابە گیان! بەفر ئەبارێ، تەماشا:      جێگا نەما پێیەک دانێی لە حەوشا
کلوو کلوو دێتە خوارێ: سپی و جوان      دەنکە دەنکەش با ئەیهێنێ بۆ هەیوان
ئەڵێی وردە پەڕی سپیی دەعبایە      یا لێشاوی پەپوولەی ناو هەوایە
ئەها بابە! ئەو ڕیشۆڵە هەژارە      کز کز نیشتۆتەوە لەو بن پاسارە
ئێستا مشتێ گەنم دێنم ڕۆی ئەکەم      با بێ بیخوا و نەجاتی بێ لە ماتەم

---

١) ئەم پارچە شیعرە لەلایەن کاک ئەحمەد ساڵح عەلییەوە هاتووە بۆ ئەو لێژنەیەی لە ١٩٧٨ دا بۆ کۆکردنەوەی شیعری مامۆستا گۆران پێکهات. ئەمە تاقە پارچە شیعرێکی ئەم دیوانەی مامۆستا گۆرانە کە لای من نەبوو. م. م. ک.

# گۆڕان[1]

گۆڕاوم؟ بەڵێ! ئەبێ پێی لێ نێم
که من گۆڕاوم!
عەشقت وەک جاران تەئسیر ناکا تێم،
ئەی نووری چاوم!

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر یاری؛
چەرخی بێ پشوو
بە بای نەداوە: یادی دڵداریی
ئەو ڕۆژانەی زوو!

بەڵام ئارەزوو و ئاواتی جاران
تەوژم و مەستی نادا بە ژیان؟
چەشنی شیرین خەو
نوستووی بە جێ هێشت بۆ تاریکیی شەو!
ئەگەرچی ئێستاش
چۆن ڕۆیشت، ون بوو؟ هیچ نازانم باش!

بۆچ ئێم ئەڕوانی خۆشەویستەکەم
بە چاوی تانە؟
نازانی دڵیش بە بێ زیاد و کەم،
وەک ئەو شتانە
کە کەوتوونە ژێر شینایی ئاسمان،
ملکەچ وەستاوە بەرامبەر گۆڕان؟

باڵداران، گوڵان، گەڵای درەختان،
ئەو ئەستێرانە
کە ئەجریوێنن، بەرز و گەش و جوان،
ئەم گشت هەردانە،
دەریا گەورەکان، هەموو شت، کەم، زۆر
ئەگۆڕێن لەگەڵ چەرخی دائیمگۆڕ ...

گیانە، ئاوێنەش پێشانمان نادا،
ئیمڕۆ بەیانی
ڕووی خۆمان لە یەک شێوە و وێنەدا؛
ئەبێ بزانی
هەرچیمان هەیە: ئارەزوو، ئاوات،
تاسە، خەوبینین،
هیوا، ترس، هەموو، هەمووی پێی ئەگات
دەستووری گۆڕین
پێم بڵێ: ئاخر، چلۆن ئەتوانین
وڕک بگرین لە دڵ
کە قنیات بکات بە یادی دێرین؟
نابینی پێش گوڵ
چەن خۆشەویستە وەنەوشەی مللار
لای دنیای بەهار؟

ژینیش، داخەکەم، لەم خۆشویستنە
هەڵناگرێ زیاتر:
کە لێو لێک ئەنێ پاش زەردەخەنە،
بێدەنگ، سارد و سڕ!
ئاخ! منیش عەشقم ڕوو لە گۆڕانە،
لەگەڵ زەمانە،
منیش وەنەوشەم ئەژاکێ، ئەمرێ
تاگوڵ بەر ئەگرێ!

---

١) لە هاوینی ساڵی ١٩٣٣ دا لەسەر ویستی حامید فەرەج، بۆئەوەی لە «دیاریی لاوان»ی ١٩٣٤ دا بڵاوبکرێتەوە، لە ئینگلیزییەوە کردم بە کوردی بەهۆی بەراوردی نەسسی ئینگلیزی و عەرەبییەکەوە لە مەجەللەیەکی میسریدا. لە پاشانا هەڵبەستەکەی خۆمم لەگەڵ تەرجومە عەرەبییەکەیا نارد بۆ «بێکەس»ی ڕەحمەتی، کە ئەوحەلە لە بازیان مامۆستای قوتابخانە بوو، ئەویش هەڵبەستێکی لەسەر دانا.
«گۆران»

# گەڕانەوە لە زیندان

ـ لە عەرەبییەوە ـ[1]

دەرچووم، دەرچووم، بەندم پسان  لەگەڵ هاوڕێ و برادەران
هاتینەوە دەر لە زیندان  دڵ پڕ لە کینەی زۆرداران
وەك دەمی بورکان خرۆشاین  لە تاریکیدا درەوشاین
گرتمانە دەس «مەشخەڵ» بۆ ڕێ  لەو نەرکەی تۆپانەی کە دێ
لە بەند، لە زنجیر، ناترسین،  «لە گیانبووردووە»ی ڕێگای ئاشتیین!
بە دوشمنی ئاشتیی گەلان  چەشین وەکوو پڵنگی لان!
ئەیخنکێنین، خوێنی ئەمژین  دائەڕێژین بناغەی ژین!
ئەقیرێنین: بژی خەبات!  ڕۆیشت دیلی، ئازادی هات!
ئەی گەلانی ئازا و بەزات،  هەنگاو بنێن بەرەو ئاوات!

---

١) مامۆستا گۆران ئەم پارچە شیعرەی پاش دەرچوونی لە زیندانی بەکەمجاری، لە ژمارە، ١١٢٤ی ١٩٥٢/١١/٢٠ ڕۆژنامەی «ژین» دا بڵاو کردۆتەوە. هەرچەند لەسەری نووسیوە «لە عەرەبییەوە»، من لام وایە هی خۆیەتی و لەبەر ناچاری بەهۆی تازە لە زیندان دەرچوون و پێویستیی زوو خۆ دەرنەخستەوە بە وەرگێڕاوی داناوە. م.م.ك.

## دوێنێ...

**لە عەرەبیی جەبران خەلیل جەبرانەوە**

دڵێک تا دوێنێ هەمبوو، کوا؟ نەما
دنیای بێزاری لە دەست ڕزگار بوو،
عومرێک بوو لە ژین ڕەنجی چوو بە با
بەو ئاخ و ناڵەی کە بۆ نازدار بوو!

دڵداری چییە؟ ئەستێرەی ئاسمان!
لەگەڵ شەبەقی ڕۆژا ون ئەبێ،
نەشئەی: وەهمێکە گیرۆدەی نەمان
جوانییەکەی چەشنی سێبەر لائەچێ،
پەیمانەکانی: درۆی خەوی جوان
گشت هیچن کاتێک هۆش بێدار ئەبێ

چەند لەگەڵ تاسە شەوم بردە سەر؟
چاودێریی تاسەم ئەکرد تا نەنووم!
ناو جێگەم داخ بوو بە یادی دولبەر
ئەیوت: «هۆ نەنووی عاشقی مەحرووم!»
ئازار بە چەپەی زوو زوو لەگوێ دەر
ئەیوت: «بۆ عاشق هەر وەهایە خووم»

چوو ئەو ڕۆژانە، بە سەر چوو، مژدە!
ئەی چاو ئەوا دێ وەنەوزی شیرین
ئەی گیان وریایی لە دەست بەرمەدە
لە بیرت نەچێ تاڵاوی دێرین!

هەرچەن ئەکەوتە شنە بای بەیان:

خۆشی خۆشیم بوو، سەمام ئەکرد من
هەرچەن دایئەدا لە هەورێک باران
وەک شەراب ئاویم لە جام ئەکرد من!
مانگ لە ئاسۆوە بیکێشایە سەر:
یارم لادا بوو، هەرام ئەکرد من!

ئەمەگشت دوێنێ، دوێنێی تیژگوزەر
تەمێ بوو ڕۆیشت، لاچوو لەسەر چاو!
تەسکینی «مێژوو» بێ‌سەر و شوێنکەر
هەروەک فوو خۆی دا لە بڵقی سەر ئاو!

سا ئەی براکان! هەرکە «سوعاد» هات
پرسیی: «کوا کوڕێک دڵبریندار بوو؟»
بڵێن: «ڕۆژانی دووریەکەی باڵات
دایمراندەوە گڕێک لێی دیار بوو؛
پشکۆکەوتوەتە ژێر خۆڵەمیش، مات
سارێژە زامێک کە هۆی هاوار بوو»

ئەگەر تووڕە بوو، توخوا لێی مەگرن،
گریا: دڵسۆز بن، فرمێسکی بسڕن
هات و پێکەنی، باش دڵنیا بن!
کە هەر وەهایە عەشقی پیاو و ژن!

ئەگەڕێتەوە ئاخۆ ئەوەی چوو؟
ئەو خۆشەویستەی کە نازدار بوو زوو؟
دێتەوە هۆش خۆی گیانی خەواڵوو
تا بمترسێنێ بە ڕۆی ڕابووردوو؟
یان بەستەی بەهار ئەگاتە ئەیلوول
کە کونە گوێچکەی بە گەڵا پڕ بوو؟

نەء، ئیتر زیندوو نابێتەوە دڵ،

ئەبێ بە چیلکە کە وشک بوو چڵ!
دەستی درەوکەر ژین نادا بە گوڵ
پاش ئەوەی بڕی لە بنجی ناو گڵ!

گیانی ناو لەشم پیری لێی‌داوە،
بە حەسرەت نیگای بۆ دوا چەرخاوە،
لە سنگما مەیلێک جووڵەی گەر ماوە
لەسەر دار عاستای سەبر وەستاوە،
هیوام تێکشکاو، باڵای کۆماوە
گەرچی خۆم لە چل هێشتا نەداوە!

ئەمەیە حاڵم ئەگەر لێی پرسین:
«ئەی چی بە سەر هات؟» پێی‌بڵێن: «شێت بوو»
هات وتی: «خوایە، ڕزگار بێ، ئامین»
بڵێن: «ڕزگارە بە مەرگێکی زوو!»

سلێمانی. کانوونی یەکەمی ۱۹۵۲

# ئامۆژگاریی ئیمپریالیزم

ئیمپریالیزم ئەخوازێ کوتومت وامان ئامۆژگاری بکا کە شاعیری گەورە مەعرووف ڕەسافی هۆنیویەتەوە. بەڵام ئێمە ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانە لە گوێ بگرین دیارە کە تا بینەقاقا کەمترمان ناچەقێ! ئەگەر بەتەواوی پێچەوانەش بڕۆین بە ڕێوە، ئەوا ئەو خۆی هەتا نووکی گوێچکەی کەرەکانی لە ناو قوڕا نقوم ئەبێ!

هۆ خەڵکینە! ورتە مەکەن　　دەم لە قسە هەرگیز مەدەن
بنوون و هیچ بێدار مەبن　　هەر نوستووانن پێئەگەن
ڕوو وەرگێڕن لەو شتانەی　　کە ئینج چییە، پێشتان ئەخەن!
بە لەعنەت کەن تێگەیشتن　　چەند بە کەڵکە هیچ تێنەگەن
لەناو دەلیای نەزانینا　　با هەر مەلەی خۆتان بکەن
خۆ سیاسەت، لێی بکەون　　پاشان پەشیمانی ئەبەن!
گەر دووی کەون ئەو جادووە　　خۆتان لە ناو تەلیسم ئەخەن!
هات و بۆ قسەی عادەتیش　　دەمتان جووڵا، ئەبن بە پەن!
ڕووگرژ مەبن لە زوڵم و زۆر　　بۆ عەدڵ و داد گوێ هەڵمەخەن
کامتان ئەتانەوێ بژین　　بە خۆشی و حورمەت، شاد و شەن
گوێتان بگرن لەگەڵ چاوتان　　لەوس و لچتان لەواشە کەن
چونکە هەر بە کەڕ و لاڵە　　حورمەت ئەدەن، بایەخ ئەدەن!
هیوای قەڵبی بەختیاری　　لەم ژینەدا ئەچێ بە چەن!
ژین هەر ژینە: تێر بی و برسی　　ڕزق هەر ڕزقە: عەمار بێ و مەن
ملکەچ بن بۆ حوکمی قەدەر　　با هەمووشی هەر گەن بێ و گەن!
ستەمتان دی پێ خۆشحاڵ بن　　بڵێن: هەر ستەمە پەسەن!
تێ‌هەڵدران سوپاسکەر بن،　　زللە، بڵێن «چل تا بزەن!»
وترا پێتان: هەنگوین تاڵە　　بڵێن: تاڵێک، جۆری دەگمەن!
وترا بە ڕۆژ: ئەمە شەوە　　بڵێن: ئەوەگشت ئەستێرەن!
وترا: کوێرەکانی، زێیە　　بڵێن: هەر لافاوە دیمەن
ئەگەر وترا: ئەی خەڵکینە　　پەلپەل ئەکەین دایکی وەتەن!
بۆ شوکرانە سوجدە بەرن　　سەما بکەن، هەتاکوو هەن!

سلێمانی. کانوونی یەکەمی ۱۹۵۲

# ڕاست بنەوە!

لە شیعری «جەمیل سیدقی زەهاوی»یەوە

بۆ ناخەنە سەر زمانی ئاگردار: ... لە کەللەدا چیتان هەیە لە ئەفکار
هەنگاو بنێن بەرەو ئامانج بەبێ ترس، ... هاژەتان بێ، وەک ڕەشەبا، وەک ڕووبار!
ڕاست بنەوە بە قینەوە لە ڕەوشت، ... سەر شۆڕ مەکەن، تا تەنانەت بۆ ئەقدار!
تێکرا گشتتان، خۆتان خێوی خۆتان بن، ... وەک سەردەمتان بۆ سەردەمانە سەردار!
بە قەڵەمباز هەنگاو بنێن بەرەو پێش ... با بگەنە پێشکەوتووان لە ڕێبوار!
بێت و سستی پێشان بدەن لە گوڕا ... هۆی شەرم ئەبن بۆ «یەعروب»و بۆ «نەزار»
ژیان چییە؟ کۆڕی شەڕی سەرومڕ، ... وەی بە حاڵی بێهێز لە دەستی زۆردار!
کێ زاڵ ئەبێ؟ کۆڵنەدەری دڵ پڕ زات ... کێ ئەبەزێ؟ ترسنۆکی بێبڕیار!
با، پیر خۆیان لادەن، کوڕی مەیدان نین ... سا لاوینە، دەی ڕۆژتانە، دەی زینهار!
کۆن فڕێدەن، نوێ بپۆشن، هەتا کەی: ... کەشوفشی درۆی ناو بەرگی پێرار؟
خۆ ڕزگار کەن لە بەندی گشت باوەڕێک ... کە تاریکن، ڕێ ونئەکەن بە ڕێبوار!
بە ئاشکرا، بانگی ڕاستی بۆ خەڵکی ... جاڕ بدەن و بۆیان دەرخەن گشت ئەسرار!
جوانە ڕاستی وەک دیمەنی بەیانی ... وەک ئە ستێرە ڕووتە و ڕوونە و پرشنگدار!

سلێمانی. کانوونی یەکەمی ١٩٥٢

# قەیسی شەهید

قەیس ئالووسی پاڵەوانە بچکۆلەیەکی ئەم نیشتمانە بوو، لە هەرای سەرپردی قەڵەمبازی نیشتمانیی عێراقدا ــ ٢٧ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ــ شەهیدکرا. لەکاتی خۆیدا مامۆستا مەهدی جەواهیری شاعیری بە ناوبانگی عەرەب ئەم شیوەنە بەسۆزەی بۆ هەڵبەستبوو، واکردمان بەکوردی».

ئەی قەیس، ئەی نەشئەی بەهار
ئەی بریقەی ڕەونەقەکەی!

ئەی قەیس، ئەی چپەی نازدار،
نەرمێک لەگوێی دڵدار ئەدەی
ئەی قەیس، ئەی گۆرانیی شوان
هەوای مێرگ سەر شەپۆل ئەخەی،

ئەی قەیس، ئەی دەنگی بولبول،
چڵ ئەخەیتە لەرەی هەی هەی!

ئەی قەیس، ئەی خەوێک، پەری
بۆ ناوجێی بێقەرار ئەبەی!

ئەی قەیس، ئەی شیلەی جوانی،
ئەتکێیتە ناو فنجانی مەی!

ئەی قەیس، ئەی ئاوازەی ژین!
لەرەی هیوای ناو دەنگی نەی!

ئەی قەیس، ئەی پرشنگی گەش!
ئەی بۆنێک هۆی مەستیی کەللەی!

ئەی قەیس، پاش کۆچکردنت
چیت بەجێ هێشت؟ گەر تێ بگەی

ماڵ لەکۆشی ئارام دەرچوو
پڕ بوو لە شیوەن و وەی وەی!

ئەم ڕۆڵەکوژراو ئەناڵێ

ئەویان ئەڵێ: «دەی، بگری دەی!»

ئەم دوانە ئەو دایک و باوکەن
نازاریانی و هەر تۆیان هەی!

هەرچەن ڕۆژ هەڵدێ و ئەنیشێ:
چاوەڕوانن تۆ سەر هەڵدەی

بە خەو باڵات کە ئەبینن
ئەڵێن: «قەیسی نازدار، تۆخەی!»
دوایش گومان دایانئەگرێ
ئیتر جەرگە و کزە و کسپەی

بۆ یەکتری سکاڵایان
هەڵئەڕێژن هەتا سبەی!

* * *

دایکت، ئەی قەیس! ئەژیو ناژی
بە هیوایەک بێبنە و پەی

لە دەرگا بەن ڕائەچەنێ،
ئەڵێ: «تۆی لە دەرگا ئەدەی؟»

هەر ئەگەڕێ و پرسیار ئەکا:
«نەهاتەوە... دێتەوە... کەی؟»

* * *

ئەی قەیس، ئەی ڕۆڵەی شەهید،
بە خوێنی گەش پڕ بەرامەی!

ئەو کفنە ئاڵەت هۆی بەخە
بۆ نیشتمانێک تۆی نەوەی!

خۆڵێک، لە ڕووت نیشتووە، خۆی
هاوار ئەکات: تۆی ئەوکەسەی

کە نیشتمان لەسەر خاکی
ئەچەقێنێ پەیکەرەکەی!

ئەکلیلی تۆ و هاوچەشنی تۆ
لە ڕیشووی دڵ ئەچنن پەلکەی!

ئەی قەیس، بۆ خەباتی گەل
جوانەمەرگترین نیشانەی!

تۆڵەی خوێنت لە ستەمکار
گەل ئەیسێنێ، ئەمڕۆ، سبەی!

سلێمانی. کانوونی دووەمی ١٩٥٣

•

# گۆرانیی لاوانی جیهان

(۱)

یەکمان ئەخا یەک هیوا،
لەمپەڕ هەتا ئەوپەڕی دنیا.
ڕێمان پێ بگرێ دوژمن،
بێگومان سەر ئەدا لە ئاسن!
لاوان گەر دەنگ هەڵبڕن،
گەلان گشت ڕائەپەڕن،
گۆرانیی لاوان،
پڕ ئەکا ژیان،
لە شادی بۆ هەموو

(دەور)

بەستە بۆ شادی ئەڵێن گشت لاوەکان
لاوەکان... لاوەکان...
چۆن لە بەرمانا ئەوەستن دوژمنان؟
دوژمنان؟
لەگەڵ لاوان،
ئەڵێن گشت جیهان،
بە یەک زمان:
چۆن لە بەرمانا ئەوەستن دوژمنان؟
دوژمنان؟ دوژمنان؟

(۲)

لە بیرمانە کۆڕی جەنگ:
چۆن پڕ بوو لە مەیتی شەهیدان
ئەو خوێنەی خاکی کرد ڕەنگ،
بوو بە مۆری برایی گەلان.
دەسا ئەی تێکۆشەران!
بۆ داد و ئاشتیی جیهان،
بگرن ڕێی خەبات؛

بگەنە ئاوات؛
بگەنە ئارەزوو.

(٣)
دەنگی زوڵاڵمان، بە سوێن،
ئامانجێکی پاک ئەدا بەڵێن
سەربەرزی بڕوامانین
بە ڕاستی دڵسۆزی ئینسانین
بەڵام هێزە گومڕاکان،
بوون بە هۆی تاڵیی ژیان!
با بمرێ خوێنمژ!
شەڕفرۆشی پیاوکوژ
سەرکەوێ ئاشتی، زوو!

## هەروەک کەرەم[1]

لە کتێبی «من شعر ناظم حکمت» وەرگیراوە

هەوا قورسە هەروەک گوللە
هاوار ئەکەم
هاوار ئەکەم
هاوار ئەکەم

ڕاکەن، وەرن،
منم ئەدەم
ئیزنی دەستڕێژ
ئیزنی گوللە!
وتی بە من:
تۆ ئەسووتێی
بە ئاگری دەنگەکەی خۆت،
ئەبی بە خۆڵ؛
هەروەک کەرەم
گڕی عەشقی خۆی بەربوو تێی!
کڵۆڵی زۆر
بە لام هاوڕێ تا بڵێی کەم!
گوێی دڵانیش
لەعاستت کەڕ
هەوایش قورسە هەروەک گوللە
منیش ئەڵێم:
با بسووتێم
ببم بە خۆڵ!
هەروەک کەرەم

من نەسووتێم

تۆ نەسووتێی
کەس نەسووتێ
ئەی چۆن دەیجوور
ئەبێ بە نوور!
هەوا وڕاق، وەکوو زەوی
هەوا قورسە وەکوو گولله
منیش هاوار
هاوار ئەکەم
هاوار ئەکەم
هاوار ئەکەم

ڕاکەن؛ وەرن،
منم ئەدەم
ئیزنی دەستڕێژ،
ئیزنی گولله!

---

١) کەرەم و ئەسڵی وەکوو مەجنوون و لەیلای عەرەبی و وەلیی دێوانە و شەمی کوردی وان.

وێنه له شیعری تورکی:

## له باره‌ی شیعره‌كه‌مه‌وه

### له كتێبی «من شعر ناظم حكمت» وه‌رگیراوه

ئه‌سپم نییه، زینی زیو بێ،
یا سامانم كه‌سنه‌دیو بێ!

ماڵم نییه و موڵكم نییه
ئه‌وه‌ی هه‌مه، یه‌ك ته‌شپییه:

پڕ له هه‌نگوین، هه‌نگوینی جوان
ئه‌ڵێی گڕه چۆته ناو «شان»!

هه‌نگوین به‌ر و دوای ماڵمه،
به‌رهه‌می ڕه‌نجی باڵمه!

ئه‌خه‌مه كار هه‌موو هێزم
تا له «مه‌گه‌س» بپارێزم

مڵك‌و ماڵم: هه‌نگوینه‌كه‌م
ئه‌مجا، برا شیرینه‌كه‌م
«هه‌ر پڕ بێ ته‌شتت له هه‌نگوین
هه‌نگ ئه‌تگاتێ له‌وپه‌ڕی چین!»

# نا یەڵن بڵێین

**لە کتێبی «من شعر ناظم حکمت» وەرگیراوە**

دەممان ئەگرن لەگۆرانی، ئەی ڕۆپسن!
ئەی بولبولم، ئەی بولبولی هەڵۆباڵ،
ئەی برای ڕەش، خاوەن دانی مرواری،
لێناگەڕێن گەروو پڕ کەین لە وتن،
ترسیان زۆرە وەک ئەیزانی، ئەی ڕۆپسن!
لە بەربەیان ئەترسن و لە بیستن
لە بینین و لە لێ کەوتن ئەترسن!
ئەترسن، ئای ئەترسن لە خۆشویستن
ئەترسن وەک فەرهاد پەیمان ببەستن،
(ئەشێ ئێوەش فەرهادێکی خۆتان بێ،
براکانی زەنگیم، وا نییە ڕۆپسن؟)
لە دەنک و لە تۆو وگڵ ئەترسن
لە گشت شتێک، لەخوڕەی ئاو، ئەترسن!
چونکە دەستیان نەگوشراوە ئەمانە
لە دەستێکی دۆستا، وەک چۆلەکەی گەرم،
بێنیازی کرێ، تەنزیل، یاخود مۆڵەت،
لە ئاواتمان دائەچڵەکن، ئەی ڕۆپسن!
لە ئامانج و لە هیوامان ئەترسن
لەگۆرانیی سەر زمانمان، ئەی ڕۆپسن،
ئەی بولبولی هەڵۆباڵم، ئەترسن!

# داخی دڵ

## شیوەن بۆ نامیق کەمال

له تورکیی دیوانی هەڵبەستی کۆچکردوو ئەمین
فەیزیبەگ «شعاعات»ەوە کراوە بە کوردی.

ئەی مرووەتپیشه، ئەی ساحیب هیمەم!
خادیمی ئامالی میللەت بووی بە دڵ،
فەیلەسووفی ڕۆژهەڵاتی عەسر بووی،
لەفزی پەخشانت هەموو سیحری حەڵاڵ،
کۆششی تۆ بوو پەسەندی لای خودا
هەوڵی تۆ بوو پاسی ناموسی گەلت
چەن بە فیرۆ چووی لە دەست دۆستی گوزین
بوو بە داغی دڵ گری هیجرانەکەت،
داخەکەم، سەد داخەکەم، حوکمی قەزا
ئەی فەلەک! بۆچ ئەهلی غیرەت پەست ئەکەی؟
بۆیە ئەهلی فەزڵ و هیممەت، خاس و عام،
داخەکەم ئەمما کە دێنە سەر خەبات،
دوژمنی ئەم سەردەمەی ئەم عالەمەم،

قەدری فەزڵی تۆ ئەزانن گشت ئومەم.
ساحیبی بێباکی هیممەت بووی بە دڵ.
ڕاست لە عیلما تۆ فەریدی دەهر بووی.
نەزمی شیعرت ڕشتەیی یاقووتی ئاڵ.
تۆ بە یارانی نەبیت کرد ئیقتیدا...
مەرگی تۆیە باری مەئیووسیی گەلت
خەڵکی پاش تۆ بەشیەتی گریان و شین...
باقیبە بۆ ڕابەری ویجدانەکەت.
مەرجی هەر یەک مەرجە: تەسلیم و ڕەزا!
جەهل و بیدعەت بۆچ هەتا دێ خەست ئەکەی؟
مەتڵەبی زلیان: لە چەرخە ئینتیقام!
هەر یەکەی زوو ئەبنە قۆچێکی وڵات!
تف لە چەرخی و تف لە ئەحکامی ئەکەم!

بەغدا. تەشرینی یەکەمی ١٩٦١

لەو گرانەی سارد نابنەوە:

## فەقێ تەیران[1]

بەس بگری و خەم بخۆ، ئەی فەقێ تەیران!
هەزاران ڕۆژێ دێ هەڵسنە سەر پێ،
لە گەڵ خاک یەکسان کەن کۆشکی زۆرداران،
خوێنمژین نەمێنێ و ئاغا تۆوبڕ بێ...
تا دنیا بمێنێ تیایا شا و خوونکار
لە سنگما ئاگری تۆڵە کز نابێ،
سەری من نانەوێ بۆ ئاغا و زۆردار
جاڕدەری ئازادی لا نادا لە ڕێ!

تا ڕۆژێ مژدەی دێ بەهارێکی خۆش
ئەبێ چەخماخە بات برووسکەی وتەم،
نابڕێ لە زارم، نیشتمان، خرۆش،
تا ئاغای مفتەخۆر لە قیرە نەخەم!

ناترسم لە زنجیر، لە کۆت، لە لێدان،
لە زیندانی تاریک، قەفەزی ئاسن...
لە دڵما گڕێکە هەستی نیشتمان،
ناتوانێ کزی کات تەنانەت مردن!

ئەمەوێ پێش ئەوەی بمێنە ناو گڵ
تەموورەی عەشقی پاک بۆ گەلم لێدەم،
پاش خۆیشم بێتە دی خۆشە خۆزگەی دڵ:
ئازادی ببێتە بەستەی هەموو دەم!.

---

١) مامۆستا گۆران ئەم پارچە شیعرە وەرگێڕاوە و پارچەی پاشەوەی لە ژمارە ٥٤ی ساڵی دووەمی ڕۆژنامەی «ئازادی»دا بڵاو کردەوە. پارچەی پاشتریش لە ژمارەی پاشتری هەمان ڕۆژنامەدا. ئەم سەرەتایەشی بۆ پارچەی یەکەم و دووەمەم نووسیبوو: «لێرەدا دوو پارچە هەڵبەستی شۆرشیی نایاب بڵاوئەکەینەوە کە لە کەشکۆڵی وێژەی کوردی «کورد ئەدەبیاتی ئالماناخی» وەرمانگرتووە. کتێبی باسکراو لە لایەن تێکۆشەری ڕۆشنبیر دوکتۆر ڕەحیم قازییەوە کۆکراوەتەوە. ئەم هەڵبەستانە وەرگێڕیان بە زمانی ئازەری (تورکمانی) ش، عەسکەرۆفە. لە ژمارەی جارێکی‌ترا بەکوردیکراوی هەڵبەستێکی تری فەقێ تەیران و وتارێکی وێژەیی پێشکەش ئەکرێ بەم ناونیشانە «تەرمۆکی و تەیران». م.م.ک.

# دڵەکەم...

ئەوەندەی دەریایەک پڕە دڵەکەم،
هەوارگەم دووروڵات، دەشتە و بیابان
من خۆیشم نازانم چیم و چیکەرم،
لە دەستی ستەمکار، لە دەستی حاکم
برووسکە نەیداوە لە کۆتەرەی لەش،
ئاخۆ کەی سەردەمی ئازادی ئەگات!
ئاخ، خۆزگە ئەم زامەم ئەدی ساڕێژ بێ،
لە ڕێدا کە بوومە هاوڕێی دەروێشێ،
وتم: تا بڵند بێ قوللەی دیوەخان،
نەکەن قەت بە ئاغا و بە شا لاس بخۆن:
ئەم ئێش و ئازارەم تا کەی ئەمێنێ،
سنگیشم توێتوێ بێ و هەڵکشێم لە خوێن،
دڵنیام ئەوکۆشک و سەرا خوێنینە،
پێم وتن: لە مردن من باکم نییە،
لە هەڵدێر فڕێمدەن، پارە پارەم کەن،
با زۆردار بزانێ: هەتا بمێنم،
«فەقێ» بۆ هەژاران تەموورەت لێدە،
دێ بە دێ جاڕ بدە هەر لە ئێستاوە:

ئەڵێی هێلانەیە بۆ خەفەت و خەم!
دڵەکەم بەدبەختە و حاڵم پەرێشان!
بە «لم»ی بیابانا مەرگە ڕابەرم!
پێشێلم، وەک ڕێگا، بوو بە تۆز خاکم!
دەردی گەل کردوویە بە خەڵووزی ڕەش!
ئەم گەلەکەی دەستی ئەگاتە ئاوات؟
پێش ئەوەی بمرم و گۆڕم بێ بە جێ!
ناڵانم، لێی پرسیم: هاوڕێ، کوێت دێشێ؟
لە دڵما ناسرەوێ هەرگیز پێچی ژان!
کینەی خەست ڕەوایە بە دوژمنی کۆن!
لە دەستما وەک سونگی قەڵەم ئەنوێنێ!
بۆ سوڵتان و شاهان نابم سەرنەوێن!
ڕۆژێک دێ نەمێنێ لەم سەرزەمینە.
هەرکەسێ باکی بێ لە خاکم نییە!
بمگرن، گەردنم لە سێدارە دەن،
لە ڕێی ئازادیدا خەبات ئەنوێنم!
لە نووکی قەڵەمت گەوهەر فڕێدە!
مژدە بێ، ئازادی دێتە دنیاوە!

# دەربەدەر

گۆرانیی «قین» ئەڵێم، با ڕقم هەڵسێ!
ئاغایەک بمێنێ مەیدان بەرنادەم.
ئەوکەسەم: دەردی خۆی لە بەرد ئەنووسێ،
مزگەوتێک جێی «میر» بێ من لێی سەر نادەم!

لەگەل و نیشتمان هەرچەند دوور کەوتووم
دەنگەکەم زولاڵە، برا، هەی برا!
با برسی و ڕووتیش بم، چونکە نەمردووم،
لێم ترسی قایمە «زۆرداری سەرا».
دڵنیام ئەم ڕۆژە ڕەشانەی ئەڕۆن،
ڕۆژێک دێ کە ناوی بەختیارییە!
ئەوگەلەی ڕەنج نەدا و نەنوێنێ هونەر،
تەنیا ئەو، ئەنجامی خزمەتکارییە!

بۆ گەلەگشت بیر و سەرانسەر بڕوام،
کە ڕۆژێک ڕووناکی دای لە نیشتمان
ئەزانم دێتە دی لای گەلم هیوام:
هەڵبەستم ئەبێتە بەستەی سەر زمان!

بەهارم تێجگاری ئەڕوێ و ئەکاگوڵ،
با ئەبا بۆی مێرگم لەم هەرد بۆ ئەو هەرد،
کانیاوم گەرم ئەکا بەزمی قوڵە قوڵ
کە وا بێ نەمردووم، بوویشم بەگەرد!

جێتدێڵم ئەی لاوی، ئەی چرای هیوا،
بە هێز بە و ڕێ مەدە بە بێهیوایی،
ژیانت خۆش بوێ و هاتنە دنیا؛
بۆ زۆردار شل مەکە ڕەگی ئازایی!

# پرسیارێکی ناسرخوسرەو

ناسرخوسرەو شاعیرو خاوەنبیرێکی گەورەی ئێرانە. لە سەرەتای سەدەی چوارەمی پاش ڕەو (هیجرەت)دا ژیاوە. یەکێک بووە لە دوانزە بابەکانی پەیڕەوی «ئیسماعیلیە» و حوججەتی ناوچەی خوراسان بوو لە لایەن خەلیفەکانی فاتیمییەوە.

لە سەردەمی ژیانیا ناچار بووە زۆرانبازیی لەگەڵ سێ تەوژمی بە هێزی بیروباوەڕ بکا: ١ - حەکیم و فەیلەسووفەکان. ٢ - پاشماوەی ئایینی زەردەشتی لە ئێراندا کە لەوکاتەدا لە ناوچەی بەلْخ شوێنەزای ناسر خوسرەو، ژمارەیان زۆر و پایەی زانستیی موغەکانیان بەرز بووە. ٣ - زانا ئەشعەرییەکانی ئیسلام.

دیوانەکەی کە ئاوێنەی ئەم زۆرانبازییە سەختەیەتی، ٢٠ ساڵێک لەمەوپێش لە تاران چاپکرا. ئەم شیعرانەی لای خوارەوە وێنەی هەوای شۆڕشگێڕییەتی بەرامبەر بە دەستوورە قوبووڵکراوەکانی کۆمەڵیو ئایینیی سەردەم.

ئەی خوای گەورە! ئەگەر بە حوکمی خوایی — گەوهەری ئادەمزادت گشت جوان داڕشت
حیکمەت چییە پێستی ڕۆمی و حەبەشی — ئەمیان سپی، ئەویان ڕەنگی قیر لێی نیشت؟
یان فەساڵی هیندی لەگەڵ تورك بۆچی — ئەم وەك گوناح ڕەش بێ، ئەوگوڵی بەهیشت؟
بۆچی ببێ ئەم بەختیار، ئەو كوڵۆڵ، — زاهیدی میحراب و کەشیشی کەنشت؟
چی بێ ئەبێ هۆی ئیختیلافی عالەم — کە تۆ هەر خۆت مامۆستا بی و وەستای گشت؟
بڵێین دنیات لەبەر بێجێیی دنیا — لەسەر گڕی ئاڵۆز و نەگریس هەڵڕشت.
بەڵام مونعیم بۆچ لە دەریای نیعمەتا — مەلە بکا و موفلیس بگرێتەوە مشت؟

سلێمانی. کانوونی یەکەمی ١٩٥٢

# ئاهەنگی موغان

لە ناو ناقیدەکانی ئەدەبیاتی ئێراندا، ئەم غەزەلەی لای خوارەوە بە یەکێک دائەنرێ لە شاغەزەلەکانی «حافز» خۆی و گشت ئەدەبیاتی کۆنی زمانی فارسی.

لە باری سرنجی واقیعیەوە وەسفی کۆڕێکی ئاهەنگی ئایینی ئەکات لە ئاتەشگای زەردەشتییەکاندا بۆ خواردنەوەی شەرابی «هوومە»، کە هوومە لە لایەکەوە، شەرابەکە خۆیەتی و لە لایەکی ترەوە وەك «باخۆس»ی یۆنانییەکانی کۆن، خوای مەستی بووە لە ناو نەتەوە ئارییاییەکاندا. دوایی لە سەردەمی مەزدیسنایی (ئایینی زەردەشتی)دا پایەی بچووك کراوەتەوە و دانراوە بە فریشتە.

بەڵام، لە زمانی تەسەووفدا، کە ئەوترێ و لە گەلێك شوێن سرنجیشدا ماوەی گومان نادۆزرێتەوە بۆ ئەوەکە حافز و هاوجۆرەکانی قسەیان پێ کردووە، ئەم مەعنا واقیعی و ڕەپ و ڕەوانانە لەژێر نیقابی ڕەمز و ئیشارەتی سۆفییانەدا فەساڵ و دەم و چاوێکی ترمان پیشان ئەدەن. بە وێنە، بەو پێیەی خاوەنڕایەکان تا ئێستا وتوویانە نیازی حافز لە پیری موغان: پیری ئیرشادی پوخت (کامیل)، ڕابەری ڕێگای خوا دۆزینەوە بووە. لە سەرای موغان: نیازی کۆڕی کۆبوونەوەی پیاوچاکانی خوا بووە. لە گەبر: شارەزا (عاریف)ی خواناس. لە موغ: یەکپەرست (ئەهلی تەوحید). لە بەچکەموغ: ئەو تەجەللیاتە خراپانەی کە بۆ ڕێبوار (سالیک) دەرئەکەون. نیازی لە شەرابی موغان: ئەو جۆشە بووە کە ڕووناکیی ڕاستی ئەخاتە دڵی ڕێبوار (سالیک). لە ئاگری زەردەشت: مەبەستی خۆشەویستیی خوای تەنیا (عیشقی ئیلاهی) بووە.

دەوروبەری کۆشکی موغان ماڵڕابوو، ئاوڕشێنکراو
دانیشتبوو پیرێکی پاک، کۆڕێکی گەرم دابوویە ناو
مەینۆشەکان هەموو جوان، لە خزمەتا بەستوو کەمەر
گەرچی لە هەوریان ئەسوو بە فەخرەوە نووکی کڵاو
پرشنگی جام و پیاڵەیان مانگی پڕی مات کردبوو
سەرکوڵمی ئاڵی بەچکە موغ ڕێی بەستبوو لە خۆرەتاو
نوێبووکی بەخت لەو حیجلەدا بە سەدهەزار هەزار ناز
پەڕەی گوڵی گوڵاو ئەکرد بە جووتە زوڵفی حەڵقەداو
جامی تەرەب بەدەستەوە فریشتەکەی ڕەحمەت و خێر
لەو جامەوە لە ڕووی پەری و حۆریی ئەدا نمی گوڵاو
لە شۆری عەشق و نەشەدا شیرینەکاری شاعیران
شەکر شکا، سەمەن ڕژا، دەنگی ڕوباب بردی زراو

لەگـەڵ سـڵاوی مـن وتـی بـە لوتـف و پـێکەنینەوە:

«ئەی کۆنەعارەقخۆرەکە، ئەیلاتەکـەیشەراب پـێکاو!

کێ کردی ئەوکارەی کە تۆ کردت بە بێ هیممەت و ڕا،

ئەی بەشبڕاو لەگەنجی ماڵ، لە وێرانە و لە چۆڵهەڵداو؟

تـرسم هـەیە دەسـتی تـەمات نـەگـاتە گـەردنی هـیوا،

بێدارە ئەو هەمیشە، تۆش لەکۆشی بەختا خەو بـە چـاو!»

«حـافز» وەرە لە «مـەیکەدە» پـیشانی تـۆ بـدەم بـە ڕێـز:

هەزار و یەک جۆرە نیازی یەک بە یەک قوبووڵ کراو!

سلێمانی. کانوونی یەکەمی ١٩٥٢

# تەرجیعبەندێکی بەناوبانگ

«هاتیف»ی ئیسفەهانی لە سەدەی دوانزدەهەما ژیاوە. لەوانەیەکە بە شیعری سۆفیانەی جوان لە تەئریخی ئەدەبی فارسیدا ناویان دەرکردووە. بە تایبەتی تەرجیعبەندێکی بە ناوبانگی کە ئەم پارچەی لای خوارەوە بەندی یەکەمیەتی، لەناو ناقیدەکانا بە هاوشانی غەزەلەکەی حافزی شیرازی دانراوە کە ناوی «ئاهەنگی موغان»ە و وەرمانگێڕایە سەر کوردی.

ئەی بە سەرگەردی تۆ ببن دڵ و گیان!    وەی بە شاباشی ڕێت بچن دڵ و گیان!
دڵ بە سەرگەردی تۆ، کە تۆی دولبەر!    گیان بە شاباشی تۆ، کە هەر تۆی گیان!
دڵفڕاندن لە چنگی تۆ چ گران    گیان فڕێدانە ژێری پێت ئاسان!
ڕێی ویسالت شەقامەڕێی بێ‌ترس    دەردی عەشقت پەتایی بێ‌دەرمان!
نۆکەرین، گیان و دڵ لەسەر دەستین    چاوەڕێی حوکم و گوێشلی فەرمان!
گەر دڵت سولحی ئەوێ، هانێ دڵ!    بیری جەنگت ئەگەر هەیە، ها گیان!
دوێشەوێ من لە تاوی سۆزی عەشق    هەر خولم خوارد و هەرگەڕام حەیران!
تا لەئەنجامی کارما شەوقم    کێشی کردم هەتاکو دەیری موغان!
دیم ــ بە دوور بێ لە چاوی پیس ــ خەڵوەت    پڕ لە شەوقە بە ئاگری یەزدان
لە هەموو لایەکا گڕێکم دی    وەک گڕێ دی لە توور کوڕی عیمران!
پیرەکەی دەیر خەریکی ئاگر بوو    کۆڕی دەوری ئەویش کوڕانی موغان
هەموو ڕوومەت لە زیو و گوڵڕوخسار    هەموو شیرین زوبان، دەم و لێو جوان!
«عوود و چەنگ و نەی و دەف و بەربەت    شەمع و نوقڵ و گوڵ و مول و ڕەیحان»
ساقی وەک مانگ بە ڕوو، بە موو موشکین    موتریش خۆشبوێژ و نەغمەڕەوان
«موغ و موغزادە، موو‌بەز و دەستوور»[1]    خزمەتی پیر بوو ئارەزووی هەموویان!
منی شەرمن لەبەر موسوڵمانی    چووم و خۆم خستە گۆشەیەک پەنهان
پیر وتی: «کێیە، کێ نییە؟» وترا:    «عاشقێکە گەڕۆک و سەرگەردان!»
وتی: «پێی دەن شەرابی ناب، گەرچی    خوڵکی نەکراوە هاتووە میوان!»
ساقیی ئاگرپەرست و ئاگردەست    جامی پڕ کرد لە ئاگری سۆزان
وەک فرم کرد نە عەقڵ ما و نە دین    کەوتە سەر گرچ باوەڕ و چ گومان!
کەوتبووم مەست بەڵام دەمی مەستی:    بە زمانێ کە دوورە زۆر لە بەیان

ئـەم قـــەم هـــاتە گـویّ لە گشت ئـە نـدام،      تـــا ئـــە گـــاتە وەریـــد لە گـــەڵ شـــەرەیان:

کـــە یـە کـێکە و هـەیە و ئـەبێ و هـەر بـوو

«وحـــــــده لا الــــــه الا هـــــو»

سلێمانی. شوباتی ۱۹۵۳

---

۱) عیبارەتە کانی ناو دوو کەوان لە فارسیی «هاتیف» وەرگیراون.

# داستانی هەیاسی و کاکە عابیدین

«عیشقی» شاعیرێکی بەهرەدار و نیشتمانپەروەری ئێران بوو، لە تازە کردنەوەی شیعر و ئەدەبی ئێراندا دەستێکی بەرزی بوو، بەتایبەتی هەڵبەستە سیاسیە کانی ئەوەندە گەزندە و کاریگەر بوو کاربەدەستانی سەردەم بۆیان قووت نەئەدرا، بە ڕادەیەک کە شاهەنشاهی پێشوو ڕەزا شای پەهلەوی کەڵە کێکی نهێنیی ڕێکخست بۆ کوشتنی و لە تەمەنی ٣١ساڵیدا کوژرا.

عیشقی کوللیاتی شیعر و پەخشانی چاپکراوی لە سەراسەری ئێراندا برەوێکی نەمری هەیە، بەمبۆنەیەوە بێجێ نییە بخەینەوە بیر کە ئەوگۆرانییەی بە هاوکاریی خوالێخوشبوو مەحموود جەودەت و شاعیری تەڕ و پاراو «م. نوری»ی سلێمانی پێکهات:

**«ئەولادی وەتەن، ئێمە کەوا میللەتی کوردین»**

ئاوازەکەی لەسەر پارچەیەک لە تۆپەرای «رستاخیز شهریاران ایران» دانراوە کە هیی خاوەندی تەرجومە عیشقییە. پارچەکە ئەمەیە:

**دیشب که مرا وضع وطن در نظر آمد**
**دیدم که زنی با کفن از قبر در آمد**
تاد...

ئەم هەڵبەستەی لای خوارەوە وێنەیەکە لە شیعرە سیاسیەکانی عیشقی، بە هەندێک دەسکاری و بواردنی هەندێ ناو و کارەسات کە پەیوەندی بە وڵاتی ئێمەوە نییە، کردمان بە کوردی، هیوامان وایە جێگای کەڵک و پەند بێ بۆ هاونیشتمانە خۆشەویستەکانمان:

لە کوردستانا، لە قاسمئاوا    کاکە عابیدین ناوێک بوو کوێخا،
پیاوێک بوو، دڵ و دەروونی پاک بوو    لەگەڵ گشت کەسی ناودێدا چاک بوو
یەک ژووری هەبوو دەرگا شەقوشڕ    لەگەڵ یەک کووپەی لە دۆشاو پڕ پڕ
کابرایەکی دز بە ناو هەیاسی    دێ گشت بێزار بوو لە دەنگ و باسی
دراوسێی کوێخای خاوەن دۆشاو بوو    بۆ دزیی دۆشاو کەمەربەسراو بوو
هەرچەند عابیدین لە ماڵ دەرئەچوو    ئەو خۆی بە کووپە ئەگەیان زوو زوو
دۆشاو هەڵئەقوڕا بە چنگ و کەوچک    ئەڕژایە بەر پێ چۆڕ چۆڕ و تک تک!
تا ڕۆژێک کوێخا، ڕوانییە دۆشاو    لەچاو جارانا کەم هاتە بەرچاو

دی: شوێنپێ لەسەر دۆشاوی ڕژاو
چووە تا ماڵی هەیاسی بەدناو

بانگی کرد ئەرێ برای هەیاسی!
نابێ تۆ نەختێ خودا بناسی؟

بەری ڕەنجم بوو کووپەی دۆشاوم
بزانم ڕەنجت بۆچ بە با داوم؟

هەیاسی نیازی ڕێگای حاشای بوو
بەڵام عابیدین بەرپەرچی دا زوو

وتی: بڕوانە بۆ زەوی و شوێنپێت
کێیە دز: دیارە، تەنانەت لای شێت

هەیاسی کە دیی بێسوودە ئینکار
ڕێی پاڕانەوەی گرتە بەر ناچار

وتی: ئەمجارەم ببەخشە، سوێن بێ
ئیتر نەتێمە ئەودیو ماڵت پێ

کاکە عابیدین، کوێخای دڵبێگەرد
بوورد لە گوناهی هەیاسی نامەرد

لەپاش چەند ڕۆژێک نەوس و چڵێسی
هەیاسی هاندا بۆ کووپەلێسی

گەڕا بۆ فێڵێک هەم سوێن نەشکێنێ
هەم کووپەی دۆشاو لە بن دەربێنێ

کەرێکی هێنا سواری پشتی بوو
بۆ خزمەت کووپەی دۆشاو ئاوا چوو

بەسەر سواریەوە خۆی درێژ کێشا
دۆشاوی نۆش کرد تا ورگی ئێشا

دوایی کە کاکە گەڕایەوە ماڵ
دیی پیرە کووپەی بەتاڵ و حەتاڵ

کە سەرنجی دا مایەی واق ورمان
شوێن‌سم دیار بوو، نەک شوێنپێی ئینسان

سەری بڕد، ناوی کووپەی ڕوانی
شەقڵی پەنجەی دی، هی کێش بوو؟ زانیی!

بە سەرسووڕماوی ڕێگای دووری گرت
هەڵیە کێشا هەناسە و ئەیوت:

کەر بێ دز، پەنجەی لە کوێ هەیە کەر؟
هەیاسی سمی کوا، دز بێ ئەگەر

پەنجە: پەنجەی ئەو، شوێنپێ: شوێنپێی کەر
بە کێ بڵێم دز؟ هەی خاکم بە سەر[1]؟!

* * *

لەم سەرگروشتە نیازم پەندە
بۆ نەتەوەیەک گیرۆدەی بەندە

زۆردار بیەوێ، شوێنپێ بکا گوم
پێ تۆپەڵ ئەکا و لێت ئەکا بە سم

مادەم خاوەندی کووپەی دۆشاوی
لێت ناترووکێنێ هەیاسی چاوی

هەیاسی ئێمە، ئەی دۆستی گیانی!
«جۆنبۆڵ»ە ئەبێ زۆر باش بزانی

هەر ئەوە سواری کەری ناوخۆیە
کەر تاوان ئەکا، بەڵام ئەو هۆیە

هەر ئەوە لێمان بۆتە هەیاسی
کل لە چاو ئەدزێ بە دیپلۆماسی

بە ڕواڵەت بێ، کەرگەلی خۆمان
بەر بوونەگیانی دایکی نیشتمان

بەڵام کەر جووتە ناهاوێ، کەرسوار
سووژن لە ملی نەدا جار و بار

**سلێمانی - ١٩٥٣**

---

١) لە فۆلکلۆری کوردیدا هەیە ئەڵێ:
چنگ چنگی خەرە و سم سمی یاسێ    سەرم لەم کارە ئەماسێ    م.ک.ک.

# هێزی گەل

ئەم شیعرانە لە «ئەبووتورابی جەلی»یەوە کراوە بە کوردی، بەو نیازەی تا ئەتوانرێ وەرگێڕراو لە ئەسڵ بچێ، وشە لاوەکییەکان بەتایبەتی هینەکانی قافییە، هەندێکیان هەر وەکوو خۆیان هێڵراونەتەوە.

تــوانست و هــێز هــەرچــی هەیە گشتی هی گەلە
وەك ئــیشتیقاقی فــیعل لە یــەك بنجی مەسدەرە!
ئەمرۆ گەلێ کە کەوتە هەوای کەڵك و سوودی خۆی
لەو ڕێــیەوە کــە خــۆی ئــەیەوێ بۆی مویەسسەرە!
ئــەمرۆ گــەلە کــە پشت و پــەنای ڕاســتەقینە بــێ،
ئەی ئەوکەسەی کە پشت و پەنات فەوجی عەسکە رە!
نــانی گــەلە کــە لەشکــری ســەربازی پــێ ئــەژی!
تــــیغی گــــەلە بــــەهێزکەری دەســـتی ئــەفسەرە!
نــازانــی کــێیە ئــەو کــەسە دەستی پڕە لە چەك؟
دیــارە ئــەویش لە بــڕبڕەکــەی پشــتی ڕەنــجبەرە!
شــمشێری قینی چۆن هــەڵەکێشێ لە کاکی خۆی
ئــــەو پــاڵەوانــە مــەردە ســروشتی لە گــەوهەرە!
پــــەند وەرگــــرە لە کــار و لە قــەوماوی ڕۆژگــار
تــەئریخە هــەر بــە حــوکمی دروست تاقە داوەرە!
دوێنێ ئەوەی کە ئاگر و خوێن بــوو لەسەر دەمی
بــڕوانــە: چــاوەکــانی بــە فرمێــك چەن تەڕە؟
تــوانــی ئــەگــەر شــپرزە بکــا ئــاشتی دەمــێ
ئــێستاکــە کــاری خۆیەتی وەك زوڵفی دولبەرە
لەو ڕۆژەدا بــوو جــەور و ستەم گرتبووی جیهان،
ئــــێستاکــــە داد و عــەدلە لە گشت لا مــوزەففەرە!
دنــــیایی نــــوێ ئــــەیەوێ ڕاپــــەڕینی نــــوێ
ئـــەم ڕاستییە لە تــیشکی هــەتاو ئــاشکراتــرە!

لافـاوی ڕاپـەرینە، گـوڕی، هـەرچـی هـاتە بەر
کـــێوی لە لا لەگــــەڵ پـەڕی کـادا بـەرابـەرە!
بـــیرکردنەوە لە بـــابەتی کـۆن و ڕزیـو و پـووچ
هـــەر تـایەتی بـە سـەردەمی دارا و سکـەندەرە
شــــمشێر نــــییە کـە ئـاوی دەمـی کپ بکـاتەوە
ئـەو ئـاگـرەی لە جـۆشی دڵ و شـۆری نـاو سـەرە!
پـرشنگی ڕۆژی بـەختی گـەلان کـەوتەدەر لە کـەل
بـڕوانـە کـۆشکی گـێتیی نـوێ چـەند مـونەووەرە!

سلێمانی - ١٩٥٣

# خەباتی گەل

**ئەبوو تورابی جەلی**[1]

لەش گـــە ڵای دار بـــوو ڕژایـــە ســـەر شـەقامی پـانی شـار
خـــوێنی لێ ئـەڕژا وەکـــوو لافـــاوی بـــارانـــی بـــەهار
مێشک و کەللەی زۆر پژابـوو، سـنگ و گـەردن تـێکشکاو!
مـــێشکە کـــانی پـــڕ هـــیوا و ســـنگە کـــانی پـــڕ«شـــەرار»
گەرچی خوڕڕەم دایئەکـرد بـارانـەکـەی کـوشتاری گـەل،
گەل، بەڵام وەسـتابوو مـەحکەم چـەشنی کـێوی «ئـیستیوار»
ڕیـــــزی پـــــێشی گـــرتبوو پـــاڵەی دەس ومشت ئـــاسنین
شانبەشانی ئـەو ئـەچوو ڕەنـجبەر لەگـەڵ دەسـتەی هـەزار
یسێبەری سەر گشتی کۆمەڵ باڵی مـەرگ بـوو، بـاڵی مـەرگ!
خەڵک بە ڵام بێباک ئەڕۆیشتن بەرەو ڕووی چـاڵی مـەرگ!

* * *

دوایـــی مشـتی ئـاسنینی خـەڵک تـانکی تـێکشکان،
دەستی هێزی گەل لە خاکـا تـۆپەکـانی گشت خـەوان!
قـــاچی تـــاوانکـەر لە پـیسیدا هـەتا بـندەست چـەقی،
دەســـتی نـــاپاکـــان کشـــایە دوا، نـیشانەی داوەشـان!
گیانسپێریی گەل لە ناوچاوانی پاکـا بـوو بـە فـەڕ
داخـــی عـاری نـایە سـەر نـاوچاوی تـاوانپیشەکـان!
خۆی خزانەکـون لەتـرسانا وەکـوو ڕێـوی‌و دەڵـەک:
گورگی خوێنخوارێک لە میللەت کەڵبەکانی دەرپەڕان!
تکتکی خوێنی شەهیدان بوونە مـەشخەڵ بـۆ زەفـەر،
لەشکری پرشنگ، شکستەی هـەوری تـاری دایـە بـەر!

* * *

یەکـیەتیی گـەلمانە وا زنـجیری جـەوری پـارەکـرد
نـــەعرەتەی ئـــینسانە وا ڕێـــویی دزی ئـــاوارەکـرد
پایەیی کۆشکی ستەم لەق بوو، بـەڵام پـێویـستە ڕەنـج
تا بەجارێک سەرنگوون کەین ئەو سەرایە دەستوبرد

هەر لە سایەی یەکیەتیدا بێگومان توانست ئەبێ
خەم نەهێڵین و بڵێین وا دەردی خۆمان چارە کرد
دوشمنی بەدکاری ئێمە پیشەکەی ناپاکیە
سەد شوکر ڕۆژی بە سەر چوو، سەد شوکباوکی‌مرد!
با ئیتر کون کون نەکا سونگی لەشی پیر و جوان،
با ئیتر خوێن ڕووی زەویمان لێ نەکاتە ئەرخەوان!

سلێمانی - ١٩٥٣

---

١) گۆڕینی سێ بەندی دوایی لە هەڵبەستێکی درێژە کە لە ئەنجامی ڕاپەڕینێکانووسراوە. وشەکانی ناو دووکەوان هی دانەری فارسین.

# بت

## له فارسی وەرگیراوە

ــ کێ شکانی سەری بت؟
ــ سەری بت ئێمە شکانمان ئێمە!
ــ چوارپەلی ئەسپەکەیی کێ پەی کرد؟
ــ ئێمەیی داس بە دەست بووین، ئێمە!
ــ ورگی بت کێ بوو دڕیی؟
ــ نەدڕاوە، سکی بت
نەدڕاوە،
- کێ دیی؟
بدڕە ئەی دەستی بەهێزی هاوڕێ:
ڕێی سبەینێیی مەزن
بدڕە ڕووپۆشی فەساڵی بتی شووم
تا ببینین کە لەسەر ناوچاوی
ناوی کێ نووسراوە؟
ناوی ئەو پیاوکوژە وا «ئازەر»و «تیر»
خوێنی گەلمانی ڕژان...
ناوی سەرکردەیی هێزێك: یانکی
تیا سەری گەورەیی سەرکردەکەین،
ناوی ئەو خێوەکە ئارامی نییە،
ڕۆژ و شەو هاوسەری بیری سەفەرە!
بدڕە ڕووپۆشی فروفێڵی فەساڵ،
بدڕە ئەی دەستی بەهێزی هاوڕێ!
تا بخوێنینەوە گشت
تا بکۆڵینەوە گشت
کە لەژێر پەردەیی فێڵا چ کەسە؟
کەس نییە، گەرچی لە لای ئێمە کەسە!
کێیە؟ زەححاکی زەمان،
دز و جەردەی سامان؟!
بدڕە پەردەی فرو فێڵی سەر ڕووی

بدڕە ئەی دەستی بەهێزی هاوڕێ!
با تەواو دەربکەوێ،
سەر و گوێلاک و فەساڵی دێوی،
تۆیش نەپرسی دەمی هەڵهاتنی ڕۆژ،
بە زمان خەڵقەوەگشت،
ورگی بت کێ بوو دڕیی؟
کێ بتی کوشت؟

سلێمانی - ١٩٥٣

ئەم گۆزە وەک من دڵداری بووە، گیرۆدەی زوڵفی نیگاری بووە؛
ئەو دەسکەی ئێستا قوڵفە لە ملیا سەردەمێک دەستی مل یاری بووە!

*

بەر لە من و تۆ ڕۆژگاری بووە، خولخواردنی چەرخ بۆ کاری بووە؛
ها سووک پێ دانێ لەسەر خاکی ڕەش، ڕەشێنەی چاوی نیگاری بووە!

*

ئەم سەرا کۆنەی ناوی جیهانە لەسەر ڕێی گەشتی شەو و ڕۆژمانە،
بەزمێکە لە سەد جەمشید جێماوە، سەد بەهرام هات و چوو لەم وێرانە!

*

ئەو کۆشکەی بەزمی تیا گێڕا بارام بۆ ئاسک و ڕێوی بوو بە جێی ئارام
بارام کە گۆڕی ئەگرت تا مابوو ئەتدی گۆڕ ئەوی چۆن گرت سەرئەنجام؟

*

لەهەر دەشتێکا کە گوڵزارێکە ڕەنگی گوڵ خوێنی شەهریارێکە،
وەنەوشەی مۆری لە گڵ دەرهاتوو خاڵێکی جوانی ڕووی نیگارێکە!

*

هەی داخ دەستمایە لە چنگمان دەرچوو، لە دەست مەرگ گەلێ جگەر کون کون بوو،
خۆ کەس لەو دنیا نایە لێی پرسم ئەنجامی کاری زووتر کۆچکردوو!

*

ئەفسووس! تۆماری جوانیمان تەی بوو، بەهاری تازەی شادیمان «دەی» بوو؛
ئەو مەلە مەستەی جوانی بوو ناوی، هەی داد، نەمزانی کەی هات و کەی چوو!

*

یارانی هاودەم هەموو لە دەست چوون، لەژێر پێی مەرگا یەک یەک پێشێل بوون؛
لە بەزمی عومرا یەک مەیمان نۆشی ئەوانی زووتر خست جامی گەردوون!

*

ئەڵێن لە بەهەشت حۆریی جوان هەیە، مەی و هەنگوینی سپیی شان هەیە،
بۆچ یارپەرستی و مەینۆشی نەکەم مادام ئەنجامی کار هەمان هەیە؟

*

گەردوون هیچ گوڵێک لە گڵ دەرناکا     تا نەیرژێنێ دیسان لە خاکا؛
لە جێی ئاو خاکی هەڵگرتایە هەور:     هەر خوێن ئەباری بەسەر خاشاکا!

*

هەور دیسان هات گیای شت بە گریان،     بێ مەیی گوڵڕەنگ چۆن بژین یاران؟
ئێستا سەیرانگای ئێمەیە سەوزە،     ئەی سەوزەی خاکمان کێی دێتە سەیران؟

*

هەر گیایەک لە گوێ ئاوێک ڕواوە،     ئەڵێی مووی لێوی تازە خەت داوە؛
نەکەی گیا هەرگیز بێباک بشێلی:     لە گڵی لەشی وەک گوڵ خەملاوە!

*

هوشیار بم نەشئەم لێ پەنهانییە،     کە مەست بم عەقڵم لە نوقسانییە؛
حاڵەتێک هەیە بەینی ئەم و ئەو     بە بەندەی ئەبم زیندەگانییە!

*

ئەی دڵ زەمانە پیشەی خەمدانە،     هەرکاتێکت دی بۆی مردی، گیانە!
سا پێش ڕوانی سەوزە لە خاکت     خۆش بژی لە دیار ئەم سەوزە جوانە!

*

کە هەوری نەورۆز ڕووی گوڵی تەڕ کرد،     بە عەزمی بادە هەڵسە دەستوبرد؛
ئەم سەوزە گیایەی سەیرانگای تۆیە،     سبەی لە خاکی تۆ ئەڕوێ ورد ورد!

*

ئەڵێن دۆزەخە جێی پیاوی سەرخۆش،     هەی قسەی بێجێی دوور لە عەقڵ و هۆش!
گەر عاشق و مەست گشت بچنە دۆزەخ،     بەهەشت ئەبێتە ناو لەپێکی بۆش!

*

مەی بخۆ، لەژێر گڵا ئەنووی زۆر     بێکەس، بێهاوڕێ، بێ هاودەنگی گۆڕ؛
با ئەم ڕازەشت لا نەهێنی بێ:     گوڵ سیس بێ، گەشە ناکا لە بەر خۆر!

*

ئەوانەی دەریای فەزڵ و هونەر بوون،     لە کۆڕی عیلما چرا و ڕابەر بوون،
لەم شەوەزەنگە ڕێیان دەرنەکرد،     ئەفسانەبێژی خەو لەخۆخەر بوون!

*

هەندێ دەستخەڕۆ، دووی غوروور کەوتن،     هەندێک شوێن کۆشکی پڕ لە حوور کەوتن؛
کە پەردە لاچوو ئاشکرا ئەبێ     ئەمانە لە تۆ ئێجگار دوور کەوتن!

*

هەندێک لە بیردان بۆ مەزهەب و دین،
هەندێک دوودڵی گومان و یەقین؛
لە لابەلاوە لەپڕ دەنگێ دێ
ئەڵێ: کام گومان؟ کام بڕوا و ئایین؟

*

لە هاتنمان و چوونمان سوو کوانێ؟
بۆ تەونی هیوا تای دەزوو کوانێ؟
لەناو چەمبەری چەرخا هەزاران
گیان سووتا و خۆڵی بە با چوو، کوانێ؟

*

مەلێکم بینی لەسەر قەڵای تووس
لەبەر دەمیا بوو کەللەی کەیکاووس،
ئەیوت بە کەللە: ئەفسووس، سەد ئەفسووس!
کوانێ دەنگی زەنگ؟ کوانێ ناڵەی کووس؟

*

نەکەی تۆبە کەی لە مەی تا هەیە،
تۆبە سەد تۆبەی بەدوادا هەیە؛
گوڵ کراس بدڕێ و بولبول بخوێنێ،
لە کاتی وادا تۆبە کوا هەیە؟

*

گوڵ بەربەیانێک ژاکا و هەڵوەرێ،
ڕازی خۆی هەڵڕشت بۆ با و هەڵوەری؛
کەمشەرتیی چەرخە کە گوڵ بە دە ڕۆژ:
ڕوا و پشکووت و ژیا و هەڵوەری!

*

بڕوانە دڕی با پەردەی ڕووی گوڵ،
سەرگەرمی عەشقە بولبولی سەر چڵ؛
لە بن گوڵباخا دانیشە، گوڵباخ
زۆر جار ڕواوە و بۆتەوە بە گڵ

*

ئیتر بەیاخی نیفاق پەی ئەکەم،
بە مووی سپیوە ڕوو لە مەی ئەکەم؛
ژمارەی پێکی عومرم حەفتایە
ئێستا بەدمەستی نەکەم، کەی ئەکەم!

*

چەندێک منداڵ بووین قوتابیی زانا،
چەندێکیش خۆمان بووین بە مامۆستا،
ئەنجام بڕوانە چیمان بەسەر هات:
وەک ئاو هاتین و بۆی دەرچووین وەک با!

*

چ دەستەی تازە، چ پیرانی کۆن
هەموو یەک بە یەک، وەک هاتوون ئەڕۆن؛
دنیا نامێنێ تا سەر بۆ کەسیان،
چۆن هاتن و چوون، ئەبێ: بێن، بڕۆن!

*

ڕەندێکم بینی دانیشتووی ڕووی خاک،
مەگەر هەر ئەوم دیبێ وا بێباک:
بەرامبەر بە: کوفر، ئیسلام، دنیا، دین،
حەق، گومان، یەقین، ڕێی خراپ و چاک!

*

گەردوون جامێکە سەرنیگوون کەوتوو، ژێران لەناویا گشت زەبوون کەوتوو؛
سرنج لە دۆستیی شووشە و پیاڵە بەن دەم لە دەمان و خوێنی یەک خواردوو!

*

کفر و دین بەبنیان یەک هەناسەیە، یەقین تا گومان یەک هەناسەیە،
ئەم هەناسەیە بە خۆشی بژی، مادام خۆی ژیان یەک هەناسەیە!

*

ئەی دڵ لە دنیا ئیحسانت ئەوێ؟ لە چەرخی گەردوون سامانت ئەوێ؟
دەرمان داوا کەی دەردگران ئەبێ، لەگەڵ دەرد هەڵکە و دەرمانت نەوێ!

*

گایەک لە ئاسمان ناوی پەروینە، گایەکیش ئەڵێن لەژێر زەمینە،
سا چاو بگێڕە ئەی خاوەندی هۆش لەناو دووگادا کەرگەل ببینە!

*

وەک گوڵ پیاڵە بەرمەدە لە دەست؛ لەگەڵ گوڵڕەنگی چاو و برۆ مەست
شەراب بنۆشە، ئەم چەرخە شینە هاکا تۆزیشی کرد بە وێنەی گڵ پەست!

*

دڵ نابێ داری خەمی تیا بڕوێ، خۆش کتێبێکە لە خۆشی بدوێ؛
مەینۆشین باشە و کام هێنانەدی، خۆ دیارە ژینت چەن کەم بۆ ئەلوێ!

*

شووشەم ئەشکێنی بە قەستی، خوایە! ڕێی نەشئە و بەزمم ئەبەستی، خوایە!
شەرابی ئاڵم ئەڕێژیتە خاک، هەی خاکم بە دەم بۆچ مەستی، خوایە!

*

کێیە بێگوناح ڕووی دنیا، بڵێ؟ بێ گوناکردن چۆن ژیا، بڵێ؟
کە من بەد بکەم، سزای تۆیش بەد بێ تۆ و من جیاوازین لە چیا، بڵێ؟

*

ئای کە زۆر گەڕاین بە دەر و دەشتا، دنیامان بێزا لە گێڵ و گەشتا،
لەم ڕێگای چوون و نەهاتنەوەدا کەسێک تووش نەبووین لە بازگەشتا!

*

پیاڵەی ئەجزا جۆشخواردووی بێگەرد مەست دڵی نایە قەت بیدا لە بەرد؛
ئەی سەر و مل و ساق و دەستی جوان کێ لێکیان ئەدا و ئەیانکا بەگەرد؟

*

هەرچەن بە ڕەنگ و بۆی جوان ڕازاوم
وەک گوڵ، بە باڵایش سەروی سەراوم،
بەڵام نەمزانی وەستای نیگارکێش
لە گاڵتەخانەی خاک بۆ دایناوم؟

*

لەپێشا چەرخی شین خستنە کار،
دوایی تێکدانی بنچینە و دیوار،
ناکێشرێ هەرگیز بە تەرازووی عەقڵ
پێوانەی نایە بە مەتر و پەڕگار!

*

شاد بژی مایەی عومرت دەمێکە،
هەر گەردێک لە خاک «کەی»و «جەم»ێکە،
چۆنیەتیی دنیا و ئەسڵی ئەم عومرە،
خەوە و خەیاڵە و تەفرە و تەمێکە!

*

ساقی! قەدەحێک، ژیان یەک دەمە،
هەر بە خۆشی بێ ئەو دەمەش بەسمە؛
چۆنت بۆ لوا بسازە، چەپگەرد
سووڕانی بەپێی دڵخواز زۆر کەمە!

*

بەر لەوەی گەردوون تووشمان کا بە وەی
وەرە! با خۆمان تێراو کەین لە مەی،
چونکە چەرخی کۆن کاتی ڕۆیشتن
ماوەی ئاو نادا لێوی پێ تەڕ کەی!

*

هەر بەربەیانێک ڕووی ئاسمان شین بێ،
ئەبێ لەسەر دەست پیاڵەی ڕەنگین بێ،
ئەڵێن لە دەما تامی مەی تاڵە،
مەی حەقە و کێ دی کە حەق شیرین بێ؟

*

ئەم کۆشکەی لووتی لە ئاسمان بوو،
شاهان ئەیاننا بۆ بەردەرگای ڕوو،
دیمان کۆترێک لێوی دیواری
گرتبوو کز کز ئەیوت: کوو کوو کوو!

*

ئەوانەی زووتر بۆی دەرچوون، ساقی!
خاکی غورووره تیا نووستوون، ساقی!
مەی بخۆ و ڕاستی هەر لە من ببیە:
با بوو لە هەرچی دوابوون، ساقی!

*

بێ مەی گوزەران کردن ناتوانم،
بێ جام باری لەش بردن ناتوانم،
بەندەی ئەو دەمەم ساقی ئەڵێ: ها
جام و من ئیتر گرتن ناتوانم!

*

ئەو کەسەی زەوی و ئاسمانی دانا،
بەشی دڵ داغی گرانی دانا،
زۆر لەعلی لێو و میسکی ئەگریجەی،
نایە چاڵ، خاکی لە بانی دانا!

*

سەردەستەی دنیای مەعانی عەشقە، شابەیتی شیعری جوانی عەشقە،
ئەی بێئاگایی لە عالەمی عەشق ژیان خۆی ئەبێ بزانی عەشقە!

*

وەک خەمم عومری درێژ بێ نازدار، ئەمڕۆیش دڵنەرمیی خۆی خستەوەکار،
چاوێکی لوتفی بڕیە چاوم: چاکەی هاویشتە ناو ئاوی ڕووبار!

*

یەک قوم مەی مولکی کەیکاووس دێنێ، تەختی قوباد و بەختی تووس دێنێ،
لە بەربەیانا ئاخێکی سەرخۆش سەد نوێژی سۆفیی زمانلووس دێنێ!

*

من کە ڕەمەزان ڕۆژووم ئەشکان لە بێخەبەریم نەبوو، بێگومان؛
ڕۆژوو بەرچاوی تاریک کردبووم، لای خۆم بۆ پارشێو تیکەم ئەگلان!

*

کە مردم خاکم بە با ببێژن، بۆ عیبرەت نەکەن لاشەم بنێژن،
لەگڵم قوڕێک بە مەی بشێلن، خشتی سەر کووپەی لێ دابڕێژن!

*

با سەر پڕ سەودای بتی وەک حوور بێ، جامی دەست کەیلی شەرابی سوور بێ؛
خەڵق ئەڵێن تۆبەت قوبووڵ ئەکا خوا، ئەو نەیکا و منیش تۆبەم لێ دوور بێ!

*

ئەی هاودەمەکان مەیم کەن بە قووت، ڕووی کارەبایم بکەن بە یاقووت؛
کە مردم لاشەم بە شەراب بشۆن، لە مێو هەڵبەستن بۆم تەختەی تابووت!

*

نووستبووم، ژیرێک لە خەوما فەرمووی: کێ بە خەو پشکووت غونچەی ئارەزووی؟
خەو برای مەرگە، تا زیندووی مەمرە، کە مردی لەژێر خاکا تێر ئەنووی!

*

چەرخی ئاسمانی بێبنی پڕهەور جامێک لە بەزمیا چەرخ ئەدا بە دەور،
نۆرەت هاتە سەر، بێ ئاخهەڵکێشان بینی پێوەنێ، دەورە، نەوەک جەور!

*

ئەم یەک دوو ڕۆژەی عومر چوو بە سەر وەک ئاوی ناوچەم، وەک بای دەشت و دەر،
لە ڕۆژان هەرگیز خەم ناخۆم بۆ دوو: ئەوەی تێپەڕی و ئەوەی دێتەدەر!

*

لە گشت ڕۆیشـــتووی ئــــەم شـەقامەڕێ     کــێ گــەڕایـەوە، ڕاسـتی وت بـە کـێ!
لەم دووڕێـــیانەی هــــەڵپە و هــیوادا،     نــــا گــەڕێتەوە، هــیچ مــەهێڵە جــێ!

*

یــاران بـە ڕێکـەوت کـە کـۆمەڵتان بـەست،     بــیرتان بــێ دۆســتی لە نــاو گـلا پـەست.
لە کـــۆڕی بـــەزما نــۆرە پـیاڵەی ئــەو     قــڵپکەنەوە و گـــڵە کــەی کــەن مــەست!

•

# پییەر لۆتی

## لە کتێبی «من شعر ناظم حکمت» وەرگێڕاوە

نازفرۆشی، تەلیسم، قەدەر
قەفەس، کاروان، کۆشک و سەرا
تاڤگە،...
بڕۆن میرکچان
پەریزادەکان
ئەی سەماکەران لەسەر سینیی زیو،
ڕاجە، شا، سوڵتان
هەتا هەزار ساڵ
وەک لە منارە بووبێ ئاوێزان
ڕەسمگەلی شیلان
ئافرەتانی پێ و دەس بە خەنەش
ریس و چنینیان بە نووکی پێ لا ئەدەن
لە دوور دوورەوە
لەگەڵ گڤەی با
ئەخوێنن بە ڕیشی دووکەڵاوییەوە
کۆمەڵی مەلا
لە ناو بەرگی ڕەشی زلا...
ئا ئەمەیە، هەر ئەمەیە ڕۆژهەڵات
ڕۆژهەڵاتێک کە شاعیری فەرەنسی دیی
ڕۆژهەڵاتی بێگەرد و خام
وەک ئەو کتێبانە ئەنووسن
کە دەقیقەی ملیۆنێکیان لێ چاپ ئەبێ
بەڵام نە دوێنێ، نە ئەمڕۆ، نە سبەینێ
هەبوو، هەیە، ئەبێ
ڕۆژهەڵاتی وا!
ڕۆژهەڵات، جێی هەڵهاتنی ڕۆژ،

زەویی بورکانەکان
کە دیل و بەندە، بەندەی ڕووت و قووت،
لە برسانا تیا ئەمرێ
وڵاتی کڵۆڵی
موڵکی هەموو، ڕۆژەڵاتی خۆی نەبێ
ئاخ ئەی ئاسیا... ئەی باڵۆرەی دەمی ئەورووپا!
ئەی باڵۆرەی پڕ لە هەموو شت
ئەی باڵۆرەی پڕ لە گەنم
ئەی ئاس ـیا،
چینییەکانت
چینیە سواڵکەرەکانت
خۆیان بە پرچ هەڵئەواسن،
بە دەست خۆیان بەند ئەکەن وەک مۆمی زەرد
بە دیرەکی کەشتیەکانی ئەمەریکاوە
لە پۆپەی هەرە بەرزی شاخی هیمالایا
لە پۆپەی هەرە سەخت
زابتەکانی بەریتانیا مۆسیقای «جاز» لێئەدەن،
قاچە زلەکانیان بە نینۆکی ڕەشەوە نوقم ئەکەن
لەو نەهری غانژەداکە بێزراوەکان[1]
مردوویانی تێئەهاون
ئەو مردووانەی بێهیوایی لە ژێر پێدا
پلیشانوونی
وە ئەنادۆڵی
لە لووتکەیەوە تا دۆڵی
لەو زەوییە بەولاوە نییە
کە ئارمسترۆنگ گۆرانیی شێتیی تیا بڵاوئەکاتەوە
ئاسیا ئیتر بێزار بووە،
بێزار بووە لەمانەگشتی
ئیتر ڕۆژهەڵات نایەوێ
ئەم شۆربایە قووتدا

تەنانەت ئەگەر یەکێکتان توانیی سبەینێ
ئەو مانگایەمان بۆ زیندوو کاتەوە کە برسیەتی کوشتی
با دوورەوە کەوێ، هەر ئەوەندە بۆرجوازی بێ
تەنانەت تۆ، ئەی پییەر لۆتی
بە تایبەتی تۆ
ئەی ئەوەی ئەسپێی تیفۆس لە لەشیا شاراوەتەوە
ئەو ئەسپێیە کە لە ڕێی کوتاڵی مێوکراوەوە تێمەیان پێ کوتا، تۆیش هەر دوورەوە کەوە
دوورتر کەوە لە زابتی فەرەنسی!
تۆ، ئەی زابتی فەرەنسی
پارەکەی خۆتت لە بیر چوو
«ئەزیادە»ی چاو هێشوویی
ئەوەندە زوو کە ژنە بازاڕییەکان
بەو گورجییە لە بیر ناچن •
درۆزن دەرچووی، ئەی لۆتی
درۆزن دەرچووی
گۆڕی «ئەزیادە»ت بۆمباباران کرد
ئەو گۆڕەی لە تێمەدا ناشتبووت
لە منا ناشتبووت
هەر وەکوو کۆلکەدارێک بێت بۆ نیشانە دانرابێ
باگشت لایەک بزانن
کە تۆ، ئەی لۆتی، لە جادووباز زیاتر نییت
جادووباز... پییەر لۆتی
ئەوەی کە بە ڕۆژهەڵات ئەفرۆشێ
هەرچی کاڵای فەرەنسی هەیە،
هەرچی کاڵای چاوەڕاو هەیە،
سەدی پێنج‌سەد ئەخاتە سەر نرخەکەشی بۆ قازانج
ئەی پییەر لۆتی، ئەگەر باوەڕم ببوایە
بەگیانی جیاواز لە بیرەوەری،
گیانی تۆم ئەگرت
لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژهەڵات ڕزگار ئەبێ

به پایەی پردێکا هەڵمەواسی
ئەمجا جگەرەیەکم ئەنا بە دەمەوە، ئەمکێشا
بەرامبەر بەو گیانە درۆزنە!
دەستم بۆ ئێوە درێژ کردووە،
دەستمان بۆ ئێوە درێژ کردووە
دەستمان بگوشن
ئەی ڕووت و قووتەکانی ئەورووپا
غار دەین لەگەڵ یەکتر
بەسەر ئەسپی شێی ڕەنگسوورەوە
ئامانج بەرامبەرمانە، ئەوەتا زۆر نزیکە
زۆر نزیکە بنوارن
بنوارن چەن کەم ماوە
بۆ ئەو ڕۆژانەی[1] بڕیان داوین لە سەربەستی
بڕوانن ژیانەوەی ڕۆژهەڵات
چۆن لە دوور ملی ناوە دێت
دەستەسڕی خوێناویمان بۆ هەڵئەتەکێنێ!
بڕوانن، دوایی، چۆن ئەسپی شێی ئێمە
بە چوارپەل سەما ئەکات
بەسەر لاکی ئیستیعماردا!

سلێمانی. نیسانی ١٩٥٣

---

١) ڕۆژاوەکان: مەبووزەکان.

## هەورەکان تێئەپەڕن[1]

هەورەکان تێئەپەڕن[2]
مەمبەن بەرەو جەنووب
نامەوێ بمرم

نامەوێ بمرم
مەمبەن بەرەو باکوور
مەمبەن بەرەو ڕۆژهەڵات
نامەوێ بمرم

نامەوێ بمرم
مەمبەن بەرەو ڕۆژئاوا
لەم شوێنە بەجێم مەهێڵن
بمبەن بۆ شوێنانی تر
نامەوێ بمرم
نامەوێ بمرم

---

١) ئەم پارچەیە و پارچەی پاشەوەی، لە هەڵبەستی وناظم حکمت،ن کراون بە کوردی. م.م.ک.
٢) مەبەست: ناکۆکی ئەڕوا... مەمبەن بۆ شەڕ. لە باری ئێستادا مەمهێڵنەوە، بمبەن بە ڕێگای پێشکەوتنا.

# ئینسانی گەورە

ئینسانی گەورە لە کەشتیدا ڕێبواری سەربانە،
لە شەمەندەفەرا پلەی سێیەم
لە شەقاما سواری قاچی خۆیەتی
ئینسانی گەورە.

ئینسانی گەورە لە هەشت ساڵانە ئەچێ بۆ ئیش، لە بیستا ژن ئەهێنێ،
لە چلا ئەمرێ
ئینسانی گەورە.
نان جگە لە ئینسانی گەورە بەشی هەمووکەس ئەکات، برنجیش هەروەها
شەکریش هەروەها
قوماشیش هەروەها
کتێبیش هەروەها
جگە لە ئینسانی گەورە بەشی هەمووکەس ئەکات.

لە زەویی ئینسانی گەورەدا سێبەر نییە
لە کۆڵانی شەویا چرا نییە
لە پەنجەرەیا شووشە نییە
بەڵام هیوای هەیە ئینسانی گەورە
بێ هیوا هەرگیز ناژی.

تاشقەند. ١٩٥٨

وێنە لە هەڵبەستی سۆڤیاتی:

## باوەڕەکەمان...

دانەر: یەڤگینی یەفتۆشینکۆ

باوەڕەکەمان فەرمان نییە بەسەرمانا داسەپابێ،
لە قووڵاییی دڵمانا ڕەگەکانی داچەقیوە.
ئەگەرچی لە ئازار زاوە و لە گوشاری پێویست،
بەڵام ئێستا: ئەبەخشێ هێز، ئەبەخشێ بەری شیرین.
باوەڕەکەمان لە ڕۆژی هەرە تاریکا گەیشتە فریامان.
لەکاتێکاکە باری سەرشانی گەل ئێجگار قورس بوو.
بە بڵێسەی گڕی لەنین ڕووناکیی تێ کەوت،
ئیتر... ئێمەی خستە سەر تاقە ڕێگای ڕاست.
ڕووبەڕووی مەرگ لەبەر بارانی گوللەی دوژمنا وەستاین،
لەبەر هەر درەختێکا پارچەیەکیان لە لەشمان پچڕی،
دەمی داپچڕاوی برینەکانیان پڕ کردین لە لم.
نیشانەی داخەکانیان هێشتا بە سنگمانەوە دیارە.
نە تفەنگمان هەبوو، نە کەرەمان چنگ ئەکەوت،
«گرانی» بە خوار و ژووری گوێچەمی«ڤۆلگا»دا دزەلۆقەی ئەکرد.
لەکاتێکاکاربەدەستانی «نیپ» فیزیان ئەفرۆشت.
بە بەرگی پۆشتە و دەستی ئەمووستیلەداری ناو دەستکێشەوە.
بەرامبەری تەوس و توانجیان لە ئێمەوە بینینیان بوو بە چاوی سووک.
بە زەبری ڕەنج هەر خۆمان نزیک ئەخستەوە لە ئامانجمان.
بەپێچەوانەی گێرەشێوێنی، پرۆژەکانمان هاتنە بەر:
کەڵەکە بوو گەنمی زۆر، ئاسن و پۆڵای زۆر، خەڵووزی زۆر!
لە پاشترا بێگانە هات بۆ هەڵلووشینی خاکەکەمان،
وە بۆ بینینی هەرەسهێنانی کوتوپڕمان،
لەکاتێکاکە دەرزییە هەر زوو تیژکراوەکەی هیتلەر
بە ناوی «مۆسکۆ»دا ئەچەقی لەسەر خەریتە!
کوڕانە وەستاین لە ڕووی دەستەی تەقەکەرا،

پڕ بە ورگیان پێمان نۆشین ژاراوی «تۆڵە».
ڕاستە پۆستاڵەکانیان بەسەرمانا قونەی کرد،
بەڵام پۆڵای خواستمان هەرگیز نەنوشتایەوە بۆیان.
لە ناوجەرگەی خۆڵەمێش و تەپوتۆزی شەڕا
باوەڕەکەمان بە هێزی پترەوە سەری بەرزکردەوە.
هەموو لایەکی دنیا دەنگی دایەوە،
لە کاتێکا ئێمە هەڵمانکوتا بۆ سەرکەوتنی ئێجگاری
فڕوفێڵە خشکێیی یە پیاوکوژەکانمان دایە بەر نووکە شەق،
نەمانهێشت دەستی چڵکنیان ڕەژیمی سۆڤیەتی گڵاوکات.
ئەم باوەڕەی کە توانیی بەرامبەر بە لافاو و بڵێسە بوەستێ،
کە ڕاستیی خۆی دەرخست هەم لە شەڕا و هەم لە ئاشتیدا،
لە ئێمەوە بە جێ ئەمێنێ بە میرات
کە ڕابەر بێ و ئیلهامدەر بێ
بۆ پشتاوپشتی لاوانی وڵات!

لەگۆڤاری «سۆڤیەت لیتریچەر» وەرگێڕاوە.
بەغدا، تەشرینی یەکەمی ١٩٦٠

مامۆستا گۆران کە لە ژمارە ۱۱۲۲ی ۱۹۵۲/۱۱/۶ وەوە سەرپەرشتیی ڕۆژنامەی «ژین»ی گرتە دەست، وەک ڕۆژنامەنووسێکی لێهاتووی خاوەن بیروباوەڕ کەوتە کار بۆ بووژاندنەوە و گەشەپێدانی. لەگەڵ دەرەتانی تەسکی ڕۆژنامەکەشدا گەلێ گۆڕانی دیاری بەسەردا هێنا. یەکێ لەو کارانەی بەم مەبەستە کردنی، کردنەوەی گۆشەی «بۆ زاخاوی مێشک» بوو کە جۆرە مەتەڵێکی بە شیعر لە هەر ژمارەیەکدا بڵاو ئەکردەوە و لە ژماری پاشەوەشدا هەڵهێنانەکەی ئەخستە ڕوو. زۆربەی ئەو مەتەڵانەی بڵاوی ئەکردنەوە ناوەڕۆکێکی سیاسییان هەبوو، لەگەڵ مەبەستی خستنەکاری بیردا هۆشیارکردنەوەی خوێنەرەوانیشی لە بارەی سیاسییەوە مەبەست بوو. لە سەرەتادا مامۆستا گۆران خۆی ئەم مەتەڵانەی دائەنا، بەڵام پاشان وردە وردە خوێندەوارانیش کەوتنە بەشداریکردن. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا زۆربەی مەتەڵەکان هەر هیی مامۆستا گۆران بوون. هەر مەتەڵێک لە ژینی سەردەمی مامۆستا گۆراندا بڵاو کرابێتەوە و ناوی کەسی لە بنەوە نەبێ، هیی خودی مامۆستا گۆرانە.

ئێمە کە لەم بەرگەی تێکڕای بەرهەمی گۆراندا ئەم مەتەڵە شیعرییانەی بڵاو ئەکەینەوە، بەتەماین لە بەرگی دووەمیشدا کارە هونەری و ئەدەبییە پەخشانەکانی تری بڵاو بکەینەوە کە وەختی خۆی لە ژیندا بڵاوی کردوونەتەوە. م.م.ک.

(۱)

ژوورێکی زل وەک مزگەوت — ئەچنە ناوی شەش و حەوت،
کوڵانی تەنگ ئەبڕن — تا جێی خۆیان ئەگرن
جێی دانیشتنی گیاندار — تاریکە و نەخشی دیوار
ئەژی لەبەر ڕووناکی — ئای خوایە چەن بێباکی![1]

(۲)

ئەوەندەی چنگێ لۆکەی نەرم و شل — بە ناو ئاسمانی شینا ئەدا خول
مووروولەی چاوی پڕ لە نیگای نەرم — ئەگێڕێ بۆ جێی هێلانەیەک گەرم!
بۆ جێیەک ئارام، ئاسایش، شادی، — سێبەر بن تیایا بۆ سەر ئازادی!

لەوێ بە دوو پێی سووری وەک شیلان      سەوزاییی چیمەن بشێلێ جوان جوان
ئاقیقی دەنووک بەرێ بۆ چینە:      بێ ترس، بێ دوشمن، بێ رق و کینە!
ئەم مەلە جوانەی لە شەڕ بێزارە      هەرکەس بیناسێ زیرەکە، دیارە![2]

(٣)

بیستم سنووقی تەختە      ئەیوت: سیحر ئەمەتە!
ڕێم بدە و گوێم بۆ شل کە،      «پەح» لە دەنگی بولبول کە!
بە هەزار دەنگ و زمان      ئەڵێم، ئەخوێنم جوان جوان![3]

(٤)

پیرۆزە، نیازگای وردو درشتە      تیایا بە کام ئەگات پەری و فریشتە
چاوی دایک و باوک و نەنک و باپیران:      لە دەرگای چەقیوە، سەرپاکی ژیران
هیوایان وەهایە کە لەو دەروازە      دەرئەچێ بەیداخی ژیانی تازە
ئەو کۆشکە هەڵبێنن ئەی لاوی وڵات      لە پەنای سێبەریا ئەگەنە ئاوات[4]

(٥)

ماری درێژ و باریک      سەری لە کونی تاریک
دەرئەهێنێ و بە زمان      هێڵ ئەخاتە ڕووی مەیدان
ڕووی مەیدانی بەفرینە      هێڵ یان سوورە، یان شینە!
هەر هێڵێ تەماشا کەی      چیی کێڵابێت تیی ئەگەی!
ئەم ماری سک پڕ ئاوە      ئاخ ئەتزانی چیی ناوە![5]

(٦)

تیغی تیژی بەبڕشتە      حوکمی سەری تۆی بە مشتە
لە بەر چاوت بە هەزاران      زەرد و ڕەش و سپیی ئینسان
ئەداتە بەر داسی درەو      تاوێ بە ڕۆژ، تاوێ بە شەو!
سزای پاکۆی ئەم گشت لەشە:      لە کیسەی خۆت پارەی بەشە[6]

(٧)

دوو مەقتەعە مەتەڵەکەم      دووەم ئەخوا بڕوا یەکەم
ناو و سیفەت لێکیانداوە      وشەی مەتەڵیان لێ زاوە
لامان باو بوو جاری جاران      دوایی باوی کەوتە شاران[7]

(٨)

سێ پیته مەتەڵی ئەم جارەی ژینت          بیزانی ژین ئەکا زۆر ئافەرینت
یەکەمیان وەکوو مێرد لایەکە لە ژن          دووەمیان لە «جێ» دا ئەکشێ بەرەو بن
سێیەمیان بەر و دوای قووتی ئینسانە          بێ هەرسێ ئەم کۆشکەی لەشمان وێرانە[8]

(٩)

مەیکێشە باکەم نەکا          زۆرە لە ناوی یەکا
جووتی پاڵکەوتووی ناو تاق          بیست دانەیە لە عێراق[9]

(١٠)

حەوتە مەتەڵم ژمارەی پیتی،          مژینی مانگای خەڵقە نەریتی،
پیتی سێ و پێنجی لەگەڵ شەشەمی          بۆتە هۆ لیمان داپچڕێ دەمی
حەوت و شەش و دوو لەگەڵ سێ بە ڕیز          شتێک نین چووبی بەلایا هەرگیز!
زیاندارە وەک پێنج و شەش و حەوت          دەریالووشێکە بۆ چاڵاوی نەوت
گوێچکەی تاقکەوتووی وەک هیی کەر درێژ،          کلکی کوتومت مارێکی ژارڕێژ
چییە ئەم دەعبا دڕندە و پیسە؟          پێنج بوایە پیتی ئەتوت ئیبلیسە![10]

(١١)

وەک کەر لەسەر چوار پێ وەستاو،          هەیەتی ڕوو، هەیەتی چاو!
پشتی پانە و باری سووکە،          دەعبایەکی لەش بێتووکە!
چی بێ ناوی ئەم دەعبایە          کە نزیکی کورسیی شایە![11]

(١٢)

وشەی مەتەڵ پێنجە پیتی          هەڵیبێنی زرنگ و زیتی!
لە یەک و دووی لەسەر دوانی          لە سێ تا پێنج تۆ بی، جوانی!
بێ دوو، وشە، شای چێشتانە،          بێ سێ گەورەی ناو خێزانە
باتا واتا مەتەڵزان بە          خاوەندی قۆندەرەی جوان بە[12]

(١٣)

لە «هەمان ژوورەدا بۆ دوا وەرگەڕام          کە گەیشتمە بەر «ژین»یان پێشاندام
سرنجم ورد دا لە پیتی هەشتەم          دیم دەنگی لای کورد دەرناچێ لە دەم
بۆ کردنەوەی تەلیسمی مەتەڵ          حەوت بەسە، هەشتت با نەبێ لەگەڵ[13]

(١٤)

دیم لە گۆیەکی زەردی سووربـاوا     دە پـانزە ژووری هـێلکە لە نـاوا
لە ژووری سێسووچ دەریای شەربەتاو     لە هێلکەی وەک زیخ بوویوو بە گۆماو
دەریالووش بە کێرد ورگی گۆی دڕی     ژوور ژوور شەکراوی لە دەریـا بـڕی
هێلکەی فڕێ دا و گۆی پسان کـردەوە     گۆی هونەری خـۆی ئـاوا بـردەوە[14]

(١٥)

مـەتەڵەکـەمان چـوار پـیتی ساغە:     دروست کـراوە لەسـەر بـناغە،
لە یـەک تـاکوو سـێ ئاوریشمدڕە     یـاخۆ شـوێنێکی لە وڵاغ پـڕە،
یەک و دوان و چـوار زوڵفی نـازدارە     یەک و چوار خـراپ هـەر شـەرمەزارە
هەیەتی گشت شت سیان و دوان و چوار     بـیزانـە و بڵێم بـژیت هـەزار جـارا[15]

(١٦)

شـارێکی گـەورە هـاوناوی گۆمە     سەر سنوور کەوتووی عەجەم و ڕۆمە
سێ پیتەی وشـەی لە پێوە بـۆ سـەر     چـیت بـوێ لە دەم پێی دێنیتەدەر
ناونجیی لا خـەی پیتی یـەک و دوو     لێت نـادیارە وەک نـاوی مـردوو
بـەڵام چـەواشـە بـڕوانـی بۆیان     ژمارەی مانگن بـۆ ژنـی دووگیان[16]

(١٧)

مەتەڵ حەوت پیتە «نووسین بە کوردی»     گـەر هـەڵبێنی ئـەڵێم زۆر وردی
پـیتی یـەکـەم و دووەم لەگـەڵ سـێ     بـەو سـەرەوانـێ ئـەمسەر ئـەبەستێ
پیتی سـێ و شـەشی لەگـەڵ یـەکـەم بێت     لای بـایی لووتکـەی «کـاژاو» ئـەکێڵێت
بەڵام حەوت و دوو شەش و یەک هەر چوار     زڕێـکە لێـمان ئـەدزێ ئـیستیعمار[17]

(١٨)

مەتەڵی ئەمجارە لە نۆ پیت پێکهات:     مـایەی پێشکەوتنە بـۆ گـەل و وڵات،
سێیەم و چوارەمی، یـەکـەمیش لەسـەر     لە هیچ کـوێ نـابینرێ لە خـانوو بـەدەر
یـە کـەم و دووەم و شـەشەم بـە ڕیزە     مـیوەیەک پـێکدێنن مـیوەی پـاییزە
پیتی پێنج و حەوت و هەشت و نۆ ئاسان     ئـەبێ بـە شـارێکی سنووری ئـێران[18]

(١٩)

نـــاپاکـــێکی پـــێنج پـــیتییە،     زیـــانداری نـــەریتییە
سیان و دوو و یـەک وەک ڕووی ڕەشـە     بـــە بـــرژانـــدن ئـێجگار چـەشە

لەگەڵ دەرکەوت «چوار، پێنج» ئەڵێن | بە یەکتر و بەو ئەدەن جوێن
بەو کێردەی خۆی دای سێ و دوو و چوار | ور گی ئەدرن وەک گورگی هار
لە «یەک، دوو، چوار» هەڵێنەدروون | ئەڵێن تۆپی شێری مەلعوون[19]

(۲۰)

مەتەڵ نۆ پیتە و کورتەباڵایە | یەک و سێ و چواری ناپاکیی تیایە
وەک پێنج و شەش و هەشت بە وەزەن بوو | لە پێنج تا حەوتی لەسەر شەڕ بەن بوو
ئێستا کە ماڵی فیتنەی وێرانە | سێ و شەش و حەوتی ڕوو لە برانە[20]

(۲۱)

پێنجە ژمارەی پیتگەلی مەتەڵ | بێ سێ شیرەکەی ئەکەنە مەنجەڵ
یەک و دوو خڕە و یەک و دوان و سێ | بەشیش ئەبرژێ و ئەیخواگشت کەسێ
لە دوو هەتا پێنج پشووی پاش کارە | سێ و چوار لەگەڵ دوو ئەبینێ دیارە!
ئەوەندە سووک و ئاسانە مەتەڵ | یاریی پێنەکا شوانی لای ئاژەڵ[21]

(۲۲)

لە چوار پیت دێتە بەرهەم | ئەی برا ئەم مەتەڵەم:
بە یەکەم و سێ و چواری | دیلکەری زۆر گیانداری
جگە لە یەک، دوو، سێ، چوار | شادیی تۆ و خەمی باڵدار![22]

(۲۳)

مەتەڵەکەم چل پێی هەیە، | هەر پێیەکی یەک ڕێی هەیە،
ڕێگای باریک ئەگرێ و ئەڕوا | هەتا لەوپەڕ سەر هەڵئەدا
ناو ڕێگا هێند بۆنی خۆشە | تیغی سەرتاش بۆی پەرۆشە
زیرەک بەو بزانە چییە | ئەم مەتەڵە چوار پیتییە؟[23]

(۲۴)

مەتەڵەکەم پیتی چوارە | بێقاچە و کلک و پەڕ دارە
ئەڕوا بێ پێ، ئەخوا بێ دان | هەوا بمژێ گورج ئەدا گیان
بۆ هەزاری گوێناو گۆشتە | پارەی باشی پێ ئەدا پۆشتە
گەر بتەوێ مەتەڵ ڕاو کەی | ئەبێ خۆت نوقمی قوڕاو کەی[24]

(٢٥)

مـــەتەڵم پـــێنج پـــیتی ڕێکـــە خــۆشویستراوی گشت کـەسێکە
پـــیتی سیان و چوار و دوانـی وەک ســـەدەف وایـــە ئـێسقانی
بەڵام دوانی و چواری و پێنجەم لە چـــوارپـــەلی ئـەسپم ئـەدەم
یـــەکـــەم پـیت و دووەم پـیتی هـــەر لە بـــوێژە بـــڕیتی[٢٥]

(٢٦)

مـــەتەڵی حـــەوتپیت شـــاعیری مـــەزن بـــولبولی کـورد بـوو بـۆ شـیرین خـوێندن
ئاوازەی چەشنی هیی یەک، دوو، چوار بوو مەعنای ڕەنگینی ورد وەک یـەک و دوو
یەک و دوو و چـوار و پـێنجیشی لەســەر پیشەی بـوو لەســەر ڕووی دەریـای هـونەر
بە شیلەی جووڵەی چوار و حەوت و شـەش بـــە کـــورد زمـــانان شـەکـری ئـەدا بـەش
بـــــدۆزیتەوە کـــــێیە مـــەتەڵم ئـــەڵێی هـــەر بـژی یـاری لەگـەڵم[٢٦]

(٢٧)

مـەتەڵ شـەش پـیتی کـوردی و ئـاسانە حـــەقێکە لەســـــەر خـــــوێندەوارانـــە
سـێ یـەک و دوان و پێنجەم و شـەشەم بـــۆ «ژیـــن» ئـەبێتە نـرخـی هـەفتانە
چنۆک ڕانەکا بۆ سێ، دوو، پێنج، شەش پـــێی بـــڵێم هـــی ســاڵ بکـــە ڕەوانـــە
بڵێم هی‌شەش‌مانگ، ئەڵێ: سێ، پێنج، چوار بـــا بـــێتە خـــەوت نـــیوەی ســاڵانە
ئـەگـەر بـۆ پـارە هـەڵکوتمە سەرت، ئـــەبینی مـــەتەڵ لەســـەر زمـانە![٢٧]

(٢٨)

حـــەوت پـیتە مـەتەڵ شـاخ لێ ڕواوە پـەنجە گـەزیوە و فـرمێسک بـە چاوە
لە یەک تاکوو پێنج بێ چوار ئەیرێسن ئـــەیکەن بـــە بـــەڕە و بـەرماڵ پـیرێژن
پـێنج و شـەش و سێ بۆ چێشتی هەژار لە ڕەش، لە ســـپی دێـــتە نـــاو بـازار
ئەگەر حەوت و شەش لەگەڵ سێ و چوار بێ ڕەنگـــە بـۆ نـاوی مـەتەڵ لەبـار بێ![٢٨]

(٢٩)

کـفرە مـەتەڵ، لام‌وایـە، لای هەندێک ناوی خـوایە
خوایەک کە لە ڕووی ئەرزا وەکـــــیلیەتی ســــەرمایە
خـــاوەنسەرمایەی نـاپاک ئـــاشووب ئـەخاتە کـایە،
بۆ سوودی خۆی، بۆ شادیی دڵی ئەو خـوای بـەدخوایە!
بە ئیملای کـوردی مەتەڵ تـەنیا لە چـوار پـیتایە![٢٩]

(٣٠)

یەکەم شاعیرمان هەر بە ناو بیستراو     حەوت پیتی کوردی بۆی ئەبێ بە ناو
یەک و پێنج داری گەورەی شیرین بەر     لە یەک هەتا چوار تابووت دێتەدەر
یەکەم و حەوتەم لەگەڵ شەش و دوو     گشت کەس هی چەوری ئەکا ئارەزوو
زۆردار خستووینیە گێرەو کەشمەکەش     لەشی ڕووت کردووین لە یەک پێنج و شەش
ئەگەر شاعیری دێرینی گەلت     ناسی، هەر بژی قەڵەم و پەلت[٣٠]

(٣١)

هۆی حەسانەوەی سەرە     لەگەڵ سەر سوار و کەرە
بەڵام کەر هەر لە ژێرە     هێندە بێخێر و بێرە
ئەو نەبێ کورد بییەوێ     هەم ژێر، هەم سەر ئەکەوێ
زیرەکیی خۆت بنوێنە     ئەم مەتەڵە هەڵبێنە[٣١]

(٣٢)

•

وێنەی مەتەڵم لە نۆ پیت پێکهات     شیعری چۆتە ناو گۆرانیی وڵات
نەخوێندەوار بوو، بەڵام داستانی     خوێندەوارانیش نرخیان ئەزانی
لە یەک تاکوو سێ لە ڕواو دەردێ     لە یەک هەتا چوار سەری پێ ئەشکێ
لە شەش تاکوو هەشت پێنجیشی لەسەر     چڵ زمان ئەدا لە زوڵفی دولبەر
سیان و دوو لەگەڵ شەش و پێنج، یەک، حەوت     لەم شارەی ئێمەی بڕیوە سەرەوت
مەتەڵ هەڵبێنی و بزانی کێیە     ناوت بە زیرەک دانێن بەجێیە[٣٢]

(٣٣)

مەتەڵی بەدکار لە حەوت پیت پێکدێ     نازی وەک ئەسپێ خوێنی خەڵک ئەمژێ
یەک و دوو دەستە، پێنج و شەش و حەوت     باوەشێن ئەکرێ هاوینان کە خەوت
پێنج و شەش، سێ و حەوت لە ئاوریشم ئەدرێ     لە خەرمان حەوت، سێ، یەکی پێ ئەبرێ
پێنج و چوار و سێی ڕەنج ئەبا وەک با     وەک پێنج و دوو سێ و یەک لە سەر ئەدا
ئەگەر هەڵبێنی مەتەڵی ناساز     نزات بۆ ئەکەم ببی سەرفەراز[٣٣]

(٣٤)

مەتەڵ بڕبڕەی پشتی وڵاتە     سەربەرزە گەرچی پەڕپووت و لاتە
لە شەش پیت پێکدێ و شەش هەتا چواری     لەناو ڕەنگانا ڕەنگێکە دیاری
شەش و دوان و یەک دەنگی لێوە دێ     سیان و دوان و چوار دەعبای تیا ئەنوێ

یەک و چوار لەگەڵ دووەم و پێنجەم — ئاوێکە لە ژار تاڵترە بە دەم
یەک تا چوار بێ سێ دەمە و هەنگوینی — هەنگوینێک بە گوێ ئەدا شیرینی
بزانی مەتەڵ کام چیای بەرزە — هەزار «نامەخوا»ت لەسەر ژین فەرزە[۳۴]

(۳۵)

مەتەڵ شوێنەزای شاعیرێکە زل — شاعیر خۆی گڵی ناو ئەبا بە کل
لە حەوت پیت پێکدێ و دووی دووبارەیە — هەموو قۆناغێک دوور لەم شارەیە
لە یەک تا سیانی وەک پێنجە تا حەوت — چوارەم سەر زلی خاوەنکلکی چەوت
پیتی یەکەم و دووهەم و حەوتەم — کوتانی باو بوو بەڵام ئێستا کەم
پێنج و دوان و چوار زوڵفی نازدارە — سیان و دوان و شەش لە دوور دیارە
وەڵام هەڵبێنی دەرئەخەی ژیری — مەتەڵزانێکی بەهۆش و بیری[۳۵]

(۳۶)

چوار پیت وەک یەک تاق و جووت — قەڵای باو باپیری زووت
دەورەیان دا کڵاوسوور — قەڵایان کردیت خاپوور
ئەم مەتەڵە بزانی — وەستای بەیت و داستانی[۳۶]

(۳۷)

پەنجە بەرە بەی هەڵگرە — لە خانوودا ڕوو لە دەرە
ئەوەی ئەیکا بە ڕەنجی شان — هاودووکانی ئاسنگەرە
ئەگەر زانیت مەتەڵ چییە — «نامەخوا»کەت لەسەر سەرە[۳۷]

(۳۸)

لە نۆ پیت پێکهات مەتەڵی ئەشکەوت — کانی زوو ئینسان لەناویا ئەخەوت
ئێستاش ئێسقانی کەللە سەری کۆن — تیا پێشان ئەدا ئینسان ئەژیا چۆن!
بە بێ ناونیشان هەڵیدێنێ کورد — سرنج لە مەعنای ئەم شیعرە با ورد:
سەد دەستە پیاوی ئازا و خێزاندار — بۆ یادیان کردیان تا سەر بە هەوار[۳۸]

(۳۹)

مەتەڵێکە سەر لێ تێکدەر — کێواوکێو دەشت ئەداتە بەر
دوو جار بێت و ناوی بەری — باوکی منداڵ هەڵئەدا سەر[۳۹]

(٤٠)

به هێڵەک ئارد ئەبێژن        شتێکی لێ ئەڕێژن
سەری پێیە و پێی سەرە        بە پێنج پیت ناوی بەرە
پێنج پیتی ئیملای کوردی        ئەگەر زوو زانیت وردی[40]

(٤١)

شوڵنەزای پیری شیعری گۆرانی        لە حەوت پیت پێکدێ وشەی دوولانی
لە یەک تا کوو سێ بارانی شەستە        یەک و پێنج و شەش ڕێی ڕوانین بەستە
منالّ حەزئەکا لە سێ، دوو، شەش، حەوت        کێ کردی شەش، دوولەگەڵ یەک هەڵکەوت
بە بێ چوار، شەش، حەوت مەتەڵ هەڵبێنی        «ژین» پێی لێ ئەنێ هونەر ئەنوێنی[41]

(٤٢)

مەتەڵی شەش پیت لە دەشتی بەپیت        گردە و منارەی راوەستاوی قیت
پیتی یەکێ و دوو و سێیەم و شەشەم        ڕووی کردە نزمی ناوئەبرێ بە تەم
چوارەم و پێنجەم سێی بچێتە سەر        تا نەکرێتەوە دەنگ نایەتەدەر
یەکەم و پێنجەم لەگەڵ شەش و سێ        گوڵە و لە دێم و لە بەراو ئەڕوێ
کە چوویتە شاری دێرینی مەتەڵ        لەگەنم پڕ کە گیرفانو باخەڵ[42]

(٤٣)

مەتەڵ بۆ کوردێک بە شەش پیت پێکدێ        چوار و پێنج و یەک بەهار زۆر ئەبێ
چوار و دوان و شەش بکێڵە بەهار        پاییز مێوژت ئەبێ شەش، پێنج، چوار
لەسەرتە یەک و دوان و شەش و چوار        گشت سێ و دوو و چوار و شەشێکی بەهار[43]

(٤٤)

وەرە دروستکەین لە نۆ پیت مەتەڵ        داخ بەرینە سک خوای شەڕی چەپەڵ
ئەگەر لەباتیی پیتی پێنج و چوار        واوێک وەربگری لە کۆتری نازدار
ئەمجا پیتەکان پاش و پێشتر خەی        دوایی بە وردی لەگشت سرنج دەی
ئەبێتە بەهەشت، بەهەشتی نیاز        چۆلەکەی بۆتە مەلی «خۆش ئاواز»[44]

(٤٥)

حەوت پیتە ئەمجارە، نەگریسە مەتەڵم        لە دەستی زۆری چەشت ڕۆژی خۆی کۆمەڵم
لە یەکەم تا شەشەم خشۆکی ژاردارە        حەوت و شەش لەگەڵ دوو کراسی ڕەشمارە

حەوت و چوار لە گەڵ دوو بڵندە و سیان و چوار
دەستەیە و یەک، شەش، پێنج هاوارە لە ئازار
هەرکەسێ تێنوێتی بۆ نەورۆز بنوێنێ
بێگومان هەوڵێدا مەتەڵم هەڵبێنێ[٤٥]

(٤٦)

مەتەڵم پێتی حەوتەو ئاسانە
گەشە و بۆنخۆشە و بە ڕەنگ زۆر جوانە
یەک و دوان و سێ سەرجەمی زۆری
پێنج و شەش و حەوت مەڵبەندی زۆری
یەک و چوار و دوو لە گەڵ سێیەمین
ئەدرێ، بە شانا چەرمێکە پەشمین
حەوت و شەش و سێ لەسەر کوڵمی ئاڵ
وەک داخی پەرەی گوڵ دێتە خەیاڵ
بزانە چییە مەتەڵی بەهار
با ئافەرینت بکەن هەزار جار[٤٦]

(٤٧)

مەتەڵەکەم شەش‌پیتییە
ئاواتەخوازی برسییە
بەڵام زیخی وەک یەک و سێ
یەک، دوو، چوار، پێنجیش ئەیناسێ
وەک‌بەردی یەک، شەش، سێ ڕەقە
دان لە ترسی گازی لەقە
بەڵام ڕەق بێ یان ئاسان بێ
زوو بۆت هەڵدێ مەبەست نان بێ[٤٧]

(٤٨)

لە یەک تا سێساڵی پێشوو
لە حەوت تا نۆ حاڵی پێشوو
یەک، دوو، سێ، پێنجی لەسەر بێ
ور گی خاوەن‌تەماع ئەدرێ
لە شەش بۆ چوارەم باڵدارە
بێ هەشتەم پیت پەلامارە
جێگایەکە ئەم مەتەڵە
لای ئێمە پڕلە تەمەڵە
لە زۆر جێگای ئەم دنیایە
دڵسۆزانی گەلی تیایە
بە ژمارە هەشتە پیتی
هەڵبێنی زرنگ و زیتی[٤٨]

(٤٩)

لە شەش پیتەکەی جووتی پێش و پاش
قسەی مناڵن بۆ شت جوان بێ و باش
لە سێوە بۆ پێنج کزی و بێدەنگی
یەک تا سێ زستان مایەی دڵتەنگی
هەرکەس لە یەکەم تا چواری زۆر بێ
دەزگا و دووکانی یاخوا هەر مۆر بێ
تا ئێستا نرخی ئێجگار گرانە
تاوانیش دیارە هیی شارەوانە
بزانی مەتەڵ سەوزەی ڕووسوورە
ئەڵێی لە وزەی کڕین ئای دوورە![٤٩]

**(٥٠)**

مەتەڵ لە چوار پیت پێکدێ      دووکەڵ ئەکا و ئەسووتێ
یەک، دووی شیرین وەک هەنگوین      یەک، دوو چوار مایەی پژمین
بۆمان ئەبووە هۆی سامان      سەریەست بوایە بازارمان
هونەری خۆت بنوێنە      ئەم مەتەڵەش هەڵبێنە[٥٠]

**(٥١)**

مەتەڵی حەوت پیت زەنگیی کڵاوسەوز      ئاو ناخوا بەرێی تا نەکەن بە حەوز
مل هەڵواسراوی بن لقی بەرزە      پاش ئیعدام پێنج، چوار، سێ و حەوتی فەرزە
یەک، دووی تۆز ئەکا، یەک، دوو، چوار لای ژوور      چوار و پێنج، سێ و یەک سەرۆکێکی دوور
ئەمیش هەر بەری ڕەنجی جووتیارە      کێ ئەیکا و کێیتر بۆی ئەخوا؟ دیارە![٥١]

**(٥٢)**

حەوت پیتییە مەتەڵی خۆش      چەرخ و فەلەک دێنێتە جۆش
لە یەک تا چوار ڕۆژی شادی      سکێتیری و گەردنئازادی
لە سێ تا حەوت بابەتی ژن      سێ و چوار نیوەی کۆمەڵی من
لە چوار تا شەش زادی خوایە      چوار، پێنج هەروەک شەش، حەوت وایە
سێ و پێنج و شەش هۆی هاوارە      سرنج بدەی مەتەڵ دیارە[٥٢]

**(٥٣)**

مەتەڵە کەم پێنج پیتە      لە ئاردایە و بێپیتە
پاش و پێشی وەک یەکە      سێ پیتی دوایی یەکە
ئەم مەتەڵە هەڵبێنی      دیارە هونەر ئەنوێنی[٥٣]

---

١) سینەما. ٢) کۆتری ئاشتی. ٣) رادیۆ. مامۆستا گۆران پاشان جارێکی کەش ئەم مەتەڵەی بڵاو کردووەتەوە و لەم جاری دووهەمەدا دوا نیوە بەیتی بەم جۆرە گۆڕیوە:

ئەخوێنم بەستەی جوان جوان

٤) قوتابخانە. ٥) پاندان. ٦) سەرتاش.

٧) مارپێچ. ٨) ژین. ٩) جگەرەی پاکەتی عیراق.

١٠) استعمار (بە ئیملای عەرەبی). ١١) مێز. ١٢) پێڵاو.

١٣) ڕۆژنامە. [بۆ دەرهێنانی وشەی «ڕۆژنامە» لە «همان زوور» ئەبێ ڕێنووسی کۆن بگرینەبەر. م.م.ک.]

١٤) پرتەقاڵ. ١٥) خانو (خانوو). ١٦) وان.

١٧) تەلەفۆن ١٨) قوتابخانە. ١٩) جاسوس (جاسووس).

٢٠) سینگمان ری.    ٢١) گوچان.    ٢٢) دراو.
٢٣) شانه.    ٢٤) ماسی.    ٢٥) منداڵ.    ٢٦) مەولەوی.
٢٧) ئابونه (ئابوونه).    ٢٨) پەشیمان.    ٢٩) مارس.
٣٠) تەرمۆکی (عەلی تەرمۆکی.)    ٣١) سەرین.    ٣٢) بەردەشانی.
٣٣) دەرمبەگ.
٣٤) زاغرۆس.

که مامۆستا گۆران یا هەر مەتەڵدانەرێکی‌تر مەتەڵێکی دائەناو لە ژینا بڵاو ئەکرایەوە، خوێندەواران وەڵامیان ئەدایەوە و مەتەڵەکەیان هەڵئەهێنا و وەڵامەکانی ئەوانیش لە ژمارە داهاتووەکاندا بڵاو ئەکرانەوە. ئەمانە زۆریشیان بە شیعر وەڵامیان ئەدایەوە. لە وەڵامی ئەم مەتەڵەدا سەلاحی برام چەند بەیتێکی نووسیوو مامۆستا گۆران لە ژمارە ١١٨٣ی ژیندا بڵاوی کردنەوە. سەلاح نەیزانیبوو مەتەڵەکە مامۆستا گۆران خۆی دایناوە، لەو بەیتانەیدا رەخنەی لەوە گرتبوو کە بۆچی خاوەنمەتەڵ لەجیاتی «زاگرۆس» نووسیویە «زاغرۆس» و نووسیبووی:

**بەڵام مەتەڵنووس فەرز بوو لەسەری**
**«گاف» دانێ لە جێی «غەین»ی جێگری**
**وا دیارە کوردیی لا نادیارییە**
**کوردی نووسینی بە بێگارییە**

مامۆستا گۆرانیش ئەم بەیتەی بۆ وەڵام خستبوە سەر وەڵامەکەی:

**مەلا بچکۆلەی پێ لە «گاف» نەنەرا**
**لەبەر تۆ «غەین»ی نووسیوە نووسەر**

م.م.ک.
٣٥) خاک و خۆڵ.    ٣٦) دمدم، قەڵای دمدم کە خانی لەپزێرینی تیا کوژرا.
٣٧) پەنجەرە.    ٣٨) هەزار مێرد، ئەشکەوتە تەئریخییەکەی پشتی جێشانە لە رۆژئاوای سلێمانی.
٣٩) با.    ٤٠) کەپەک.    ٤١) تاوگوزی، شوێنەزای مەولەوی و عەشیرەتەکەی.
٤٢) هەولێر.    ٤٣) نەورۆز.    ٤٤) ئاشتیخواز.
٤٥) ئاژدەهاک [ئەژدەهاک].    ٤٦) [گـولەباخ. بـەڵام لەجـیاتی (گـولەباخ)، (کـولەباخ)ی لێ دەرئـەچێ. م.م.ک.]    ٤٧) کولێرە.
٤٨) پارلەمان. مەتەڵەکە لە «ژین»دا بەم جۆرە نووسراوەتەوە، بەڵام نیوە بەیتی دووهەمی هەڵەیەکی تیایە چونکە ئەڵێ: «لە حەوت تا نۆ حاڵی پێشوو». هەڵەکە لەوەوەیە کە مەتەڵەکە هەشت پیتە و نۆ پیت نیـە و مەبەست لە نیوە بەیتەکە دەرناکەوێ تەنانەت ئەگەر «حاڵی»یش بە «ماڵی» بخوێنینەوە. م.م.ک.
٤٩) تەماتە.    ٥٠) توتن (تووتن).    ٥١) باینجان.
٥٢) جەژنانە.    ٥٣) کەپەک.

(١)

له تـــاوی فـــیرقه‌تی یـــارم دڵـم‌داغـم‌په‌رێشانه     وه‌کوومه‌جنوونی حه‌ی، وێڵی که‌ژ و ده‌شت و بیابانم[١]

(٢)

زارۆڵه و مه‌عسووم بێ گوناهێنمێ     ئیسلام‌زادێنمێ، ئیسلام‌خواهێنمێ
عه‌زمما جه‌زما، په‌ی وه‌نه و عیرفان     عیرفانا وه‌حشی که‌رۆ به ئینسان[٢]

(٣)

ئه‌ی کاکه کەمال! شاعیری خۆشخوانی هونه‌رمه‌ند     بولبول نییه، تۆی ته‌یری ته‌رەنوم له سه‌حه‌ردا
ده‌ک خۆش بێ ده‌م و په‌نجه و نووکی قه‌ڵه‌می تۆ     بۆ دادێ که دات کاکه له مه‌یدانی هونه‌ردا[٣]

(٤)

بـه دڵـخۆشی و بـه تـاره‌ک     حـاجی حـه‌جتان مـوباره‌ک!
چـوونه سـه‌ر بیری زه‌مـزه‌م،     جوان جوان شتتان ده‌ست و ده‌م!
چـــوونه کـێوی عـه‌ره‌فات،     تـێر تێر کـردتان مـوناجات...
بـه دڵـخوشی و بـه تـاره‌ک،     حـاجی حـه‌جتان مـوباره‌ک!
له ســـه‌فاوه بـــۆ مـــه‌روه،     یه‌ک یـه‌ک گـوڕتان بـه‌سته‌وه!
حـــاجی حـه‌جتان کـرده‌وه،     گـــۆی هـونه‌رتان بـرده‌وه![٤]

(٥)

گـه‌نم گـه‌نم له پێنجه‌ی بێ     ده‌ستی دز له خۆی په‌نجه‌ی بێ
گـه‌نم نـابێ له پێنجه‌ی بێ     گه‌ل بێ‌هیوا له‌م ڕه‌نجه‌ی بێ[٥]

(٦)

له به‌غدای ته‌مووز، له مووسڵی ئازار     خوێنمان کرد به ڕه‌نگ، بۆ گوڵی به‌هار
تـا جـه‌ژنی گـه‌لمان گوڵی ئـازادی     بـۆن بکـا و دڵـی پـڕ بێ له شـادی[٦]

(٧)

شۆڕشی ته‌مووز نه‌ورۆز بـاس ئه‌کـا     دیجله‌مان ڕووی ده‌م له ئاراس ئه‌کا
بۆیه هـه‌لهه‌له‌ی جـه‌ژنی ئـه‌مساڵمان     گوێی دوژمنانی گه‌لمان کاس ئه‌کـا

(٨)

ڕووی دنــیا سـەوزە و نـاوبەناو ڕەنگـین  لووتکەی شاخ سپی و ڕەنگی ئاسمان شین
لە دنــیای جــوانــی جــەژنی نــەورۆزا  بـە خـۆشی و شـادی و سـەربەستی بـژین

(٩)

جــــەژنی گـــەلە و جـــەژنەپیرۆزەی لاوان  شـــادی و هـــیوای لەگشت دڵـیکا بــزوان!
ئەی جەژنی گەل وەک دواڕۆژی گەل خۆش بی!  سەراسەر هەر ئـاشتی و ئـازادی و نـۆش بـی!
لە ئــــاهەنگی بــــر ایـــەتیی گــــەلانا،  مـــەشخەڵێک بـــی تـــۆش لەنـاو مـەشخەڵانا![٧]

---

١) ئەم بەیتە بەیتی یەکەمی یەکەمین غەزەلی مامۆستا گۆرانە کە لە سەردەمی منالیدا وتوویەتی. بڕوانە: ڕەفیق حیلمی، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووهەم، ل ١٥١، بەغدا، ١٩٥٦ م.م.ک.

٢) مامۆستا گۆران ئەم چوارینە هەورامیانەی لە سەرەتای سالی خوێندنی ١٩٢٧-١٩٢٨ دا کە قوتابخانەی سەرەتایی لە تەوێڵە کراوەتەوە، بۆ منالە قوتابییەکان داناوە و پێی لە بەرکردوون. لەم چوارینەوە بەئاشکرا دیارە کە گۆرانی مامۆستا بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی ئەو کۆنەپەرستانەی داناوە کە خوێندنی نوێی قوتابخانەیان بە کافری و بێدینی ئەدایە قەڵەم. ئەم چوارینەمان لە ڕێگای مامۆستا رەشید هەورامییەوە دەسگیر بووە. م.م.ک.

٣) کە ئەحمەد موختار جاف لە سالی ١٩٣٤ دا لە گوێ ئاوی سیروان ئەکوژرێ، عەلی کەمال باپیر ئاغا بە پارچە شیعرێکی پڕسۆز ئەیلاوێنێتەوە. کە مامۆستا گۆرانیش ئەو پارچە شیعرە ئەبینێ، بەم چوارینەیە سوپاسی عەلی باپیر ئاغای لەسەر ئەکا.

شایانی وتنە ئێمە بەر لە وەی ئەم چوارینەیە لەگەڵ پارچە شیعرەکەی عەلی کەمال خۆیدا لە دیوانی «دیاریی شارەزوور»دا ببینین، بە دەسنووس دەستمان کەوتبوو، دوو وشەی «خۆشخوانی هونەرمەند»ی تیا نەبوو لەجیاتی ئەوانە وشەیەکی «شیرین»و بۆشاییەک هەبوو، بۆیە بە بۆچوونی خۆمان وامان بڕیاردا کە ئەبێ «شیرین نەغمەی تۆ» بێ. ئێستاش کە بەپێی ئەوەی لە «دیاریی شارەزوور» نووسراوە، ئەینووسینەوە، هەر لەسەر ڕاکەی خۆمانین و لامان وایە ئەو وشەی «شیرین»ە لەخۆڕایی نەهاتووە و ئەسڵەکەی «شیرین نەغمەی تۆ»یە و مامۆستا عەلی کەمال کە شیعرەکانی خۆی چاپ کردووە، چوارینەکەی مامۆستا گۆرانی بە باشی لەبەرنەبووە و خۆی بە نیمچە ڕستەی «خۆشخوانی هونەرمەند» پڕی کردۆتەوە. بەڵگەشمان: یەکەم بوونی وشەی «شیرین» و دووهەم هاوسەنگیی «شیرین نەغمەی تۆ» و «نووکی قەڵەمی تۆ»ی نیوە بەیتی سێهەم و سێهەمیش گونجانی «نەغمە»ی لەگەڵ «بولبول» و «تەرەنووم»و «سەحەر»ی نیوە بەیتی دووهەمدا. م.م.ک.

٤) مامۆستا گۆران ئەم پارچە شیعرەی کاتێ داناوە کە لە عەبابەیلێ مامۆستا بووە. دیارە بە مەبەستی وتنەوەی لە پێشوازی لێ کردنی حاجییاندا دایناوە. م.م.ک.

٥) لە سەرەتای سالی ١٩٥٤ دا هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی بە دەستەوە بوو. میری پێنج کەسی بۆ خۆی دەستنیشان کردبوو. میللەتیش پێنج کاندیدای هەبوو، دیارە ئەبوو لەو «هەڵبژاردن»ەدا نوێنەرەکانی میری بیبەنەوە. گۆران ئەم چوارینەی لە بەشی «بۆ پێکەنین»ی ژینی ڕۆژی ١٨ / ٢ / ١٩٥٤ دا بەو بۆنەیەوە بڵاوکردەوە. م.م.ک.

٦) مامۆستا گۆران ئەم چوارینە و دوو چوارینی پاشەوەی بۆ چاپکردنیان لەسەر کارتی جەژنە پیرۆزەی نەورۆزی سالی ١٩٥٩ داناوە. م.م.ک.

٧) مامۆستا گۆران ئەم سێ بەیتەی لە ١٩٦٠ دا بە داوای لاوانی دێموکراتی سلێمانی داناوە و ئەوانیش لەسەر کارتی جەژنەپیرۆزە لە چاپیانداوە. م.م.ک.